


د. عەلی شەریعەتی



# دیمەنێک نیشتنەوە لە بیابان

وەرگێڕانی: توانا حەمەد ڕەسول





**بڵاوکار ناوەندی سایە**


**ناوی کتێب**

دیمەنێک نیشتنەوە لە بیابان

**نوسینی**

د. عەلی شەریعەتی

**وەرگێڕانی**

**توانا حەمەد رەسول**

---

# دیمەنێك

# نیشتنەوە لە بیابان

د. علی شەریعەتی

وەرگێڕانی: توانا حەمەد رەسول

چاپی یەکەم..................................٢٠١٤

لە زنجیرەی بڵاوکراوەکانی
سایە- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرەی کتێب- ٦٩

# دیمەنێک نیشتنەوە لە بیابان

ناوی کتێب: دیمەنێك نیشتنەوە لە بیابان
کۆمەڵێك نوسینی: د. علی شەریعەتی
وەرگێڕانی: توانا حەمەد رەسول
دیزاین: فازیل کەولۆسی
چاپخانەی:سایە
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم، ٢٠١٤
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی( ١٤١٩) ساڵی ٢٠١٤ پێدراوە.

بۆ دەسکەوتنی بڵاوکراوەکانی ناوەندی سایە بەتاکو کۆ..
ناونیشان: سلێمانی – شەقامی پیرەمێرد – بەرامبەر اعلاناتی شێرکۆ

Emil: nawandy.saya@yahoo.com

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

ئەو کتێبەی لە بەر دەستت دایە کۆمەڵێك بابەتی وەرگیراون لە کتێبەکانی د. عەلی شەریعەتی کە بە دیدگایەکی فراوان و شێوە بیرکردنەوەیەکی تەواو نوێ وە باسی کۆمەڵێك بابەت و پرسی وەك مرۆڤ، مێژوو، چەوسانەوە، ئازادی، بڕوا، تاقیکردنەوە، نزا، ئاین، ژیان، برادەری و خۆشەویستی... دەکەن.

شەریعەتی بیرمەندێکە کە هەموو دیاردەو دۆخێك بە چاوی کراوەو بیری جیهان-ئاسای تیژی خۆی دەبینێت و شیدەکاتەوە بەبێ ئەوەی بکەوێتە بەر کاریگەری هیچ پێش داوەرییەك، ئەوەش بنەڕەتبوون و ڕەسەنی بیری ئەو دەچەسپێنێت. لەکاتێکدا نوسینەکانی مرۆڤ تا ئاسمانەکان بەرزدەکەنەوە لە هەمان کاتدا بێهۆشی ناکەن لە دۆخی کۆمەڵایەتی و بێ خەمی ناکەن لە بەرپرسیاریەتی بەجۆرێك لای شەریعەتی ژیان بەسەربردن بۆ خود، ژیان بەسەربردنی ئاژەڵانەیە، ژیان بەسەربردن بۆ ئێمە، ژیان بەسەربردنی مرۆڤانەیە، وە ژیان بەسەربردن بۆ ئەوانی تر، ژیان بەسەربردنی مرۆڤی تەواو و پرهێزکارە.

شەریعەتی خوێنەر هاوبەشی پێدەکات لە تاڵی و شیرنی ئەزمونەکانی، چونکە زۆربەی بیرەکان و تێگەیشتنەکانی شەریعەتی جۆرێکن کە زۆر بەدەگمەن لە نوسینی بیرمەندانی تردا دەدۆزرێنەوە.

سێ دوژمنە سەرەکی یەکانی کۆمەڵانی خەڵك لای شەریعەتی زێڕ و زۆر و تەزویرن، کە زێڕ سیستەمی سەرمایەداری دەگرێتەوە، زۆر دەسەڵاتی سیاسی،

وە تەزویر بریتی یە لە پیاوی ئاینی رەسمی لە هەموو ئاینەکاندا. ئەو پێی وایە کە مێژوو بریتی یە لە یەکگرتنی هەرسێك یان بەلایەنی کەمەوە دوو لەوانە بۆئەوەی بۆخۆیان بمێننەوەو کۆمەڵانی خەڵك بێهوش بکەن و بەرهەم و ئازادی یەکانیان لیٚ زەوت بکەن و بچەوسێننەوە.

شەریعەتی بڕوای بە سنوری نێوان دەوڵەتان و سنوری نێوان مرۆڤەکان نی یەو پیٚ ی وایە نەتەوە کۆمەڵە مرۆڤێکن کە یەك دەردی هاوبەشیان هەیە.

"وەرگێڕ"

## ♣ بەڵێ

## ئــاوا بــوو

### بــرام

ئەگەر باسی 'خۆم' دەكەم، هۆكارەكەی ئەوەیە كە دەمهەوێت بیرەوەری یەك بگێڕمەوە، بیرەوەری یەك كە پەیوەندی بە خودی تایبەتی منەوە هەیە- وەكو چینێك لە جیهان، لەم كۆمەڵگایە دا، لە شارەكەم و لە مێژوومدا: ئەمن لەلایەكەوە وابەستەم بە چینی خوێندەواری ئەورو، كە دەزانن لە چ كەش و هەوایەكدا بیردەكاتەوە، وە چ پەیوەندی یەكی بە ئاینەوە هەیە، بەدوای چ ئامانجێكەوەیە وە خاوەنی چ زمان و فەرهەنگێكە، وە لەلایەكی ترەوە، لە خاڵێكی خاكەوە هاتووم: بیابان، شوێنێك كە ئاوەدانی نییە، شوێنێك كە خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی و هەبوونی لێ نییە، بەڵكو وشكی و هەژاری و گرانی ژیانی لێ یە.

وە لەلایەكەوە، وابەستەم بە چین و رەچەڵەكێك كە خوێنی هیچ بەرێزێك، لەوانەی كە رێزەكەیان وابەستەیە بە زێرو زۆرەوە (سەرمایەدار و دەسەڵاتدار)، لە دەمارەكانمدا نییە.

وە لە سروشتمدا هەست دەكەم كە پێشینانی من، دایك و باوكانی من، بەدرێژایی نەوەكان، تا ئەو شوێنەی كە لە مێژوودا بزر دەبن، هەمیشە رۆڵەی هەژاری و گرانی ژیان و بەشخوراوین، بەو تایبەتمەندی یانەوە، بواری تایبەتی كارەكەشم شارستانیەتە، وە هەمیشە شارستانیەتەكان و شوێنەوارە مەزنەكانی شارستانیەتی مرۆڤایەتیم بە مەزنترین شانازی مرۆڤ دەزانی: وە كە دەچوومە

هەر شارو وڵاتێك دەستبەجێ دەڕۆیشتم بۆلای یەكێك لە شوێنەوارە مەزنەكانی شارستانیەتی ڕابردوو. تاوەكو بزانم و ببینم و بناسم كە ئەو گەلە چ بەرهەمێكیان دروست كردووە و چ شاكارێكیان هێناوەتە بوون.

كاتێك، لە یۆنان چوومە پەرستگای دلفی، و بینا گەورەكان، بەهۆی ئەو هەموو جوانی و سەرسامی كارەوە لێواولێو بووم لە خۆشی و هەڵچوون.

لە ڕۆم، مۆزەخانەی هونەری ئەندازیاری جیهان، پەرستگا مەزن و شكۆدارو كۆشكە گەورەكان، لە ڕۆژهەڵاتی دوور، لە چین، كامبوج، ڤێتنام چەند كێوێكی گەورەی لێ یە كە مرۆڤ بەدەست و پەنجەو چاوو دەمارەكانی ئەو كێوانەی داتراشیوە تاوەكو بیانكاتە پەرستگا. بۆ خوایەكان و بۆ نوێنەرانی خوا لەسەر زەوی، واتا پیاوە ئاینی یە ڕەسمی یەكانی ئاینەكەیان.

ئەوانە لە دیدگای مندا مەزنترین میراتی خۆشەویستی مرۆڤایەتی بوون تاوەكو لە هاوینی ئەمساڵدا، لە گەشتەكەم دا بۆ ئەفریقا كە زۆرترین خۆشیم بینینی سێ هەرەمەكەی میسر بوو، كە هەموو ئەو وازانراوانەی خستە ناو دەرونم و تێگەیشتم.

لە ڕێگادا، بۆ سەردانكردنی شوێنەوارە سەرسامكەرەكانی هەرەمەكان، كە یەكێكن لە حەوت سەیرو سەمەرەكانی جیهان پەلەم دەكرد. وە خۆشحاڵ بووم كە ئەو دەرفەتەم بۆ ڕەخساوە. لەگەڵ ڕێبەری گەشتیاری یەكەم بووم وە گوێم لە ڕوونكردنەوەكانی دەگرت، كە باسی شێوەی پێكهاتەی هەرەمەكان و مێژوو و سەرسامی و جوانی و نهێنی یەكانی دەكرد.

كۆیلەكان هەشت سەد ملیۆن پارچە بەردی گەورەیان لە "سوان"ـەوە، ئەو شوێنەی كە بەنداوی گەورەی 'ئەسوان'یان لێ دروستكردووە، هێناوەتە قاهیرە. وە نۆ هەرەمیان دروست كردوون، كە شەشیان بچوكن و سێ یەكەی تریان گەورەن و لە جیهاندا بەناوبانگن.

هەشت سەد ملیۆن بەردیان لە دووری ٩٨٠ کیلۆمەترەوە بۆ قاهیرە هێناوە و لەسەر یەکتریان داناون و بینایەکیان دروست کردووە تاوەکو لاشەی مۆمیاکراوی فیرعەون و شاژنەکەی لەژێر بنێژن.

وە خودی گۆڕەکە، کە شوێنی ناشتنی بنەڕەتی یە تەنها لە پێنج پارچە بەردی یەك پارچەیی و خاو (سروشتی) دروستکراوە، کە چوار پارچەی گەورە وەکو چوار دیوارەکە بەکارهاتوون، وە پارچەیەکی گەورەش وەکو بنمیچی ژوورەکە.

بۆ بەخەیاڵداهێنانی تیرەو کێشی ئەو بەردەی کە وەکو بنمیچ بەکارهاتووە، ئەوەندە بەسە کە بزانین لە جۆری مەرمەڕ دروستکراوە، وە چەند ملیۆن پارچە بەردی گەورەیان تاوەکو لوتکەی هەرەمەکە لەسەر ئەو بنمیچە داناوە، وە ئەو بنمیچە پێنج هەزار ساڵە بەرگەی ئەو هەموو کێشەی سەری گرتووە.

بەهۆی ئەو هەموو کارەوە، بەو شاکارە مەزنانە دوچاری سەرسامی بووبووم کە لە سوچێك لە دووری ٣٠٠-٤٠٠ مەترێك چەند پارچە بەردێکم بینی کە بەشێوەی پەرش و بڵاو لەسەر یەکتر دانرابوون. لە ڕێبەرە گەشتیاریەکەم پرسی ئەوانە چین؟ وتی هیچ نیە، هەندێك بەردن. وتم ئەوانەش هەر بەردی لەسەر یەکتر دانراون و هیچ نین، دەمەوێت بزانم هۆوانە چین. وتی ئەوانە چەند چاڵێکن کە چەند کیلۆمەترێك بۆناو زەوی هەڵکەندراون، لێم پرسی بۆچی؟ وتی: سی هەزار کۆیلە، بۆماوەی سی ساڵ ئەو بەردە گەورانەیان لە دووری هەزار کیلۆمەتری یەوە بە شانان دێنان، بەکۆمەڵ لەژێر ئەو بارە گرانانەدا گیانیان دەسپارد، وە هەموو ڕۆژێك هەواڵی مەرگی سەدان کەسیان بە فیرعەون رادەگەیاند. بەڵام سیستەمی کۆیلایەتی کە بە وتەی 'شوارتز' بووە هۆکاری ئەوەی کە هۆکاری بەرزکەرەوە و خلۆکەش دروست نەکرێت، چونکە هەبوونی کۆیلەی هەرزان ئەوانی لەو کەلوپەلانە بێ نیاز دەکرد، بەبێ کەمترین بەزەیی لاشەی پارچە پارچەی کۆیلەکانیان دەخستە ناو چاڵەکانەوەو کۆیلەی تریان دێنان بۆ ڕاکێشانی بەردەکان.

وتم دەمهەویێت بچم بۆ بینینی ئەو هەزاران کۆیلە پارچە پارچە بووەی کە لەگەڵ خاك تێکەڵاو بوو-ون. وتی: ئەوێ شوێنێکە بەکەڵکی سەردان نایەت، بەردی لەسەر یەك و پەرشو بڵاون لەگەڵ چاڵی هەزاران کۆیلە کە بەفەرمانی فیرعەون، لەنزیك گۆڕی ئەو لەخاکدا ناشتویانن، تا هەروەکو کە لە ژیانیاندا پاسەوانی بوو-ون، وە لەشی خۆیان خستبۆ خزمەتی ئەو، لەکاتی مردنیشیدا هەر پاسەوان بن وە گیانیشیان بخەنە خزمەتی ئەوەوە.

وتم بەسە بەجێمبێڵە چونکە هیچیتر پێویستم بەتۆ نیە، بۆخۆم دەچم. ڕۆیشتم و لەتەنیشت چاڵەکان دانیشتم وە بینیم کە چ پەیوەندی یەکی خزمایەتی نیزیك هەیە لەنێوان من و نوستوانی ناو ئەو چاڵانە، هەردووکمان لە یەك نەژادین.

ڕاستە کە من لە سەرزەمینێکەوە هاتووم و ئەوانیش هەریەکەو لەسەرزەمینێکەوە. من لە نەژادێکم و ئەوان لە نەژادی ترن. بەڵام ئەوانە چەند دابەشکردنێکی پیسن تاوەکو مرۆڤەکان پارچە پارچە بکەن وە خزمەکان لەیەکتر وەکو بێگانە نیشان بدەن و بێگانەکانیش وەکو خزم نیشان بدەن.

بەڵام من لەدەرەوەی ئەو بەش بەش کردنانە، لەو زنجیرەو نەژادەم و خزم و هاودەردی ئەوانم. وە کاتێك کە جارێکی تر تەماشای هەرەمەکانم کردەوە، بینیم کە تا چ ئەندازەیەك لەگەڵ ئەو مەزنی و شکۆ و درەوشانەوەیە بێگانەم. یان نەءُ، تا چ ئەندازەیەك بەرامبەر ئەو مەزنی و هونەرو شارستانی یەتی یە کینەم هەیە، چونکە هەموو ئەو کارە مەزنانەی کە لە درێژایی مێژوودا شارستانیەتەکانیان دروستکردووە لەسەر ئێسکی پێشینەکانی من دروستکراون. دیواری چین باب و باپیرانی من بڵندیان کردووە، وە هەرکەسێك کە نەیتوانیوە بەرگەی گرانی بەردە گرانەکان بگرێت و تێکشکاوە، لەناو قەدی دیوارەکەیان هاویشتووە.

دیواری چین وە هەموو دیوارەکان و بینایەکان و بەرهەمی شارستانیەتەکانی مرۆڤایەتی، بەم شێوەیە هاتوونەتە بوون.

*بینیم کە شارستانیەت واتا سوکایەتی، واتا نەفرەت، واتا کینە، واتا شوێنەواری ستەمی هەزاران ساڵە لەسەر شان و پشتی باب و باپیرانی من.*

لەناو کۆمەڵە چاڵەکان دانیشتم و بینیم کە وەکو ئەوە وایە کە هەموو ئەو کەسانەی لەناو ئەو چاڵانەدا خەوتوون، برای منن.

ڕۆیشتمەوە شوێنی نیشتەجێ بوونم و، بۆ برایەکم لە کۆمەڵەی بێشوماری کۆیلەکان نامەیەکم نوسی. وە ئەوەم بۆ ڕوونکردەوە کە لەماوەی ئەو پێنج هەزار ساڵەی کە لێرە نەبووە، بەڵام کۆیلایەتی بەشێوەی جۆراوجۆر هەبووە چی ڕوویداوە.

دانیشتم و بۆم نوسی کە ئەی بـــرام:

تـۆ ڕۆیـشتی، ئێمـە هـەر خـەریکـی دروسـتکردنی شارسـتانیەتـی مـەزن، سەرکەوتنی ئاشکراو شانازی یە مەزنەکان بووین. دەهاتنە گوندو لادێ یەکانمان و وەکو چوارپێ دەیانگرتین و دەیانبردین وە ناچاریان دەکردین کە بۆ دروستکردنی گـۆڕەکانیـان کـار بکـەیـن، وە ئـەگـەر لـەکـاتی کارکردنـدا چیتر بەرگەمان نەگرتبا، وەکو بەردێك لە بینایەکەدا دایان دەنایین وە ئەگەر توانیبامان کارەکە بگەیەنینە کۆتایی، شکۆو مەزنی و شانازی بینایەکە بەناوی کەسێکی ترەوە تۆماردەکرا، وە هەتا ناویشمان لە هیچ بیرەوەری یەکدا نەدەما.

جاری وابوو ئێمەیان دەبرد بۆ جەنگ، جەنگ لەدژی کەسانێك کە نەماندەناسین، وە شمشێرمان لەدژی کەسانێك لەکێلان دەکێشا کە بەرامبەریان هیچ کینەیەکمان نەبوو. هەتا کەسانێك بوون کە هاوەڵ و هاوچین و هاوچارەنوسی ئێمە بوون.

ئێمەیان دەبرد وە دایك و باوکی پیرو لاوازمان چاولەڕێمان دەمانەوەو چاوەڕوانی یەکێکیشیان هەرگیز وەڵامی نەدەبوو.

ئەو جەنگانە بە وتەی زانایەك ئاماژە بوون لە *"جەنگی دوو کۆمەڵە کە شەڕیان لەگەڵ یەکتر دەکرد بەبێ ئەوەی یەکتر بناسن، بۆ کەسانێك کە شەڕیان لەگەڵ یەکتر نەدەکرد بەڵام یەکتریان دەناسی"*. وە ئێمەیان دەبردو لەناومان دەبردو

کوشت و کوشتارمان دەکرد، لەناودەچووین و کوشت و کوشتارمان لێ دەکرا: ئەگەر شکستمان هێنابا، باوك و دایك و گوندە دوورە دەستەکانی ئێمە دەبوو بەرگەی داخ و دەردەکەی بگرن، وە ئەگەر سەرکەوتوو دەبووین، شانازی و دەسەڵات بۆ کەسانی تر دەبوو وە ئێمە هەرگیز بەشدار نەبووین لە شانازی و بەهرەکەی.

بـرام، لـەدوای تـۆ، گۆڕانکـاری یـەکـی گـەورە ڕوویـدا. فیرعـەونـەکـان و دەسەڵاتداران و خاوەن هێزەکانی مێژوو، بیرو ڕایان گۆڕی، ئێمە خۆشحاڵ بووین. ئەوان بڕوایان وابوو کە گیان نەمرە وە هەمیشە بەدەوری گۆڕەکانیاندا دەخولێتەوە وە ئەگەر لاشەکەیان بەساغی بمێنێتەوە، ئەوا گیان پەیوەندی خۆی لەگەڵ لەشدا دەپارێزێت، وە بەهۆی ئەو بڕوایەوە بوو کە ئێمەو ئێوەیان ناچاردەکرد کە لەسەر گۆڕەکانیان ئەو بینا گەورەو بکوژە دروست بکەین، وە ئەوان ڕۆشنبیر بوون وە هیچی تر بیریان لە مردن نەدەکردەوە وە ئەو بڕوا کۆنەیان وازلێهێنا، وە ئێمە مژدەیەکی مەزنمان بیست ئەویش ڕزگاربوون بوو لە دروستکردنی ئەو گۆڕانەو هێنانی ٨٠٠ ملیۆن بەرد لە دووری هەزار کیلۆمەتری و لەسەر یەکتردانانی.

بەڵام برام، ئەوە تەنیا شادی یەکی کاتی زوو-تێپەڕ بوو. چونکە دوای ڕۆیشتنی تۆ، دیسان هاتنەوە لادێ یەکانی ئێمە وە بێگاری یان پێ کردین. دیسان بە پشت و شانەکانمان بەردو کوڵەکەو پایەی گەورەمان هەڵگرتن، بەڵام نەك بۆ گۆڕەکانیان، چونکە هیچی تر گرنگی یان بە گۆڕەکانیان نەدەدا، بەڵکو بۆ کۆشکەکانیان. وە کۆشکە گەورەکان، بە خوێن و گۆشتی ئێمە، لە زەویدا، بەرزبوونەوەو لە تەنیشتیشیان چاڵی دیکە وەچەکانی ئێمەیان قوت دا.

بـرام! جـارێکی تـریش لـە نائومێـدی دابـووین کـە ئومێـدێك وایلێکـردین بمێنینەوە. پێغەمبەرانی گەورە هەستان، زەردەشتی مەزن، مانی مەزن، بودای مەزن، کۆنفۆشیۆسی کارزان، لائوتسوی قوڵ،

دەلاقەیەك بۆ ڕزگاری کرایەوە، خوایەکان بۆ ڕزگاری ئێمە، لە سەرشۆڕی و کۆیلایەتی، پێغەمبەرە ڕزگارکەرەکانی خۆیان ئامادەکردبوون تاوەکو بڕواو پەرستن بکەنە جێگرەوەی ستەمکاری و کۆیلایەتی.

بەڵام برام، ئەو نێردراوانەی خوایەکان، لە ماڵی نێردراوییان دەهاتنەخوار و بەبێ هیچ گوێدانێك بە ئێمە وە هیچ ناوهێنان و یادکردنەوەیەك لە ئێمە، دەڕۆیشتنە ناو کۆشك و قەڵایەکان.

'کۆنفۆشیۆس'ی کارزان ئەو هەمووە باسی کۆمەڵگاو مرۆڤی کرد وە بڕوامان پێ ی کرد، وە بینیمان ڕۆیشتە وەزارەتی 'لو' وە بوو بە خزمەتکاری شازادەکان.

وە 'بودا' کە بۆخۆی شازادەی 'بنارس' بوو دەستی لە هەموو ئێمە هەڵگرت وە لە دەرونی خۆیدا بۆ گەیشتن بە 'نەیرەوانا'، کە نازانم لە کوێ یە، وەرزشی دەرونی مەزن و بیری مەزنی خولقاندن!

وە 'زەردەشت' لە ئازەربایجان ڕەوانەکرا، وە بەبێ ئەوەی گوێ بە ئێمە، کە تێهەڵدراو و تازیەباری چاڵەکان بووین، کە هەر چاڵێك گۆڕی هەزاران برا بووە، بدات، ڕۆیشتە 'بەڵخ' و لە کۆشکی گوشتاسب لە ئێمە دابڕا.

وە 'مانی' باسی ڕووناکی کرد وە بەرەو تاریکی هەنگاوی نا، وە ڕووناکی لە گوێ ی ئێمەدا کە زیندانی تاریکایی ستەمکاری بووین زمزمەکرد، وتمان ئەوجار ئەوەیە کە داوای ڕزگاریمان دەکات. بەڵام وتە ڕووناکەکانی لە کتێبێکدا پێچایەوەو بەدیاری دایە شاپوری ساسانی و لەکاتی تاج لەسەرنانی ئەودا وتاری خوێندەوەو، هەموو شانازی یەکەشی بوو بەوە کە لەگەڵ شاپوردا ناوچەی سرندیب و هیندستان و بەڵخ گەڕا. وە دواتر ئاوا ئێمەی شکاند و شکستی ئێمەی کردە سرود کە: "ئەوەی شکست دێنێت لە خودی تاریکایی دروست بووە وە ئەوەی کە سەردەکەوێت لە خودی ڕووناکایی دروست بووە."

وە بۆ ئێمە شکست هاتووەکانی هەمیشەیی سەرانسەری مێژوو نین؟

برام، تۆ بویە قوربانی ئەو بینا گەورانەی سەر گۆڕەکان، وە من بوومە قوربانی دروستکردنی ئەم کۆشکە گەورانە.

وە لەناکاو بینیم کە لە تەنیشت ئەو فیرعەون و قارونانە کە دەیانکڕین وەکو کۆیلەو ناچاریان دەکردین بێگاری بکەین، هەندێکی تریش لەژێر ناوی جێنشینانی ئەو پێغەمبەرانە دەرکەوتن، پیاوانی ئاینی.

لە فەلەستینەوە بگرە تا ئێران، تا میسر، تا چین، تاوەکو هەر شوێنێك کە کۆمەڵگاو شارستانیەتێکی لێ یە، لە تەنیشت ئەو هەرەمانە، ئەو کۆشکە گەورانە، بۆ دروستکردنی پەرستگای پڕشکۆ دەبوو بەردان بکێشین.

وە دواتر بانگەشەکەرانی پێغەمبەرایەتی و جێنشینەکانیان، کەلەپچەیەکی تریان لە دەستەکانی ئێمە کرد، بەناوی زەکات تاڵانێکی تریان ئەنجام دا، بەناوی تێکۆشان لەپێناوی ئاین دا ئێمەیان بۆ گۆڕەکانی تر نارد تا ئەو شوێنەی کە ناچاریان دەکردین، کە لە بەرامبەر خوایەکان، لە کوشتارگای پەرستگایەکاندا وە لە تەنیشت بتەکان، منداڵەکانمان بکەینە قوربانی.

نازانی برام کە تەواوی پەرستگایەکان پڕە لە خوێنی منداڵە بێ هەڵەکانی ئێمە. وە ئێمە هەزاران ساڵ بەدبەختانەتر لە تۆو چارەنوسی تۆ، گۆڕو کۆشك و پەرستگامان دروستکردن. وە خوایەکان لەگەڵ فیرعەونەکان و لەگەڵ قارونەکان و نوێنەرەکانیان دیسان کەوتنەوە گیانی ئێمە.

سێ بەش لە پێنج بەشی هەموو زەوی یەکانی ئێران موبەدانی خواو ئەهورا لە ئێمەیان ستاند، وە ئێمە بۆ ئەوان بووینە ژێردەستە و کۆیلە و خزمەتکار. کەشیشەکانی خوا چوار لە پێنج بەشی هەموو زەویەکانی فرانك (فەرەنسا) یان لە ئێمە ستاند.

بۆ پەرستگایەکان بێگاریمان دەکرد وە هەموو کۆشکە گەورەکانی ڕۆم و پەرستگایە مەزنەکانی چینمان دروستکردو مردین.

سەرکەوتن هی موبەدەکان و کەشیشەکان و پیاوە ئاینی یەکان و فیرعەونەکان و قارونەکان بوو. وە من هەزاران ساڵ پێش تۆ ژیام وە مەرگی هەموو برایەکانم

و هاونەژادەکانم بینی، هەستم کرد کە خوایەکانیش ڕقیان لە کۆیلەکان دەبێتەوە وە ئەو ئایینانە زنجیرێکی ترن بۆ کۆیلایەتی ئێمە وە موبەدان و کەشیشان و پیاوە ئاینی یەکانیش هۆکارێکی ترن بۆ بەهێزکردنی ئەو کۆشك و کۆڕانە، وە ئاراستەکەری ئەو ڕژێمەن.

وە دواتر چونکە کارزانان و زانایانی مێژوو لە ئێمە باشتر بیردەکەنەوەو تێدەگەن! وەکو ئەرستۆ دەڵێت: "هەندێك بۆ کۆیلایەتی و دەستەیەك بۆ ئاغایی کردن دێنە ئەم جیهانە"، دڵنیا بووم کە ئێمە بۆ کۆیلایەتی کردن هاتوینەتە ئەم جیهانە وە جگە لەوە هیچ چارەنوسێکی ترمان نییە، وە چارەنوسی دیاریکراو بۆمان کۆڵکێشان و ستەمدیدەیی و بەقامچی لێدران و بەکەم زانران و بەپیس زانینمان و بەندایەتی یە، وە جگە لەوانە هیچی تر نییە.

بەڵام برام، لەناکاو هەواڵم بۆ هات کە کەسێك لە شاخەوە هاتۆتە خوارو لە تەنیشت پەرستگایەك هاواری کردووە کە:

من لەلایەن خواوە هاتووم

وە من دیسان لەجێ ی خۆم لەرزیم کە دیسان فریوێکی نوێ بۆ ستەمێکی نوێ، بەڵام کاتێك دەستی بە قسەکردن کرد باوەڕم نەکرد، دەیگوت: من لەلایەن خواوە هاتووم وە خوا ویستی لەسەرە کە بەخشش بەسەر هەموو کۆیلەو بێچارەکانی زەویدا بڕێژێت وە بیانکاتە پێشەوایانی جیهان و میراتگرانی زەوی.

سەرسوڕهێنەرە! چۆنە کە خوا لەگەڵ کۆیلەو بێچارەکان ئەدوێت، وە مژدەی ڕزگاری و ڕابەری و میراتگری زەوی دەدات.

بڕوام نەکرد، وتم ئەویش هەروەکو پێغەمبەرەکانی تری ئێران و چین و هیندستان شازادەیەکە کە بە پێغەمبەرایەتی نێردراوە تاوەکو لەگەڵ خاوەن هێزێك ببێتە هاوپەیمان و هێزێکی تازە دروست بکات.

بەڵام وتیان، نا، ئەو دایك و باوکی کۆچی دواییان کردووەو هەموو ئەویان بینیوە کە لەپشت ئەم شاخە مەڕی لەوەڕاندووە. وتم سەیرە! چۆنە کە خوا نێردراوەکەی لە نێو شوانەکان هەڵبژاردووە؟

وتیان: ئەو دوایین ئەڵقەی زنجیرەیەکە کە لەو زنجیرەیەدا هەموو باپیرەکانی شوان بوو–ون، لەخۆشیان یان بەهۆی هەراسێکی زمانگیرەوە لەبەرخۆمەوە لەرزیم کە بۆ یەکەمین جار لەنێو ئێمەدا پێغەمبەرێك هەستاوە.

برام بڕوام بەو هێنا، چونکە هەموو برایەکانم لەدەوری ئەو بینین: بیلال، کۆیلەیەکی هەرزان نرخی بێگانە کە خەڵکی حەبەشە بوو: سەلمان، کۆیلەیەکی ئاوارەی خەڵکی ئێران: ئەبوزەر، هەژارێکی مەینەتباری بیٚ ناوی دەشت: سالم، کارکەری حوزەیفە، ئەو بێگانە هەرزان نرخە کە ئێستا بوٚتە پێشەوای هەموو هاوەڵانی ئەو.

باوەڕم کردو بڕوام هێنا چونکە کۆشکەکەی چەند ژوورێکی گڵ بوو کە بۆخۆی بەشداری کردبوو لە کێشانی ئاو و گڵەکەی، وە بارەگاو تەختەکەی پارچە دارێك بوو کە پڕبوو لە گەڵای خورما.

ئەوە هەموو دەزگای ئەو بوو، وە ئەمە هەموو ئەو پەستانە بوو کە بۆ دروستکردنیماڵەکەی خستیە سەر خەڵك، وە تاوەکو هەبوو بەم شێوەیە بوو وە بەم شێوەیەش مرد.

لە ئێرانەوە هاتم، هەڵاتم لە ڕژێمی موبەدان وە هەڵاتم لەدەست ڕژێمی بنەماڵە مەزنەکان کە هەمیشە ئێمەیان دەکردە کۆیلە بۆ جەنگەکان و کۆیلەی دەسەڵاتەکانیان وە هاتم بۆ شاری ئەو لەگەڵ کۆیلەو ئاوارەو بیٚ پەنایەکانی جیهان، وە لەگەڵ ئەو ژیام تاوەکو بژوێڵکەکانی بەهۆی سەنگینی مەرگەوە خۆری ئێمەیان خستە ژێر پەردەوە.

وە برام! لەناکاو بینیم کە جارێکی تر پەرستگای مەزن و پڕشکۆ بەناوی ئەوەوە سەریان هەڵدانەوە، وە شمشێرەکان کە ئایەتەکانی جیهادیان پێوە هەڵواسرابوون بەرەوڕووی ئێمە کرانەوە. وە دیسان بەهۆی بەروبوومی تاڵانکردنی ئێمەوە وە بە فەرمانی ستەم، بەیتولماڵەکان پڕبوون. وە نوێنەرانی ئەو کابرایەش بە گوندەکان وەربوون، وە لاوەکانی ئێمەیان برد بۆ کۆیلایەتی نوێنەرەکان و سەرۆکەکانی پێشوویان، وە دایکانی ئێمەیان لە بازاڕە دوورەکان

فرۆشتن، وە پیاوەکانمانیان کوشتن لەژێر ناوی جیهاد لە پێناوی خوادا، وە هەموو بوونی ئێمەیان بەناوی زەکاتەوە بەتاڵان برد.

بێ ئومێد بووم، چ بکەم برام وە دەمتوانی چ بکەم؟

هێزێك دروست بووبوو کە لە پۆشاکی یەکتاپەرستی دا هەمان بتەکانی پێشووی شاردبۆوە، وە لە پەرستگاو میحرابی الله دا هەموو ئاگرەکانی فریو داگیرسێندرابوون، وە دیسان هەموو ڕووخسارە قارونی و فیرعەونی یەکان -کە تۆ باش دەیانناسی برام، وە ڕووخسارە پیرۆزە- درۆیینەکان هاودەست و هاوداستانی قارون و فیرعەون کە بەناوی جێنشینی الله و جێنشینی پێغەمبەری الله، لەسەر گیانی مرۆڤایەتی و لەسەر گیانی ئێمە بە قامچی یەکان ئاوازی شەرعیان دەرهێنا، وە ئێمە دیسان بووینەوە کۆیلە بۆئەوەی مزگەوتی گەورەی دیمەشق دروست بکەین.

جارێکی تر ململانێ ی مەزن و میحرابی پڕشکۆو کۆشکی مەزن و کۆشکی سەوزی دیمەشق و دارولخەلافەی هەزارو یەك شەوەی بەغدا بە بەهای خوێن و ژیانی ئێمە دروست بوون وە ئەم جارە بەناوی "الله" وە.

ئەوجار بڕوام کرد کە ڕێگای ڕزگاری نییە وە چارەنوسی براوەمان کۆیلایەتی و بوونە قوربانی یە. ئەو کابرایە کێ بوو؟ ئایا لە پەیامەکەیدا فریودانی ئێمەی شاردبۆوە. یان لەو ڕژێمەدا کە ئێستا لە زیندانە تاریکەکانیدا دەڕزین وە هەموو برایەکانم و کێڵگەکان و بوون و چارەنوسی ئێمە بەتاڵان براوەو بەکۆمەڵ کوژراوە، من و ئەو -ئەو پێغەمبەرە- هەردووکمان بووینە قوربانی؟

نازانم هیچی تر هیچ ڕێگایەك لەبەردەمم نەبوو. دەبوو بۆ کوێ ڕۆیشتبام؟ بۆلای موبەدەکانی خۆم؟ چۆن دەمتوانی بگەڕێمەوە ئەو پەرستگایانەی کە هەمیشە هاودەست و هاوداستانی دەسەڵاتەکان و فریوەکان بوو-ون؟

بۆلای ڕێبەران و بانگەشەکەرانی ئازادی نەتەوایەتیم بڕۆم؟ ئەوانە هەموو کەسانێك بوون کە حکومەتە -ڕاپەڕینە- نوێ یەکەیان، دەسەڵاتە بنەماڵەیی یەکانیشیان لە خوراسان و سیستان و گورگان لەدەست دابوون وە ئێستا بۆ

بەدەستهێنانی حکومەتی بنەماڵەیی و زیندوکردنەوەی ڕژێمی نەفامییان شەڕیان دەکرد.

بۆلای مزگەوتەکان بڕۆم؟ چ جیاوازی یەك هەبوو لەنێوان ئەم مزگەوتانە و ئەو پەرستگایانە؟ لەناکاو بینیم- برام! کە ئەو شمشێرانەی کە بە سەرەکانیانەوە ئایەتەکانی جیهاد هەڵواسرابوو وە ئەو پەرستگایانەی کە پڕ بوون لە سرود و پاڕانەوەکانی "الله" وە بانگدانێك کە بانگی یەکتاپەرستی یان دەداو ئەو ڕووخسارە پیرۆزانەی کە بەناوی خەلافەت و بەناوی پێشەوایەتی و درێژەپێدەری سوننەتی ئەو پێغەمبەرە لەسەر کاربوون و ئێمەیان کردبوو بە کۆیلەو بەکۆمەڵ دەیانکوشتین، پێش من کەسێکی تریان کردە قوربانی ستەملێکراوی ئەم شمشێرو میحرابانە "عەلی"!

برام! عەلی، خزمی ئەو پێغەمبەرە بوو وە لە میحرابی پەرستنی "الله" دا کوژرا. بۆخۆی پێش من و خێزانەکەی پێش خێزانەکەی من و پێش خێزانی کۆیلەکان و ستەمدیدەکانی مێژوو، لەناوچوون وە ماڵەکەی پێش ماڵی ئێمە بەناوی سوننەتی جیهاد و زەکات تاڵان کرا.

وە قورئانیش پێشئەوەی ببێت بە ئامرازێك دیسان بۆ داماڵینی من، دیسان بۆ لەناوچونی من، دیسان بۆ بێگاری پێکردن و بەکۆیلەکردنی من، بەسەری نێزەکانەوە کراو عەلی شکاند.

سەیرە! ئەمە بوو کە دوای پێنج هەزار ساڵ کەسێکم دۆزیەوە کە باسی خوای دەکرد، بەڵام نەك بۆ خاوەن سامان و دەسەڵاتەکان، بۆ کۆیلەکان. نزای دەکرد، نەك وەکو بودا تاوەکو بگاتە "نەیرەوانا"، یان نەك وەکو ڕاهیبەکان بۆئەوەی خەڵك فریو بدەن، یان نەك وەکو پاکەکان بۆئەوەی خۆیان بگەیەننە خوا، دوعای لە "الله" دەکرد بۆ ڕزگاری "خەڵك".

مرۆڤێکم دۆزیەوە، مرۆڤی تێکۆشان، مرۆڤی دادپەروەری -دادپەروەری یەك کە یەکەمین قوربانی دادپەروەری یە توند و وشکەکەی، برایەکەی بوو- کەسێك کە هاوسەرەکەی، -کە هەم هاوسەری ئەو بوو هەم کچی پێغەمبەرە

مەزنەکە بوو- وەکو خوشکی من کاری دەکرد و ڕەنجی دەکێشا و بێ بەشی و برسیەتی وەکو ئێمە بە پێست و گیانی دەچێشت و دەچێشت.

برام!

کەسێکم دۆزیەوە کە کچ و کوڕەکەی میراتگری ئاڵایەکی سور بوون کە لە درێژایی مێژوودا لە دەستی ئێمەو پێشەوایانی ئێمەدا بوو-وە، ئەوەیە کە دوای پێنج هەزار ساڵ لە ترسی ئەو پەرستگایانەی کە تۆ دەیانناسی وە منیش، وە لەترسی ئەو هێزە ترسناکانەی کە تۆ دەیانناسی وە منیش، پەنام بۆ ئەو خانووە گڵە دوورە دەست و بێ دەنگە هێنا. هاوەڵانی پێغەمبەرەکە لەدەوری ئەو ماڵە دوورکەوتونەتەوە وە بە تەنیا ماوەتەوە، هاوسەرەکەی (فاتیمە) کۆچی دوایی کردووە وە بۆخۆی لەناو باغە خورمایەکانی بەنی نەججار، تەواوی ڕەنجەکان و دەردەکانی من و تۆ بۆ خوایەکەی باس دەکات، وە من لەترسی ئەو پەرستگا ترسناکانە و کۆشکە هەراس هێنەرانە و ئەو گەنجینانە کە هەموویان بە خوێن و ڕەنجی ئێمە پەیدابوو-ون پەنا بۆ ئەم ماڵە دێنم وە سەرم بە دەرگای ئەو ماڵە چۆلکراوەدا بەکەم وە غەمی چەندین سەدە بەدەنگ دەکەمە گریان.

برام! ئەو وە هەموو ئەو کەسانەی کە وەفادار مانەوە لە ڕەچەڵەك و نەژادی ئێمەی ڕەنجدەر بوون. ئەو بۆ یەکەمین جار، جوانی وشەی نەك بۆ ئاراستەکردنی (ئاسایی نیشاندانی) بێ بەشی ئێمە و هەبوونی خاوەن هەبوونەکان، بەڵکو ڕزگاری و هۆشیاری ئێمە بەکارهێنا، ئەو باشتر لە "دموستنس" قسەی دەکرد، بەڵام نەك بۆ هێنانەدی مافەکانی خۆی. ئەو باشتر لە "بوسوئەو ی وتاربێژ" دەدوا، بەڵام نەك لەبەر دەرگای لویس، بەڵکو لەپێش ستەمدیدەکان، بەسەر دەسەڵاتدارەکاندا هاوار دەکات. ئەو شمشێرەکەی نەك بۆ بەرگریکردن لە خۆی و خێزان و نەژاد و نەتەوەی خۆی و نەك بۆ بەرگریکردن لە دەسەڵاتە مەزنەکان بەکاردێنا، بەڵکو باشتر لە "ئەسپارکتوس" وە لێبڕاوانەتر لەو بۆ ڕزگاری ئێمە یە کە لە هەموو گۆڕەپانەکاندا لە کالانەکەی هێناوەتەدەر.

ئەو باشتر لە سوکرات بیری دەکردەوە، بەڵام نەك بۆ سەلماندنی چاکیەتی ڕەفتاری نەجیبزادەکان کە کۆیلەکان لیَ ی بیَ بەشن، بەڵکو بۆ چەسپاندنی ئەو بەها مرۆییانەی کە لە ئێمەدا زیاترن. چونکە ئەو میراتگری قارونەکان و فیرعەونەکان و موبەدەکان نییە. ئەو بۆخۆی نە میحرابی هەیە و نە مزگەوت، ئەو قوربانی میحرابە.

ئەو دیمەنی دادپەروەری و دیمەنی بیرکردنەوەیە، بەڵام نەك لە گۆشەی کتێبخانەکان و خوێندنگاو ئەکادیمیایەکان و نەك لە زنجیرەی زانایە پاك و خاوێنەکان  کە لە ژووریَ دانیشتوون– کە بەهۆی توندی بیرکردنەوە قوڵەکان! لە چارەنوسی خەڵك و ڕەنجی خەڵك و برسیەتی کۆمەڵانی خەڵك بیَ ئاگان: ئەو لە هەمان دۆخدا کە لە ئەوپەڕی ئاسمانەکاندا دەفڕێت، ناڵەی منداڵێکی بیَ باوك یان بیَ دایك گڕ لە هەموو ئەندامەکانی بەردەدات. ئەو، لە هەمان دۆخدا کە لە میحرابی پەرستندایە، ڕەنجی جەستەو ئازاری خەنجەر فەرامۆش دەکات، لەبەر ستەمێك کە بەرامبەر ژنێکی جولەکە کراوە، هاوار دەکات: ئەگەر کەسێك بەهۆی ئەو شەرمەزاری یەوە بمرێت جیَ ی سەرزەنشتکردن نییە.

ئەو برام! مرۆڤی سیحر و قسەی جوانە، بەڵام نەك وەك شانامە کە لە (٦٠) هەزار دێڕەکەیدا، یەك جار، تەنیا یەك جار، باسی نەژادی ئێمەو برایەکی ئێمە –کاوە–ی کرد، باسی ئاسنگەرێك کە دیاربوو لە ڕەچەڵەکی ئێمەیەو پەیمانی داوە کە ئازادی و شۆڕش و ڕزگاری خەڵك و گەل بێنێتە دی، بەڵام ئێستا هەڵنەستاوە– ئەو تاکە قارەمانەی ڕەچەڵەکی ئێمە کە هاتبوو بۆناو شانامە– بزر دەبێت. لەکویَ؟ بۆچی؟ چونکە ڕەچەڵەك و نەژادی فەرەیدون درەوشایەوە، لەبەرئەوەیە کە لە تەواوی شانامەدا تەنها چەند دێڕێك باسی ئەو دەکات.

ئێستاش برام! لە بارودۆخ و چەرخ و کۆمەڵگایەکدا دەژین کە دووبارە من و هاونەژادان و هاوچینەکانم پێویستمان بەوە.

ئەو بەپێچەوانەی کارزانانی تر، بەپێچەوانەی بلیمەت و بیریارانی تر، کە ئەگەر بلیمەت بن ئەوا ئەهلی کارکردن نین، وە ئەگەر ئەهلی کارکردنن، ئەهلی بیر و

تێگەیشتن نین، وە ئەگەر هەردووکیانن، ئەهلی شمشێر و تێکۆشان نین، وە ئەگەر هەرسێکیانن، ئەهلی پرهێزکاری و پاکداوێنی نین، وە ئەگەر هەر چواریانن، ئەهلی ئەوین و هەست و چاکێتی گیان نین، وە ئەگەر هەموویانن، خوا ناناسن وە خۆیان لە بڕوایەکانیاندا ون ناکەن، وە خۆیانن- ئەو کەسێکە کە لە هەموو ڕوویەکەوە مرۆڤانەیە، وەکو کرێکارێك -وەك من و تۆ- کاردەکات وە بەهەمان ئەو پەنجانەی کە دێڕە مەزنە خوایی یەکان لەسەر کاغەز دەنوسێت، پەنجەکانی دەخاتە ناو خاکەوە، بیر هەڵدەکەنێت، جۆگەی ئاو لێدەدات لە زەوییە ئاوگرەکان ئاو دەردەکات. کرێکارێکی تەواوە، بەڵام نەك لە خزمەتی ئەم و ئەودا وە نەك لە خزمەتی خۆیدا، لە قوڵایی بیردا لەناکاو بانگ دەکات: هەڵم بکێشنەوە. وە کاتێك دەیهێننە دەرەوە لە بیرەکە، بە سەرو ڕووخساری تۆزاویی یەوە، ئاو هەڵدەقوڵێت، لەو بیابانە سوتێنەرەی دەوری مەدینە ئاو هەڵدەستێت. "بەنی هاشم" خۆشحاڵ دەبن، بەڵام ئەو لە هەمان دۆخی -هەناسە بڕدا- دەڵێت: "مژدە بۆ میراتگرانی من کە یەك دڵۆپەش لەو ئاوە نابێت بە نسیبیان." کە داویەتی بە من و تۆ، ئەی برام!

وە ئێستا نیازیمەندی ئەوین وە پێویستمان بە پێشەوایەکی وەك ئەوە، چونکە هەموو شارستانی یەتەکان و کلتورەکان و ئاینەکان، یان مرۆڤەکانیان کردوّتە ئاژەڵی ئابوری یان کردویانەتە ئاژەڵێکی دوعاکەری خۆبینی تاکەکەسی لە چاڵەکانی پەرستن و ڕوحانیەت دا: یان خەڵکی خاوەن ئەندێشەو بیرکردنەوەو ژیری، بەڵام بەبێ هەست و سۆز و بێ دڵ و بێ قوڵبوونەوەو بێ ئەوین، یان خەڵکی هەست و سۆزو ئەوین و نیگا بەڵام بەبێ ژیری و بێ بیرکردنەوەو بێ زانست و بێ ژیربیری، وە ئەو کەسێکە کە هەموو ئەو ڕەهەندانەی هەیە. خوایی لە ڕەنجدان و ڕەنج و کاردا، خوایی لە قسەکردن، خوایی لە تێکۆشان، خوایی لە لێبڕاویی دا، خوایی لە بەوەفادار مانەوەدا، خوایی لە ڕەنج دا، خوایی لە بێدەنگیی دا، خوایی لە هاوارکردن دا، خوایی لە دادپەروەری دا: وە ئێستا برام! من لەنێو کۆمەڵگایەکدام، کە لە بەرامبەرمدا

دوژمن لەشێوەی سیستەمێکی بەهێزدا بەسەر زیاتر لە نیوەی جیهان وە بە دەربڕینێکی تر بەسەر هەموو جیهاندا حکومەت دەکات، وە ئەوەی ئێمە بۆ کۆیلایەتی یەکی نوێ لە دەروونەوە ئامادە دەکات! ئێمە ئێستا، لەڕوانگەی دەرەکی یەوە بۆ کەس بێگاری ناکەین، ئازاد بووین، کۆیلایەتی نەماوە، بەڵام بە کۆیلایەتی یەکی خراپتر لە چارەنوسی تۆ فەرمانبەسەردادراوین. ئەندێشەی ئێمەیان کردۆتە کۆیلە، دڵی ئێمەیان زنجیر کردووە وە ئیرادەی ئێمەیان بەدەستەوە داوە، وە ئێمەیان بۆ پەرستنێکی ئازادانە پەروەردە کردووە: وە بە هێزی زانست و کۆمەڵناسی و کلتور و هونەر و ئازادی یە ڕەگەزی یەکان و ئازادی خەرجکردن و خۆشویستنی سامان و دەسەڵات و تاک–پەرستی: لە دەرونی ئێمەدا وە لە دڵی ئێمەدا، بڕوابوون بە ئامانج و بەرپرسیاریەتی و بڕوابوون بە مەکتەبی ئەویان سڕیوەتەوە.

وە ئێستا برام! ئێمە لە بەرامبەر ئەو ڕژێمە فەرمانڕەوایانەدا، بووینە گۆزەی بەتاڵی جوان، کە هەرچی دروستی دەکەن ئێمە هەڵیدەلوشین.

ئێستا بەناوی دەستە، بەناوی خوێن، بەناوی خاك و بەناوی خودی ئەو وە پێچەوانەکانی ئەو، پارچە پارچە دەبین، تاوەکو هەر پارچەیەکمان پارووییەکی ئاسان بین بۆناو زار و قورگیان. جودایی نانەوە! جودایی نانەوە!

پەیڕەوانی ئەو و مەکتەبەکەی ئەویان خستۆتە گیانی یەکتر. ئەمە دوژمنی ئەوە. بۆچی لە وەها چارەنوسێکدا کە فەرمانڕەوایە بەسەر جیهان و ئێمەشدا، دوژمنایەتی ئەو دەکات؟ چونکە ئەو بەدەستی گرتووەوە نوێژدەکات وە ئەوی تر ڕقی لێ ی دەبێتەوە، چونکە بەدەستی بەرهەڵدراوەوە نوێژدەکات! ئەمە دوژمنی ئەوە چونکە بەردە مۆرەی نییەو سوجدە لەسەر فەرش دەبات، وە ئەو کینەی بەرامبەر ئەم هەیە چونکە ناوچاوانی لەسەر بەردە مۆرە دادەنێت.

جەنگەکان و دوژمنایەتی یەکان بەرەکانییان تا ئەم ئەندازەیە تەسك کردۆتەوە وە ڕۆشنبیرەکانی ئێمەیان بۆ سەرزەوی یەکی تر ڕاوناوە و بۆخۆیان قەد و باڵای شوانەکانیان وەرگرتووە.

برام! تۆ گەورەی خۆت بەسادەیی دەناسی وە بەئاسانی هەستت بە ئازاری ئەو قامچی یەی پێت دەکەوت دەکرد وە دەتزانی کە کۆیلەی وە بۆچی کۆیلەی وە کەی بوییە کۆیلە وە چ کەسانێك تۆیان کردوتە کۆیلە: وە ئێستا ئێمە دووچاری چارەنوسێکی هاوشێوەی چارەنوسی تۆ بووین، بەبێ ئەوەی بزانین کێ ئێمەی کردوتە کۆیلەی ئەم سەدەیە وە لە کوێ وە تاڵان دەکرێین وە چۆن دووچاری خۆبەدەستەوەدان، لادانی ئەندێشە و پەرستنی شتە زەمینی یەکان بووین. ئێستا نەك تەنها ئێمە وەك چوارپێ یەکان دەکەنە کۆیلە، بەڵکو بەهرەکانیشمان لێ دەستێنن. لەپێش چەرخی تۆو زیاتر لە چەرخی تۆ بەهرەکانمان دەدەین. هەموو ئەو هێزانە، سەرمایانە، ڕژێمانە، ئامێرانە، کۆشکە گەورەکانی جیهان وە هەموو ئەو سەرمایە مەزن و بێ نیازانە و سەرمایەی بەرهەمهێنان، بە پێست و گۆشت و خوێن و ڕەنج و پەرێشانی و بێ بەشی خۆمان هەڵدەسوڕێنین وە بەشمان تەنیا ئەوەندەیە کە بتوانین بەیانیش پێ ی کاربکەین. زیاتر لە چەرخی تۆ، بێ بەشین و چەوساندنەوەو جوداخوازی چینایەتی و ستەم زیاترە لە سەردەمی تۆ، بەڵام لە ڕووخساری نوێ دا و بە ڕازاندنەوەی نوێ ی ترەوە! وە برام! عەلی تەواوی تەمەنی لەسەر ئەو سێ وشەیە دانا :دیمەنی بیست و سێ ساڵ هەوڵ و گیان خستنە مەترسی و تێکۆشان بۆ دروستکردنی بڕوایەك، لە دەروونی دڕندە جوداخوازەکاندا، وە بیست و پێنج ساڵ بێدەنگی و بەرگەگرتنی هەڵبژارد لەپێناوی یەکیەتی خەڵکی موسڵمان لە بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆم و ئێران: وە دادپەروەری وە بۆنەوەی هەموو گرێ و کینەکانی ئێمە لەگەڵ شمشێرەکەی خۆیدا دەرکێشێت وە ئازادمان بکات.نەیتوانی! نەیتوانی! بەڵام توانی ڕێباز و پێشەوایی و سەرکردایەتی کردنێك بۆ هەمیشە -بە من و ئێمە، ئەی برام- ڕابگەیەنێت. ڕێبازی دادپەروەری و ڕێبازی ڕابەری خەڵك: وە سێ شیعاری دانا کە هەموو بوونی خۆی و بنەماڵەکەشی کردە قوربانی یان:

مەکتەب، یەکیەتی، دادپەروەری.

## ♣ بـرادەری لـە خۆشەویستی بەرزترە

کتێبـی "هونـەری خۆشەویـستی" یـم دەخوێنـدەوە کـە لـەودا ئـەریك فـۆرم، بـە کۆکردنـەوەی قسەی کۆمەڵە کەسێکی وەکو کنتی و کیەیرکەگارد و سارتەر و کامۆ هەوڵدەدات تا بەسودی مرۆڤـخوازی humanism گلەیی و گازندەیەك کە بانگهێشتی بۆ دەکات، خۆشەویـستی یـەکان ئاراستەبکات و ڕوونبکاتـەوە، وە بەقـسەی جـوان و ڕەوانبێـژی هونەرمەندانـەی، هەسـتێت بـە "شـیکردنەوەی ڕێنومایی یانەی" خۆشەویستی یەکان، بە سودی "مرۆڤـایەتی" و بەقازانجی "کۆمەڵگە"!. مـن لـە پێرستێکی تـەواو کە ئەو لـە هـەموو جۆری خۆشەویستی یەکان ڕیزی کردووە، لە خۆشەویستی ژن و پیاو و خەڵك و نیشتیمان و باوك و کوڕ و مرۆڤ و خواو ....

هەرچەند گەڕام ئەوەم نەدۆزیەوە کە دڵی من چەندەها ساڵە لەگەڵیدا ئاشنایە وە ئـەویش تـەنها خۆشەویـستی یەکـە کـە "زادەی مرۆڤـە"، کـە ئیـدی خۆشەویستی یەکان هەموو سەپێنراوی سروشتن و پێویستی بونەوەر، چی، ئەو خۆشویستراوانە هەمووی سروشت بۆ ئێمەی دیاری کردوون وە سۆز –کە فەرمانبەری ئەوە– ئێمە، بێ خۆبوون، ناچاردەکات کە خۆشەویستی نیشان بدەین وە تەنها یەك خۆشەویستی یە کە ئەویش "منی پەتی و ئازاد و گیانی بە

گیانی" مرۆڤــی، ئەو خودەی خودی ئێمە، بێ سەپاندنی سروشت وە بەبێ پێداویستی دۆخ و بەرژەوەندی و قازانج، "هەڵدەبژێرێت"وە ئەویش ڕاکێشەری نهێنی ئامێزی دوو گیانە کە تامی هێمداری خزمایەتی سەرسوڕهێنەر -کە ڕیشەی لە جیهانێکی تردایە- لە یەکدیکە دەچێژن وە ڕەنگی هاونەژادی ئەوپەڕی لە ڕوخساری یەکتردا دەبینن وە وەکو دوو هاونیشتیمان، لەناکاو، لەو وڵاتە بێگانەیەی ژیاندا، بەڕێکەوت، دێنەسەر ڕێی یەکتر و لە یەکەمین دیداردا، دووبارە یەکدیکە "دەناسنەوە" وە هەر ساتەو، هێڵی ئاشنایی و خزمایەتی قوڵ و ڕوون -کە ناتوانرێت بشاردرێتەوە- لە یەکتردا دەخوێننەوە وە پەیوەندی یەکی بەو شێوەیە، نە لەو جۆرە خۆشەویستی یانەیە کە بکەوێتە بەرچاوی ئەریك فۆرم کە مرۆڤخوازەو مرۆڤخواز، هەرچۆنێك بێت، گشتبینێکی سادەی خۆش دڵە وە چ هەواڵێکی هەیە لەوەی کە لە هەندێك "دەروونەکاندا" ڕوودەدات؟

وە چ دەزانێت لەو خۆشەویستی یانە کە هەموویان کۆمەڵە فێڵێکن تا مرۆڤ بکەنە بریکاری سروشت و خزمەتکاری کۆمەڵگە، خۆشەویستی یەکی گەورەتریش هەیە کە وەکو خۆشەویستی یەکانی تر ئامێری کار نی یە وە ئەویش خۆشەویستی مرۆڤ بۆ مرۆڤە، خۆشەویستی گیانێکە بۆ گیانێکی دیکە. گیانێکی تەنیاو نیازمەند بە گیانێکی جوان و بەنرخ و سەروەتمەند، خۆشەویستی "خزمێك" بۆ "خزمێکی" خۆی، لەناو ئەو کەڵەکەبوونەی خەڵك کە وەکو مێرووەکان لە زەویدا دەڕوێن و هەریەك بە "بەرژەوەندی یەك" لەو "ژیانی ڕۆژانە" پیسەدا، لەناویەکدا دەگەوزن و دەمرن.

پێم حەیف بوو کە ناو لەویش بنێم "خۆشەویستی" کە شاعیرەکان پیسیان کردووە. ویستم پێی بڵێم "خواست"، مەلایەکان بەرەو گەمژەییان برد. وتم باشترین وشە لێرەدا "خزمایەتی" یە، خزمایەتی دوو گیان، دوو بێگانە: بەهۆی ئەو چاکیەتیە جوانیەی کە لە پێکهاتەی ئەو ووشەیەدا هەیە "خود: خویش" وە "-دار: -وند" (خزمایەتی: خودخاوەنی)! ترسام کە تێنەگەن.

هەرچـۆنێك بێـت دەڵـێم: "بـرادەری". وەمەبەسـتم خۆشەویـستی و خواسـت و بڕوای دوو گیانی ئاشنای خزمن. دوو "مرۆڤـی" کە جگە لەو هـەویرە گیانی بە گیانی و پەتی و پاکەی کە "منی مرۆڤـی پـەتی" هەرکەسێك دروست دەکات، هیچ بەرژەوەندی و پێویستی یەك ئەوان پێکەوە نابەستێتەوە، پەیوەندی یـەك کە نە سروشت، نە ڕسکان، بەڵکو تەنهایی نێوان دوو تەنهای خزم بەستویەتی و ... نازانم چ بڵێم؟

هەرچـۆنێك بێـت، ئـەوەی کـە مـن لـە ماسـیۆن لـەناو ئێـسکانمدا، لـە قوڵـایی سروشـتمدا، هەسـت دەکـەم. ئەوەی کە لەژیانی ئەودا هەستم پێدەکرد هـەموو ڕۆژێك، دەست لەناو دەستی ئەودا، بۆ ئەو "نـازانم کوێنـدەری یە" کە هەمیشە کەسـەری دوورکەوتنەوەکەیشمان هەیە، نزیکتردەبمەوە، وە لـە سـەرنجیدا، ئەو "نازانم کێ"یەی کە هەموو کات لە چاوەڕوانی بینینەوەیدا بێ ئارامێن دەبینم وە ئێستا، پێنج ساڵە کە هـەموو ڕۆژێك بۆ کۆچی دوایـی ئـەو پرسەدارتر دەبم وە هەرچی کات تێدەپەڕێت، لە ڕۆژی ئەو "ڕووداوە" نزیکتردەبمەوە.

ئەو بوو فێری کردم:

برادەری لـە خۆشەویستی بەرزترە. خۆشەویستی جۆش و خرۆشێکی کوێرەو پەیوەندی یەکە لە ڕووی نابینایی یەوە. بەڵام برادەری پەیوەندیەکی خۆئاگایـەو لـەڕووی بینـایی ڕوون و زولاڵەوەیـە. خۆشەویـستی زیـاتر لـە هـەوەس ئاودەخواتـەوە وە هەرچی لـە هەوەسـەوە سـەرهەڵدات بـێ نرخـە و بـرادەری لـە گیانەوە هەڵدێت و تـا شوێنێك کە گیان بـەرزە، برادەریش لەگەڵ ئەودا دەگاتە لوتکە پێی.

خۆشەویستی لـە زۆربـەی دڵەکانـدا، لـە شێوەو ڕەنگی بەنیزیکـەیی "وێکچوو، ڕەنگدەداتـەوە وە خـاوەنی تایبەتمەنـدی و دۆخ و ڕووکـاری هاوبەشـە، بـەڵام برادەری لەهـەر گیانێکدا دەرەوشانەوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە وە لـە گیانـەوە ڕەنگ پەیدادەکات وە وەکو گیانـەکان، بە پێچەوانەی هەوەسەکانەوە هەریەکەو ڕەنگێـك و بـەرزی یـەك و ڕوویـەك و تامێـك و بـۆنێکی تایبـەتی خـۆی هەیـە،

دەتوانرێت بگوترێت کە بەئەندازەی ژمارەی گیانەکان، برادەری هەیە. خۆشەویستی بێ پەیوەندی یە لەگەڵ ناسنامەدا و تێپەڕینی وەرز و ساڵەکان کاریگەری لەسەر دادەنێت، بەڵام برادەری لەدەرەوەی کات و باری مێشکی ژیان بەسەردەبات وە ڕۆژ و ڕۆژگار دەستی ناگاتە مێلانەی بڵندی ئەو.

خۆشەویستی، "لەهەر ڕەنگ و ئاستێکدا، بە نهێنی یان ئاشکرا، پەیوەندی بە جوانی هەستکراوەوە هەیە. هەروەکو شوپنهاور دەڵێت: "تۆ بیست ساڵ بخە سەر تەمەنی خۆشەویستەکەت، ئەوکاتە لەکاریگەری ڕاستەوخۆی ئەوە لەسەر هەستەکەت بکۆڵەوە"!

بەڵام برادەری بەشێوەیەك لە گیاندا نقوم بووەو گێژی جوانی یەکانی گیانە کە جوانی یە هەستپێکراوەکان بەشێوەیەکی تر دەبینێت. خۆشەویستی تۆفانی یەو شەپۆلاوی یە وە سیفەتی قەڵی هەیە، بەڵام برادەری ئارام و پتەوەو پڕ لە ڕەسەنی یە. خۆشەویستی بە دووری و نیزیکی لە لەرینەوە دایە، ئەگەر دووری درێژەبخایەنێت لاوازدەبێت، ئەگەر پەیوەندی بەردەوامی هەبێ بە خراپی بەکاردەهێنرێت. وە، تەنها بە ترس و ئومێد و لەرزین و تەشویش و "دیدار و خواڵادان" ، زیندوو و بەهێز دەمێنێتەوە. بەڵام برادەری ئاشنایی لەگەڵ ئەو دۆخانەدا نی یە. جیهانەکەی جیهانێکی ترە.

خۆشەویستی جۆش و خرۆشێکی یەك لایەنەیە. بیر لە خۆشویستراو ناکاتەوە کە کێ یە؟ "جۆش و خرۆشێکی خۆیی یە"، بۆیە هەمیشە هەڵەدەکات لە هەڵبژاردندا بەخراپی هەڵدەخلیسکێت وە یان هەموو جارێك بەیەك لایەنی دەمێنێتەوە وە جاروبار، لە نێوان دوو بێگانەی وێك نەچوو، خۆشەویستی یەك تروسکە دەدات وە چونکە لە تاریکایی دایە و یەکتر نابینن، دوای تەقینەوەی ئەو چەخماخەیە کە جاروبار، دوای تروسکەدانی خۆشەویستی، خۆشویستەر و خۆشویستراو کە تەماشای ڕووخساری یەکتر دەکەن، هەست دەکەن کە یەکتر ناناسن وە نامۆیی و نائاشنایی دوای خۆشەویستی -کە ژانێکی بچوك نی یە- زۆرە.

بەڵام برادەری لە ڕووناکایی دا ڕەگ دادەکوتێت وە لەژێر ڕۆشنایی دا سەوز دەبێت و گەشەدەکات بۆیە هەمیشە دوای ئاشنایی دروست دەبێت، وە لە ڕاستیدا، لە سەرەتادا، لە گیاندا هێڵی ئاشنایی لە ڕوخسار و دیدی یەکتردا دەخوێننەوە، وە دوای "ئاشنابوون"ە کە دەبنە "خوێی"-دوو گیان، نەك دوو کەس، کە لەوانەیە دوو کەس لەگەڵ یەکتردا لەکاتی لەڕوونەهاتنندا هەست بە خۆدەرخستن بکەن وە ئەو دۆخە ئەوەندە باش و پتەوە کە بە سادەیی لەژێر دەستی هەست و تێگەیشتندا تێپەڕدەبێت- وە دوایی تامی خزمایەتی و بۆنی خزمایەتی و گەرمای خزمایەتی لە قسەو ڕەفتار و ئاوازی وشەی یەکدیکەدا هەست دەکرێت وە لەو پێگەیەدایە کە لەناکاو، خۆبەخۆ، دوو هاوگەشت، دێنەبەرچاو کە گەیشتونەتە دەشتی پان وبەرین و بێ قەراغی میهرەبانی وە ئاسمانی ساف و بێ پەڵەی برادەری تاوڵی بەسەردا هەڵداون، وە ئاسۆی ڕوون و پاك وگیانی بە گیانی "بڕوا" لەبەرامبەریاندا دەکرێتەوەو نەسیمی نەرم و تورت -وەکو گیانی پەرستگایەکی چۆڵ کە لە میحرابی شاردراوەی ئەودا، وێنـاکردنی ڕاهیبێکـی گـەورەی هێناوەتـە زەوی و زمزمـەی پـەژاراویی پاڕانەوەکانی منارەی تەنهاو بێگانەی ئەو دێنێتە لەرزین- هەر ساتەو پەیامی سروشـێکی تـازە ئاسمانـەکانی دیکـەو سـەرزەمینەکانی دیکـەو بـۆنی گوڵـە هێمادارو گیانبەخشەکانی باخەکانی تری لەگەڵەو ، بە میهرو نازی گاڵتەجاڕو شیرین و شۆخ، هەرسات، خۆی بەسەر ڕووی ئەو دووەدا دەدات.

خۆشەویستی شێتی یەو شێتیش هیچ نی یە بێجگە لە خراپی و پەرێشانی "تێگەیشتن" و "بیرکردنەوە". بەڵام برادەری، لەوپەڕی بەرزیدا، لە سنوری ژێری تێدەپەڕێت و تێگەیشتن و بیرکردنەوەش لە زەوی دەکاتەوەو لەگەڵ خۆیدا دەیانباتە لوتکەی بەرزی ڕووناکبوونەوە.

خۆشەویستەر جوانی یە ویستراوەکان لە خۆشویتراودا دروست دەکات وە برادەری جوانی یە ویستراوەکان لە خۆشویستراودا دەبینێت و دەبینێتەوە.

خۆشەویستی فریوێکی گەورەو بەهێزەو برادەری ڕاستگۆی یەکی ڕاستی و گیانی بە گیانی، بێ کۆتاو ڕەهایە.

خۆشەویستی لەدەریادا نقوم بوونەو برادەری لە دەریادا مەلەکردنە.

خۆشەویستی ڕوناکی چاوان دەستێنێت وە برادەری ڕوناکی چاوان دەدات.

خۆشەویستی تووڕەو توندەو لەهەمان کاتدا نابەردەوام و نادڵنیایە و برادەری ناسك و نەرمە و لەهەمان کاتدا بەردەوام و لێواولێوی دڵنیایی یە.

خۆشەویستی هەمیشە لەگەڵ گوماندا تێکەڵە وە برادەری سەرتاپا بێ گومانی یەو سۆی قبوڵ نیە. تا زیاتر لە خۆشەویستی بخۆینەوە، تێرئاوتر دەبین وە لە برادەری تا زیاتر بخۆینەوە، تینوتر دەبین. خۆشەویستی تا درەنگتردادێت کۆنتردەبێت وە برادەری نوێتر.

خۆشەویستی وزەیەکە لە خۆشویستەردا، کە ئەو بەرەو خۆشویستراو ڕادەکێشێت، وە برادەری هێزێکی ڕاکێشەرە لە برادەردا کە برادەر بەرەو برادەر دەبات. خۆشەویستی خاوەنەکەی خۆشویستراوە وە برادەری تینوی توانەوەیە لە برادەردا.

خۆشویستەر دەیهەوێت خۆشویستراو نادیارو بێ ناوبێت تا لە پاوانی ئەودا بمێنێتەوە، چونکە خۆشەویستی ڕەنگدانەوەی یەکی خۆویستی و گیانی بازرگانی یان ئاژەڵانەی مرۆڤە، وە چونکە بۆخۆی ئاگای لە خراپی خۆی هەیە، وە کە لەوی تردا ئەوە دەبینێت، لێ ی بێزار دەبێت و کینە لە دڵ دەگرێت. بەڵام برادەری دەیهەوێت برادەر خۆشەویست و سەربەرز بێت وە دەیهەوێت کە هەموو دڵەکان ئەوەیان هەبێت کە ئەو لەناو خۆیدا لەبرادەرەکەیەوە هەیەتی. کە برادەری ڕەنگدانەوەیەکی گیانی خوایی و سروشت و ئەهورایی مرۆڤە، چونکە بۆخۆی پیرۆزی ئەوپەڕی خۆی دەبینێت، کە لەوی تریشدا ئەوە دەبینێت، ئەوی تریش بەبراوە دەزانێت و بە ئاشناو خزمی خۆی دەبینێت.

لە خۆشەویستیدا بەرامبەر ناحەزە و لە برادەری دایە کە "لایەنی بەرامبەر وەکو گیانی خۆیەتی" ڕژدی تایبەتمەندی خۆشەویستی یە، خۆشویستەر

خۆشویستراو وەکو پارووی خوێ سەیردەکات وە هەمیشە لە دوودڵی دایە ئەوەکو یەکێکی تر لە دەستی بفرێنێت وە ئەگەر فڕاندی، لەگەڵ هەردوکیاندا دوژمنی دەکات وە خۆشویستراویش دەبێتە ناحەز و برادەری بڕوایەو بڕواش گیانێکی ڕەهایە، بێ کۆتایەکی بێ سنورە، لە ڕەگەزی ئەو جیهانە نی یە.

خۆشەویستی ڕیسی سروشتەو سەرکەشەکان دەکاتە بەندەی خوێ تاوەکو ئەوەی ئەوان، بۆ خۆیان لە سروشت بەدەستیان هێناوە بیدەنەوە ئەو وە ئەوەی کە مەرگ لێ ی ستاندوون، بە فێڵی خۆشەویستی، لە جێگەی خوێ دانێنەوە، کە خۆشەویستی تاوانی دە مەرگە. وە برادەری خۆشەویستی یەکە کە مرۆڤ دور لەدیدی سروشت، بۆخوێ دروستی دەکات، بۆخوێ پێی دەگات، بۆخوێ "هەڵی دەبژێرێت". خۆشەویستی یەخسیری یە لە داوی هەوەسدا و برادەری ئازادبوونە لە ناچاری جۆش و خرۆش. خۆشەویستی ڕاسپاردەی کەسەو برادەری پێغەمبەری گیانە. خۆشەویستی "فەرامۆشی" یەکی مەزن و بە وزەیە تا مرۆڤ سەرقاڵی ژیان بێت وە بە ژیانی ڕۆژانە -کە سروشت ئەوەی زۆر خۆشدەوێت- سەرگەرم بێت، وە برادەری هەراسە لە نامۆبوون و خۆئاگایی ترس هێنەری مرۆڤە لەو بێگانە بازاڕی یە دزێو و بێ کەڵکە.

خۆشەویستی چێژی هەڵاتنەو برادەری پەنای هەڵاتن.

خۆشەویستی نان خواردنی برسی یەکەو برادەری "دۆزینەوەی هاوزمانێکە لەسەرزەمینی بێگانەدا".

لە شانۆیەکدا، قارەمانێك، لەبەردەم پاشایەکدا، بۆ خۆپێشاندان و دەرخستنی هێزی شیرەکەی، تولێکی ئاسنی داناو، بە یەك لێدانی شیرەکەی، ئاسنەکەی لەت کردو هەموویان سەریان سوڕما، پاشاش پارچە حەریرێکی ناسك و نەرمی -کە وەکو پەڵە هەورێکی سپی بەیانیان، ناسك و سوك بوو- هەڵداو پارچە حەریرەکە -لە کاتێکدا وەك پارچەیەکی تێکەڵی دوکەڵ لە هەوادا بە ئارامی و جوانی و ڕێکی گیانێکی بارسوك لێکدەبۆوەو بڵاودەبوو- پاشا، بە نەرمی و هێواشی و مەندی و دڵنیایی یەوە، شیرەکەی بەناودا هێنا، بەبێ ئەوەی هەست

بە کەمترین بەرهەڵستکاری بکات، پارچە حەریرەکە لەت بوو و هەر لەتەی لە هەوادا، بەرەو لایەك چوو و بەهۆی تێپەڕبوونی شیرەکە بە ناوەڕاستی پارچە حەریرەکە، کە کەمترین لۆچی تێنەکەوت وەك بڵێ ی تێپەڕبوونی شیرەکەی بەناو خۆیدا هەست پێ نەکردووە، وە شیرەکەش بە شێوەیەك تێپەڕدەبوو کە واتدەزانی بەناو پەڵە هەورێك یان پارچە دوکەڵێکی سپی جگەرەی شاعیرێکی، ڕۆچووی ئەسیری خەیاڵدا، تێدەپەڕێت.

وەیش، کە بێ توانام لە "دژو بڵاوکردنەوەو ڕێك" دروستکردن کە خۆشەویستی کام شیرەیەو برادەری کام شیرە. بم بەخشن کە ناتوانم. من حەواریی مانسیۆنم Mansion Louis کە لەبەرامبەر ئەو جۆرە شتانەدا پەرێشان دەبوو. ڕێکی، چاکی، هەرچی ڕەنگ و بۆن و تامی ناماددی ترو ناماددی ترو نازەمینی ترو بێ سودتری هەیە گاڵتەی بە گیانی ئەو دەکرد.

بریا توانیبام پێرستێك پێك بێنم لەو شتانەی کە فرمێسکیان لە چاوی ئەو دەهێناو هەموویان پێکەوە بنوسم. سەرنجڕاکێش دەبوو بۆ خوێندنەوە. بەلایەنی کەمەوە بۆ دەستلێدان و هەستکردنی زبری و نەرمی و ڕەگەز و ڕەنگ و بۆن و هەستیاری یەکان، یان دەتوانرێ بگوترێ: بە خاڵە لاوازەکانی گیانی ئەو دەزاندرێت. گیان وەکو ئەسپێك وایە. ئەڵبەت گیانی واش هەن کە وەکو کەرێکن یان ئێسترێك، یان مانگایەك، یان سەگێك، یان ڕێوی یەك، یان کەڵەشێرێك، یان مەڕێك، یان گورگێك، یان داڵێك، یان کەمتیارێك، یان زەرگەتەیەك، یان مشکێك (زۆرن)، یان پڵنگێك، یان شێرێك، یان بازێك، یان کوندەپەپۆیەك، یان پندێك، یان بەرازێك، یان ورچێك، یان پشیلەیەك، یان قورناویلکەیەك، یان سوێسکەیەك، یان پەپولەیەك، یان مێرووڵەیەك، یان فیلێك، یان وشترێك (زۆرن)، یان "نەحامەیەك"! یان قەلێك، یان "وشتر- مانگا – پڵنگێك" یان کەڵەشێرێکی شامی، یان هێلکەیەك، یان پەتاتەیەك، یان "نوقڵێك"، یان کرمێك، یان بنێشتێك!!!

یان دەریایەك، یان جەنگەڵێك، یان خانویەكی بیناسازێكی نوێ ی ڕابردووی ڕووكار جوان، وە یان پەتێكی فرێدراو، وێرانەیەكی كۆن، یان ئاگرێك ( وە دابەشكردنە ڕێكوپێكترەكانی بۆ جۆرە ئاگرە بچوك و گەورەو ڕەنگاوڕەنگەكان، وە جۆرەكانیان لەرووی بەكارهێنانی ماڵەوەو سەرچاوەكانیان: نەوت، پیو، ڕۆنی چرا، ئەلكالی یەكان، گاز، بەنزین، دارو جۆرەكانی: لە كوڵكە هەڵقەندراوەكانەوە تا چیلكەو پەلی وشك و نیوە تەڕی تووەوە تا تەختەی كورسی و ... وە ئاگری سەرچاوەگرتوو لە شتەكانی ترو ترەوەو سوتانەكانی دیكەو تروسكەكانی دیكەو بریسكەی دیكەو چەخماخەی دیكەو و و وە) وە دابەشكردنی دیكەی ئاگرەكان، نەك ئاگرە دوكەڵدارەكان، بۆندار، ئاگرە بێ دوكەڵەكان، بێ بۆن، "مارج من نار"، ئاگرە ئاوی یەكان، سور، سپی، سەو ... وە ئاگرە بێ ڕەنگەكان، ئاگرە هەست پێكراوەكان، ئاگرە نەبیندراو و هەست پێنەكراوەكان ... ئاگرە سوتێنەرەكان و ئاگرە داخەكان و ئاگرە تاریك كەرەوەكان و ئاگرە ڕووناك كەرەرەوەكان و ئاگرەكانی بێ داخی و، بێ گەرمی و، ئاگرەكانی ... وە ئەو ئاگرانەی كە ناسوتێنن. ئەو ئاگرانەی كە دەكوڵێنن، ئەو ئاگرانەی كە دروست دەكەن، ئاگرە ساردەكان، فێنك كەرەوە، باش، پاك، داگیرساو، نادیار ...

ئاگری خۆشەویستی لە خوادا!! كێ پەی بەوە بردووە؟ ئاگری خۆشەویستی لە گیانی خوادا، ئاگرێك كە تەواوی بوون ڕەنگدانەوەی ئەوە، ئاگر گەرم نی یە، داخ نی یە، بۆچی؟ نیازمەندی لەودا نی یە، شەپۆلدان لەودا نی یە، نەچەسپاویی، گومان، لەرزەلەرز، دوودڵی، لەرینەوە، وەسواس، پەشۆكاوی ... نیگەرانی، لەودا نی یە. بەڵام ئاگرە، ئاگراوی تر "لەهەر ئاگرێك. ئاگری تر لە هەموو ئاگرەكان، ئاگرێك كە پریشكی بڵێسەیەكی گێتی یە. سێبەرەكەی ئاسمانە، ڕەنگدانەوەكەشی بوونەوەرەكانن، خوڵەمێشە ناسك و كەمەكەشی كاكێشانەكانن ... ئەوە چ دەڵێم؟!!!

ئەوەیە ئاگری خۆشەویستی لە خوادا! واتا چی؟ ئاگری خۆشەویستی کە بەو شێوەیە نی یە ... بەس ئەوە ئاگری برادەری یە. ئەریّ، ئاگری برادەری یە، سەیرە!؟ منیش وەکو هەموو عارف و شاعیرەکان قسەم دەکرد! ئاگری خۆشەویستی!؟ ئەویش لە خوادا!؟ نەو ، ئاگری برادەری یە کە داخ نیە، سارد نیە، گەرمی نیە، بۆچی؟ کە زانیاری نی یە، کە مەبەستی نی یە، کە گەیشتنی نی یە، کە دۆزینەوەی نی یە، کە ونکردنی نی یە، کە بەدەستهێنانی نی یە، کە بەکارهاتن و بەکەڵك هاتنی نی یە، کە ساڕێژبوون و پەشۆکاوی نی یە، کە شەپۆل دانی نی یە، کە گومان و دڵەڕاوکێ ی نی یە، کە دوورو نزیکی نی یە، کە ترس و ئومێدی نی یە، کە مەرگ و ژیانی نی یە، کە بەهێزی و لاوازی نی یە، کە قەفەسی نی یە، کە چاوەڕوانی نی یە، کە تاوانبارکردنی نی یە، کە دەربڕین و لێکدانەوەی نی یە، کە ترس و لەرزی نی یە، کە هەڵوچون و داچونی نی یە، کە کۆت و زنجیری نی یە، کە مەرجی نی یە، کە گەڕانەوەی نی یە، کە ڕاوەستانی نی یە، کە ڕۆیشتنی نی یە، کە چلەکێشی نی یە، کە تێگەیشتنی نی یە، کە پێداویستی و بەرژەوەندی و سود و "بۆچی" و "بۆ" و بارودۆخ و جیاوازی گونجاویی و دژیەکی و کوفرو هاوبەشی پەیداکردن و گومان و سستی بڕواو هەواو هەوەس و چێژو ئازار ... ی نی یە. ئاگرە، نەك ئاگری خۆشەویستی، ئاگری برادەری ... خەریك بوو دەمووت چی؟

... ئەسپ ... ئەها! بەڵێ، وتم هەندێ لە گیانەکان وەکو ئەسپن، هەرئەسپەو خاڵێکی جوڵاندنی هەیە: جاری وایە ئەسپی واهەیە بە بەهێزترین قامچی لێدان هەر برۆیانیش تێکنانێت! ئەگەر دارێکی تیژیشی لەکەلەکەی بدەی هەستیشی پێناکات: هەست دەکات بەڵام ناجوڵێت. وەکو ئەوەی هەستی نەکردووە. بەڵام ئەو ئەسپە یەك یان چەند خاڵی جوڵاندنی هەیە: بن گوێ ی، خاڵێك یان چەند خاڵێك لەسەر ملی، پشتی، سینگی، ژێرگەردنی، کە بە بچوکترین ئاماژەی نینۆکی پەنجەی بچوك، لەناکاو دەڕەوێتەوەو وەکو باڵندەیەك کە لەناکاو بترسێت، باڵان لێکدەکاتەوەو دەفڕێت.

ئەوەنــدە بــە شــێتی خــێرا دەبێــت كــە هــەر سوارچــاكێكی شــارەزا بەردەداتــەوە سەرزەوی، بەهەر ڕێگیرێكدا تێپەڕدەبێت كە لەسەر ڕێگای سەوزبێت، بازدەدات، كێــو و دەشــت و دۆڵ و ڕووبــار و گــرد و تەپۆڵكــەو دەریــاو شــارو هەرچــی و هەركــەس و "لەهــەر شــوێنێكە، دەبــاو لێــدەداو دەشــكێنێت و بەردەداتــەوە و دەڕوات و دەڕوات تاكو ... لە پێ دەكەوێت، تا لەبەرچاوان وون بێت ... وە من هەست دەكەم گیانم گیانی ئەسپێكە، نە لە ئەسپ پەستتر وە نە لە ئەسپ باشتر، بەڵام بێ گالیسكەی ئەسپ، ڕەوڕەوە: و بێ ئەسپ سوار و بێ كرێ. ئەسپی بێ زیــن و لــەغاو. ئەســپی چــەموش و ســەركەش و لوشــكەهاوێژی خــوو خــەراپی كێوی. نەك لەغاو نەكرێت، دەكرێت، بەڵام بەسەختی، بەمەترسی یەوە، درەنگ ... ڕاستە، ماندووكەر! بەڵام ئەگەر بڕوای بێ قەراری زیندانی زەوی -كە شادی بەرزبونــەوەی هەیــەو خۆشەویــستی دیــدارێك لەوپــەڕی ئاسمانــەكان- تــوانی لــەغاوی بەســەرداكاو لەســەر پــشتی بەهــەر لایەكدا قامچی بە ئازار قسەیەكی ئاشنا بەسەر ئەودا بخوێنێت، با بەهێزەكان لە پشت خۆی وون دەكات وە پێش دەنگی هەورە تریشقەكانی ئاسمان دەكەوێتەوەو، وەكو تیر، دەشتەكانی زەوی دەبڕێت وە لەسەر دیواری ئاسۆوە دەردەپەڕێت و دەچێتە ناو سینگی بلوریی و نەرمی سپێدەو، لەیەك چاوتروكاندا، شازادەیەك لەژێردەستی كۆیلە بێگانەكان -كــە ئــاوازی هــەلاتنی لەســەر زەوی نــامۆیی زەوی و ڕاكردنــی لــە خێوەتگــای دڕندەكان و دوژمنە پیس و كین لەدڵەكانی ژێر ئەو ئاسمانەی هەیە، وە لەترسی دیلی سەوداچیان و كۆیلەفرۆشانی ئەو بازاڕە ڕەشە، بەرەو نیشتیمانی خۆی بەڕێ كەوتووە- دەگەیەنێتە جیهانێكی تر، بەپەلە فڕینی ئارەزوویەك، ئەو بۆ دەرگای خۆی -ئەوێ كە دەرو دیوارو دانیشتوانەكەی هەموو خزمی چاوەڵەڕێ ی ئەون- دەبات: دەرگایەكی بڵند لە دامێنی كوێستانێكی لەخۆبایی دایە كە نــەنگی هــیچ هــەنگاوێكی قبــوڵ نــەكردووەو، لەڕووخــساری دا، ڕوشــاویی هــیچ تێڕوانینێكی چڵكن و نەگبەت و بریندارکەری تێدانی یەو بە چوارچێوەی هیچ "تێگەیشتنێكی" تەسك و كورت و بۆگەنیو پیس نەبووە.

کۆشکێکی گەورەو چۆڵ و بێ دەنگ و پڕ لە شکۆداری، لە دامێنی کێوێکی بڵیند و دوورو خۆپەسندو پڕ لە سامان، پی یەکانی سەرچاوەی هەڵقوڵانی خۆرێکە کە لە دڵی پڕ لە ڕازی نادیارەوە سەرهەڵدەدات، وە هەوایەکەی بۆنی خۆشترین بۆنەکانی خۆشترین برادەری یەکانی خۆشترین گیانەکانە ... کوێ؟ "ئەو شوێنەی کە ئێرە نیە"، لە کوێ؟ ئەو شوێنەی کە زەوی و ئاسمانەکەیان هەموو لە گیان دروستکردووە، دایان ناوە: لە گیانی ئەو ڕاهیبە پڕ هێمایەی کە تەمەنێکی لەناو خەڵکدا بەسەربرد و کەسیش نەی ناسی و وێنەی خۆی کە لە چاوی هەزاران دوورو نزیك کە لە دەوری کۆبوبونەوەو گێژبووبوون دابوو، نە دیت و، تەنها یەك جار، لە درێژایی ئەو ڕێگا درێژەی کە بەو بیابانەدا تێپەڕدەبێت جارێك، لە دەرکۆکەکانی پەرستگای نادیاری تەماشای ناوەوەی کردو ئارامگای شەهیدێکی ناو ونی بینی کە لەناو ئەودا -لەژێر منارەیەکی زێڕیندا کە بەخەیاڵی پەرستەرێك، وەکو ئەوە وایە لە تەواوی ژیانیدا چاوی لە ئاسمان بڕیبێت- شاردبۆوە.

وێنەیەکی لە چوارچێوەگیراو لە دیواری ئارامگاکەی هەڵواسرابوو کە چاوی، بە خەم و پەژارەی پڕماناوە، لەتەختی ئارامگای شەهید بڕیوەو هەردەڵێی هێڵە نەخشێنراوەکانی سەر تەختەکە دەخوێنێتەوەو وادەردەکەوت کە وێنەی کەسێکە کە خزمێکی نزیکی شەهیدێکی ناو ونە کە لەناو دڵی گۆڕدا نوستووە وە هەردەڵێی تەنها ئەوە کە، لەو زەوی یە، لەگەڵ ئەو ژێرخاك کراوە بێ ناو و نیشانە کە کەس نەیدەناسی ئاشنایەو دەزانێت کێ یە. چارەنوسی چی یە، وە بۆچی لێرەدا شەهیدبووە؟

وە چۆن، ئەویان کوشتووە؟ وە چ کەسانێك ئەویان کوشتووە و لێرە بەخاکیان سپاردووە؟ وە بۆچی کەس یادگاری یەکی ئەو ناگێڕێتەوە؟ بۆچی لەناو ئەو کەسانەی بۆ سەردان دێن وە لێرە نەزرو نیاز دەکەن، بێجگە لە منارەی جوان و ڕازاوەی ئارامگایەکەی کە لە دوورو نزیکەوە تەماشای دەکەن و پێیدا هەڵدەڵێن و ڕێزی لێدەنێن و بەپیرۆزی دەزانن، کەس هیچ نازانێت؟ کەس هەتا ڕەنجی

خوێندنەوەی چەند دێڕێك كە لەسەر ئەو تەختە بەردە كێشراوە ناداتە خۆی؟ بۆچی ئارامگای ئەو شەهیدە هێندە ئاوەدان و ڕێكەو بەڕێوەبەری هەیەو كەل و پەلی تایبەتی و سەردانكەری زۆری هەن و كەسیش خودی ئەو شەهیدە ناناسێت و كەسیش ناپرسێت كە لەژێر ئەو منارە جوانە -كە ڕەنگدانەوەی كاشیە نەرم و گرانبەهاو گەچ هەڵكەندن و هونەرمەندی یە سەیری یەكانن چاوەكانی گێژكردووە -ئەوەی شاردوّتەوە كێ یە؟ بۆچی شەهیدیان كردووە؟ چارەنووسی، دەردو داخەكەی، ئاینەكەی، بڕوایەكەی، ڕۆژگارو ژیانی خوێنینی چ بووە؟ كەس ناپرسێت ئەو پێشەوازادە ناو وونەی كە لەژێر ئەو منارەیەدا لە خوێنـدا نوسـتووە، كـێ یـە؟ بۆچـی؟ چـۆن و بـە چـەقۆی كـام خەلیفەیـە شەهیدكراوە؟ چۆن بیری كردوّتەوە؟ هەستی بەچی كردووە؟ چی ویستووە؟

وە ڕاهیـب -كـە ئـەو بـیرە دەردناكانـە ئـەویان لـە چـەنگی خۆیانـدا گرتبـوو و دەتوایەوە- چاوی بڕیبووە چاوی پەنجەرەكانی ئارامگای ئەو شەهیدە نادیارە وە تێڕوانینەكـەی بـە پەشـۆكاوی لـە نێـوان وێنـەی هەڵواسـراوی سـەردیواری ئارامگاو گۆڕی ئەو شەهیدەدا دەهات و دەچوو و دەیپەرست و، لەو دۆخەكەدا، لە ناكاو هەستی كرد كە ڕووخساری ئەو وێنە لەچوارچێوەگیراوەی دیـواری نـاو ئارامگایەكە لەبەر چاوی ئاشنایە! زیاتر تەماشای كردو زیاتر تەماشای كردو بەسەرسوڕمانێكی ترسناك بەڵام شادی هێنەرەوە بینی كە ئەو وێنەیە ...

ئەو وێنەیە ... وێنەی خودی ئەوە!

بەڵێ، گیـانی مـن ئەسـپێكە. بـەڵام بەداخـەوە كـە لێرەدا مـنم، ئەسـپی تـاژی بـە ئامورەوە دەبەستەوەو لەگەڵ ئەسپی گالیسكەدا هاوزنجیری دەكەن و لێرەدا كە منم، "پاشماوەكان" ئازادن و "هەڵاتوەكان" كۆیلەن!

"تورە بێ جۆش و بێ هاوارەكان دەردداره بێ هاوارو بێ جۆشەكان ...

ئەوجاریش ئێمە ماینەوەو شاری بێ لەرزە وە ئەوەی كە كەمتیارەو گورگ و ڕێوی یە

جاری وایە دەڵێم هاوار بكەم دیسان دەبینم دەنگم كورتە ...!

.......................... ......................."لێ ی بگەڕێن.

**خۆشەویستی جاری وایە دەگوازرێتەوە و جاری وایە سارد دەبێتەوە وە جاری وایە دەسوتێنێت. بەڵام برادەری لە شوێنی خۆی، لە تەنیشت دۆستی خۆی، هەڵناستێت: ساردنابێتەوە چونکە داخ نی یە: ناسوتێنێت کە سوتێنەر نی یە. خۆشەویستی ڕووی لە خۆیەتی. خۆویستەو "لەسەر پێی خۆی" و ئیرەیی هەیە، وە خۆشویستراوی لەبەر خۆی دەپەرستێت و پێیداهەڵدەڵێت بەڵام برادەری ڕووی لەلای برادەرەو، برادەر-ویستەو لەسەر پێی برادەرو خۆی لەبەر برادەرەکەی دەوێت وە ئەوی لەبەر ئەو خۆش دەوێت وە خود لە گۆڕێ نی یە.**

**خۆشەویستی، ئەگەر خۆشویستەر نەبێت، نی یە. بەڵام لە برادەری دا، جگە لە برادەری و برادەر، سێ یەممان نی یە. خۆشەویستی بەخێرایی دەگۆڕێت بۆ کینەو تۆڵە وە ئەوەش لەکاتێکدایە کە خۆشویستەر خۆی لەگۆڕێ نابینێت، بەڵام لە برادەری دا بەو ئاراستەیە ڕێگا نی یە.**

**هەرکاتێك ئەوەی کە "برادەری" باش دەزانێت و باش هەستی پێدەکات، خۆی لەگۆڕێ نابینێت، بەخێرایی و بە سادەیی، بە فیداکاریی و تێکۆشانێکی سەیر و بێ خەوش و بە گەورەیی و شکۆداری و ئیبراهیمیانە دەگۆڕێت وە لەو کاتە دایە کە خۆی کە نی یە و تازە ناتوانێت هەبێت: لەو ئاوێنەیەی کە برادەر هەیەتی ئاوی پەڵەیەك دەهێنێت و دەستوردەدات -وەڕاست گەڕاوانە و گیانی بەگیانی و لە ڕووی بڕوای بڕاوە، نەك چاو و ڕاو و لاسایی و جۆراوجۆری: وە ئەوەش، هەم لەکاتی ووتنی دا وە هەم لە کزەی سوتانەکەیەوە دیارە- کە "ئەو پەڵەیە لەسەر ئاوێنەکە لابەرە! تا ئاوێنەکە چیتر وێنەی من لەخۆیدا نەبینێت، بەخۆڕایی پەڵەیەك بە ڕووخساری یەوە نەمێنێتەوە و ئاوێنەکە ساف و دڵ سازگار بێت و پەڵاوی نەبێت". بەڵام خۆشەویستی دەڵێت:"ئۆف! ئایا ئەو پەڵەیە دوای من پاك دەکەیەوە؟ ئایا پەڵەیەکی تر لەسەر ئاوێنەکە دەنیشێت؟ ئایا، لەمەولا، ڕووخساری ئاوێنەکە بێ پەڵە دەبێت؟ نا، نا، نا! دوای من،**

سەرانسەری ئەو ئاوێنەیە ڕەش بکە. ئەو پەڵەیە بە تەواوی ڕووی ئاوێنەکەدا بڵاوبکە! جیوەکانی ئاوێنەکە هەمووی بڕوشێنە تا وێنەی تێدا دەرنەکەوێت. ئاوێنەکە خۆڵاوی بکە وە خۆڵی پرسەی بەسەردابکە تا ڕووناکی خۆریشی لێنەدات، تا دوای من نەدرەوشێتەوە، بریسکە نەدات، ئاخ! دەڵێم چی؟ ئاوێنەکە بشکێنە! بشکێنە! ووردو خاشی بکە!

ڕۆڵەم، دوای من ئێخەکانت هەڵدەوە، هەمیشە پرچت ئاڵۆز بکە. هەرگیز دای مەهێنە، قەت زەردەخەنە مەهێنە سەر لێوانت. قەت لە جێگای نەرمدا مەنوو. بەردەوام بگریە. بەردەوام داخی من لە سینگتدا تازەبکەوە. لەسەر قەبرەکەم هەڵمەستە. مەچۆوە ماڵێ. ژیانت لەبەر مەرگی من بەبادا بدە. گیانی من ئەشکەنجە دەدرێ ئەگەر دەنگی پێکەنین و هەواڵی خۆشبەختی و ئازادی تۆ ببیستێت. ئاخ، من لەژێر بەردی ئەلحەد ئەشکەنجە مەدە بە شادی خۆت!

هاوسەرم! ئەمن کە لەبەر نەخۆشی خۆم مردم و لاشەی بێ دەردو بێ هەستی ئێمەیان لە ئاگردا سوتاند، نەچی تۆ منت لەبیر بچێتەوە، دوای ماوەیەك بگەڕێیەوە شار، گۆڕستان بەجێ بێڵیت و بێیەوە ماڵ، ژیان و ئارامی بەبێ من درێژە پێ بدەی، وەی کە خۆشبەختی تۆ دوای من چەندە بەدبەختی یەکی گەورەیە بۆ من! ئەتۆ، دەبێت لەوکاتەدا کە ئاگر لە لاشەی مردووی من بەردەدەن، خۆشت -هەرچەندە هێشتا لە سەرەتادای- بە بڵێسەکانی ئاگری من بسوتێنی تا دوای من، هیچ شتێك لە دوای تۆ نەمێنێتەوە جگە لە خۆڵەمێش".

بەڵام برادەری، بە هەموو سوزو بڕواو مەبەستی یەوە، دامەنی ئەو دەگرێت و بە وزەی پێداگری و دەستوردان و داوا لێ کردن، لەسەر جێگای گیان سپاردنی خۆی، داوا لە هاوسەرەکەی دەکات کە: هاوسەرم! ئەتۆ هێشتا دەتوانی بیست ساڵی دیکە هەبیت و قسە بکەی، هەست بکەی، بیربکەیەوە، ژیان بەسەربەری، برادەری بکەی، خۆشەویستی نیشان بدەی، هاوسەری، هاوڕێیەتی، هاودەمی، هاوگیانی، خزمایەتی، هوگری، سایەساردی، باغێکی بۆنخۆش ببینیەوە،

بیست بەهار، بەبێ من، وە جموجوڵ بکەوی. بیست هاوین، بێ من، لەسەفەرو دەریاو کوێستان و چیاو ڕووبار چێژ وەربگری.

بیست پایز بەوردبوونەوەی قوڵ، بە هەستکردنی ڕیشەدار، بە خوێندنەوە، بە بیرکردنەوە، بە برادەری، بە خۆشەویستی نیشان دان، بە غەم خواردن، بە چێژوەرگرتن لە بیرەوەریەکانەوە خەریك بیت.

بیست زستانی دیکە لە پشت پەنجەرەکان دانیشی و هاتنەخوارەوەی بێ دەنگ و سوکی بەفرەکان و هاتوهۆڕیای پەنجە نەرمەکانی بارانەکان و قامچی بایەکانی لەسەر ئەندامی ڕووتی درەختەکان و ناڵەی بایەکان لەژێر شێروانیەکان ببیستی، ببینی، شەوە ڕەش و درێژو پڕتاقەتەکانی زستانەکان، دەرگاکانی ژوورەکەت دابخەی و پەردەکان دادەیەوەو لەتەنیشت سۆبەی گەرم دانیشی و چاو لە گەمەی خێراو جوان و پڕ کەین وبەینی بڵێسە بێ ئارام و پڕ جموجوڵەکانی ئاگر -کە لەگەڵ دڵی تۆدا دەدوێن- ببڕی و بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك بەتەماشاکردنی ئەوانەوە دانیشی و ڕووت لە سەمای جادووی ئەوان وەرنەگێڕی و، لەو دۆخەدا، باڵندا کێویەکانی خەیاڵت بۆ دەرەوە بنێری و هەڵیان فڕێنی و بەرەو بیرەوەری خۆش ڕەنگ و بۆنخۆشی ڕابردووەکان و ئارەزووەکانت و چاوەڕوانی ئاینەدەکانت لێخوڕی تا بڕۆن و بێنەوە وە هەر ساتەو پەیامی شیرین و هەواڵی سۆزبزوێنت بەدیاری بۆ بێنن وە زەردەخەنەی نەرمی لە ڕەنگی بیرەوەری و پڕهەنگوین و پڕخۆشی لێوەکانت، لەژێر سێبەری سەماکەری ئاگر، بپشکوێنن و سینگی ئەو دوو مارە خەت و خاڵ جوانە کە لە باوەشی یەکتردا خەویان لێکەوتووە، لە خەوە خۆش و شیرنەکاندا بیانهێنیە جوڵە ...

بەڵام هیچ کات، یەکێك لەو باڵندانە بەدوای مندا، بۆ قەبرستان نەنێری کە من دەڕەنجێنن و گیانی من -کە لە قوڵایی تاریکی مەرگ بارو گران و بێ دەنگی قەبرستان، ڕوخساری تۆ لەبەر تیشکی لەرزۆکی ئاگر تەماشادەکات وە سەمای سێبەرەکان بەسەر پەرچەم و نێوچاوان و سینگ و ئەندام و جلکی تۆ بە

چێژەوە تەماشادەکات- ئەگەر ببینێت کە، لەوکاتەدا کە بەبێ دەنگی لە تەنیشت سۆبە دانیشتوی و، بە گەرمی نوێکردنەوەی بیرەوەری یەکان و پەروەردەکردنی ئارەزووەکان، گەمەی بڵێسەکان تەماشادەکەی وە جارجار، هاتنی بیرەوەری یان ئارەزوویەکی زۆر شیرین و بەچێژ قدیقدیانت دەداتێ و سەرت بەلایەکدا خواردەکەیەوەو شانت بە لایەکەی تردا وە پێکەنینی سەرسوڕهێنەرو سەخت لێوەکانت کە بەتوندی بەربەرەکانی دەکەن بەسەر تەواوی نیوەی ڕوخسارت دا پیان دەبێتەوەو نازانم ئەو بیرەوەری یە یان ئارەزووە چی یە کە، لە هەمان کاتدا، چاوەکانت لەبەر شەرمێکی ناسك بە هێواشی لەسەر یەك دادەنێ ی وە ڕووخسارت لەبەر شەرمێکی شیرین تێکدەچێت و وەك ئاگر گوڵ هەڵدەوەرێنێت و لەناکاو بەخۆڕایی لەجێ ی خۆت هەڵدەستی و دوبارە بێ وەستان دادەنیشی و دوبارە باڵندەیەك لەو باڵندانەی کە بۆ سەرزەوی یەکانی ڕابردوو یان داهاتووت ناردبوون، هەواڵێکی تازە دێنێت و چیرۆکێکی دیکە دەسازێنێت و دووبارە زەردەخەنەیەکی ناسك -وەکو پشکوتنی گوڵێك لەبەر خۆر یان ترپەی لەناکاوی سینگی جوجکە مارێك یان شەپۆلێکی نەرم لەسەر ڕووخساری لە تاوان پارێزراوی ئاو- ئارامی لێوەکانی تێکدەدات وە من کە دەبینم تۆ نقومی چیرۆکە شیرینەکانی و ئارەزووە ڕەنگینەکان دەتلاوێننەوەو بیرەوەری یە جوان و بۆنخۆشەکان قدیقدیانت دەدەنێ، وەکو چاوی باوکێکی تامەزرۆ کە ڕۆڵە خۆشەویستەکەی لەسەر کورسی هاوسەرێتی دەبینێت و نقومی چێژو خۆشبەختی یە، چاوەکانی من لە قوڵایی گلێنە دان و چاویان تێدا نی یە و پڕ لە خوڵن، لە ناخی تاریکی گۆڕدا، دەبروسکێنەوە، قاپیلکەی سەرم، لە خۆشیان، بە سەقفی ئەلحەد دەکەوێت وە دڵم کە پواوەو سینگم کە قەفەسێکی بەتاڵە ئەگەر باڵندەکەی مردبێت، بەڵام پەراسوەکانی قەفەسی ئێسکی سینگم، لە شیرینی و چالاکی ساتەکانی تۆ، لەیەکتری دەبنەوە وە ئەگەر لە بێدەنگی گران و ڕەش و ئارامی قەبرستاندا بی، دەنگی ئێسکە ڕووتەکان بەباشی دەبیستی.

بەڵێ، ئەگەر لەو دۆخەدا گیانی من ببینیت کە لەناکاو باڵندەیەکی غەمگین هاتەدەرو چیرۆکێکی دەست پێکرد کە تۆ بڕۆیەکانت وەکو کاتێك کە، لەبەرامبەر ڕوداوێکی لەناکاو و سەرسوڕهێنەر ڕادەوەستێت بەرزکردەوەو چاوەکانتی کە لە ئاگر بڕیون گێژکرد و بریسکەی خەمێکی پەژاراوی لەواندا دەبینرێتەوە، وە دڵۆپەی داخی تواوەی سەمای ئاگری لە دیدی تۆدا تاریك و لەرزۆك کرد و جێ پێ ی خەمێکی قوڵ ناوچاوانتی داگرت و لێوەکانتی ژاکاند و بە سیسی لەسەر شانەکانت نیشتەوەو دوو دەستەکانی کەوتنە سەر ئەژنۆیەکانت وە من سێبەری گرانی خەمێکی تڵخم لەسەر ڕووخسارت دیت و زانیم کە ئەو باڵندەیە چیرۆکێکی من دەگێڕێتەوە وە بەسەر پەژارەگای تەنهای من دا تێپەڕیوە، ئەو گۆڕستانە فراوانەی کە -وەك جیهان، لە تەنیشت هەزاران دراوسێ و هاونیشتیمان، بە تەنهایی و بێ دەنگی و بێگانەیی و بێ ناسیاو، شەو و ڕۆژەکان بەسەردەبەم کە لێرە بەدواوە هەردوکیان بۆ من یەك ڕەنگن- زۆر پەرێشان دەبم وە ئێش و ئازار پەنجە بۆ ئەندامە ئێسکی یەکانم ڕادەکێشێت و تۆ نازانی کە، لەو بارەدا، کەسێك کە گەرووی بۆ هاوارکردن نی یە، دڵی بۆ یاخی بوون نی یە، زمانی بۆ ووتن نی یەو پێ ی بۆ ڕۆیشتن نی یە، پەنجەی بۆ نوسین نی یە، بی توانا بێ توانا بێ توانایەو، بە تەواوی، گۆڕاوە بۆ قوڵاخێك لە بێ توانایی، بۆتە کۆمەڵە ئێسکێك لە بێ توانایی: سینگی، ئەندامەکانی، سەری، قەفەسێکە کە لەودا جگە لە بای کێوی ترسناك نی یە وە با لەویشدا نامێنێتەوە وە جگە لە خۆڵ و باو ئێسك، هیچی تر نی یە ... تۆ نازانی، تۆ نازانی ئەی سەرچاوەی لێواو لێو و جۆشدەری ژیان، ئەی سەرتاپا گیانی پڕ لە ژیان و گەنجی و سۆزو چالاکی!

ئەی ئەوەی کە دەتهەویست ئێمە لەو جیهانە، لە جیهانی جوڵەو هاوارو ووتن و گوێگرتن و توڕەبوون و ڕۆیشتن و میهرەبانی نیشاندان و بێ ئۆقرەیی و چاوەڕوانی و سەرپێچی کردن و بێ تاوی و پێکەنین و گریان و ئارەزوو و بیرەوەری و دم کوتان و پیاسەکردن و دووری و هەڵاتن و نزیکی و خۆلادان و

هەڵچون و داچون و ترس و ئومێد ... – کە ئێستا هەموویان لە تەنیشتم، لەناو کفنم دا، لەگەڵ مندا نێژراون– ژیان ببەخشی و زیندووبوون فێربی وە بەهەشتێك کە دایکی ئێمە لە ئاسمان وازی لێ هێناو ئێمەی خستە ئەو تاراوگە ناشیرین و بێگانەیە، بهێنیە سەر زەوی: بەڵێ تۆ ئەی لێواولێو لە بوون و هەست کردن و لەرزین وە ئەی پڕ لە ژیان، ئەی لێواولێو لە بوون! ئەتۆ نازانی، کە بۆچی ئەو برادەرەی تۆ -کە ئێستا جگە لە قەفەسێکی ئێسکی کە پڕ لە هەوایەو هیچی تر نی یەو لەسەر سینگی پوچ و بەتاڵی سەنگی سەنگین و بێ بەزەیی ئەلحەدیان داناوە ... ئازارکێشان چەندە سەختە!

بۆ کەسێك کە ناتوانێت ناڵەناڵ بکات، چونکە گەرووی هاواری نی یە، دڵی سەرپێچی کەری نی یە -دەڵێم چی؟– هەتا ناتوانێت بلەرزێت، ڕوو گرژبکات، ناتوانێت لەو چوڵی یە مەرگبارەی تەنهایی، هەتا لەسەر چۆکانیش دانیشێت، ناتوانێت بەرگەبگرێت، ناتوانێت ... بگریەت ... نازانی بۆ پەیکەرێك ئازارچەشتن چەندە گرانە! تا کوێ گرانە!

نازانی گریان، بۆ کەسێك کە گلێنەی چاوەکانی جگە لە دوو قوڵتی قوڵ و گەورەی پڕ خۆڵ هیچی تر نی یە، چەندە ئازاراویی یە! دەڵێم چی؟ ئازار؟ ژان؟ گران؟ ئەو وشانە بۆ زیندوانن، لەو جیهانە پڕ توانایە، پڕ لە بوون و پڕ لە ژیان بەسەربردن. لێرە هیچ وشەیەك لەگەڵ قسەدا کۆك نی یە، هیچ وشەیەك، هیچ زمانێك کارێکی لەدەست نایەت. بڵێم چی؟

بێجگە لەوەندە چیتر من مەڕەنجێنە، لێرەدا مەڕەنجێنە، لێرەدا من هەمیشە نیگەرانی تۆمە، جگە لەوە بیر لە هیچی تر ناکەمەوە خوانەخواستە لە بەرامبەر ئاگردا، ئەو کاتەی کە تەنها چاوت لە بڵێسە پڕ چالاکی و گەمەچی یەکانی ئاگر بڕیوە و باڵندەکانی خەیاڵت بە دەوری سەرتدا دەفڕن وە یەك لەدوای یەك چیرۆکێکیان بۆ سازکردووی، لەناکاو، لێوە تێرەکانت و چاوە بریسکەدار و ڕووخساری پاراو و گەنج و لێواولێو لە ژیانت بە چیرۆکێکی ناخۆش ژاکاوبێن.

من، لێرەوە، نابێت جگە لە قدیقدی بەردەوامی بیرەوەری یە شیرنەکان و

**ئارەزووە دوودڵی هێنەرەکانی تێکەڵ لەگەڵ شەرم و خۆشی و لاواندنەوە، لە تۆدا بارودۆخێکی تر ببینم. من لێرەدا، لەو تەنهایی یە هەتاهەتایی و بێ دەنگەمدا، واز لێ بێنە! ئەتۆ بیست ساڵی دیکە بەبێ من، دەبێت دەست لە ملی ساتە پڕ لە بوون و ژیان بەسەربردنەکان بکەی: ببی و ژیان بەسەربەری، ببی و ژیان بەسەربەری ... ببیت و ژیان بەسەربەری ...**

**ئەرێ، ببیت و ژیان بەسەر بەریت ... چونکە برادەری لە خۆشەویستی بەرزترە وە من، هیچ کات، خۆم تا ئاستی بڵندترین لوتکەی خۆشەویستی یە بەرزەکان، ناهێنمەخوار.**

## ♣ خۆشویستنی ڕۆڵە

ئەو جیهانە زیندانەو ئێمە زیندانی
زیندان بشکێنەو خۆت ئازاد بکـــە
"مەولانا"

هەتا، پێش ئەوەی ئاشنایی قوڵ و خوێندنی جدی و ڕێکوپێکی بیرەکانی هیند من لە گیانی باڵندەکان و لە جیهانی ئەوان ئەوەندە نیزیك بکەنەوە، مریشکەکانم خۆشدەویستن وە کۆتربازی یەکێك لە بەجۆشترین یاریی یەکان بوو کە خەونەکانی سەردەمی منداڵی منی سەرگەرمی خۆی کردبوو بەڵام باوکم و تێڕوانینە پڕ چاوەڕوانی یەکانی دراوسێ یەکانمان هەتا خەمی ئەو یاریە جوانەشی خستە ناو دڵمەوە .

هەمیشە ئارەزووی ناکامی تەماشاکردنی فڕینی کۆترەکان -کە ئەمن بەهۆی تەماشاکردنەوە، لەگەڵ ئەوان دەمتوانی تاوەکو ئەوپەڕی ئاسمان بڕۆم- ئازاری دەدام، ئەمن کە دەمتوانی تەنیا مریشکی خۆماڵی ڕابگرم، ئای! کە چەندە ناشیرنن ئەو مریشك و کەڵەشێرە قەڵەو و تەمبەڵ و پەستانە کە جگە لە خواردن هیچی تر نازانن وە شاباڵ و پەڕەکانیان نەك بۆ فڕینە بەڵکو بۆ پاراستن و گەرمی و داپۆشینە. وە بەرهەمی بوونیان و جوانی ڕاگرتنیان، تەنیا لەسەر مێزەی بەیانیان یان لەسەر خوانی میوانان دا دەردەکەوێت. ئەو مریشکانەی کە

تەنیا زگیان تێردەکەن نەك دڵ: چیکڵدانەیان پڕ دەکەن نەك چاویان: ڕەنگی تێڕوانینی ورگ دەگرن، نەك تێڕوانینی پرهێزکارانەی شاعیر. . . لێ ی بگەڕێین.

لە منداڵی و سەرەتای گەنجی دا لەبەرئەوەی بنەماڵەکەمان ڕیشەی لادێیی هەیە هێشتاش پەیوەندیمان لەگەڵ لادێ دا بەهێز بوو وە بەزۆری هاوینەکان دەڕۆیشتمە لادێ، یەکێك لە سەرگەرمی یەکانی من تەماشاکردنی مریشکە کورك و کەوتنیان و جوجکە هەڵهێنان و تەماشاکردنی مریشکی جوجکە لەبەربوو کە نقومی خۆشی گەورەکردن و هێنانەباری جوجکەکانی خۆی بوو وە پڕ بوو لە میهری دایکایەتی و میهری ماموٚستایەتی و میهری ڕێبەرایەتی و میهرەکانی تر کە ناویان نی یە.

ئەمن، بە خۆتێهەڵقورتاندنێکی خۆشەوە سەیرم دەکرد، کە چوٚن مریشکێکی بە چاپوك و شاد و پڕ جوٚش و خروٚش لەناکاو بەهوٚی بێهوٚشکەرێکی هێمادارەوە گێژ دەبێت، گران دەبێت، دەڕاکێت، ئاوازی دەنگی دەگوٚڕێت، دەنگی ساف و شادو ئاگادارکەرەوەی دەگیرێت و توڕەو دەردمەند دەبێت: وەك بڵێ ی دەناڵێت، دەچێتە گوٚشەیەك و بەبێ دەنگی هەڵدەنیشێت. نازانم بیر لەچی دەکاتەوە، یان نا، تەنیا گێژو مەستە و خەیاڵیشی فەلەج بووە؟ هەرچوٚنێك بێت، ڕوخساری کەسێك دەگرێت کە لەبەر دەردێکی گیانسپاردن و هێمادار ڕەنج دەکێشێت وە بیری گوماناوی و خەیاڵی تاڵخ و شیرین بەتوندی هێرشی دەکەنە سەر.

خەڵکی لادێ، مریشك دەناسن: واهەست دەکەن کە خوٚشەویستی ڕوٚڵە ئەوی بەو شێوەیە گوٚڕیوە. خوٚشەویستی ڕوٚڵە! بوٚچی "منداڵ"یان خوٚشدەوێت؟ منداڵ درێژەپێدانی بوونی مروٚڤە. لە ئاوێنەی ڕووخساری ئەودایە کە "خوٚبوون"ی خوٚمان دەبینین.

ڕوٚڵە بە دەربڕینی موریس دووبارە لەبارەی ڤوٚلتێریشەوە "منێکی ترمە". نامەوێت وەکو فروٚید ئەو بە ڕووکاری ئارەزووی ڕەگەزی یان وەکو بەکت و ڕاسڵ بە ڕەنگدانەوەی لە خوٚویستی مروٚڤ بزانم. بەڵکو بە هەمان دیدگای

تایبەتی کە هەموو شتێکی، لە ژیانی واتایی مرۆڤدا پێ دەبینم، تەماشای دەکەم، ئەو بە ڕەنگدانەوەی هەمان هەستی تەنیایی و هەراسی بێگانەیی لە گیانی مرۆڤدا دەبینم. ڕۆڵەی من واتا منێکی تری من، واتا منی دووەمم، واتا من تەنیا نیم: من جارێکی تر لاشەم هەیە. لە ڕووخساری ئەودا، تێڕوانین و ئاکارو قسەو بێ دەنگی و . . . بوونی ئەودا، خۆم دەبینم کە لە بەرامبەرمدا ڕەنگی داوەتەوە. چ کەسێك زیاتر لە ڕۆڵە خودی مرۆڤە؟ لەودا هەموو کەس "خود"ێك دەبینێت کە "دوو کەس"ە: وە ئەوە دیدارێکی بە خرۆش و هەستێکی سەیرە!

بەو شێوەیە کە خۆشەویستی یەکەی مریشك نەخۆش دەکات وە ژیان بۆی دژوار دەبێت، سەراوبن دەبێت. ناچار شوێنێکی بۆ دروست دەکەن و هێلکە مریشکی ساغ دێنن و مریشکەکەی لەسەر دەکەوێنن.

مریشك بیست ڕۆژی تەواو دەکەوێت: بە گەرمای گیانی گەرما بە هێلکە مریشکەکان دەبەخشێت، ئەوان هەر ماوەیەو جارێك بە باڵەکانی خۆی، هێلکەکان بە نەرمی و میهرەبانی یەکی سەرسام کەرەوە، هەڵدەسوڕێنێت، لەم دیو بۆ ئەو دیو، لەو دیو بۆ ئەم دیو... تا هەموو لایەکانی هێلکە مریشکەکە، هەموو دیوە جۆراوجۆرەکانی هێلکە مریشکەکە، بە گەرمای میهرەبان و پیرۆزو ڕاستەقینەی سینگ و کەلەکەکانی گەرم بن. ئەو مریشکە دەزانێت کە نابێت تەنیا یەك ڕووی هێلکە مریشکەکە لەژێر باڵە لاوێنەرەوەکانی خۆیدا بگرێت. ئەو مریشکە دەزانێت کە نابێت تەنیا یەك ڕووی هێلکە مریشکەکە بە سینگ و کەلەکەو پەڕو پێستی خۆی گەرم بکات، ئەو مریشکە دەزانێت کە هەموو لایەکانی هێلکە مریشکەکە نیازمەندی ئەو گەرماو لاواندنەوەیەن، ئەگەر ئاوا نەکات، ئەگەر بڵێت من کارم بەو لایەی هێلکەکەوە نی یە کە لەسەر زەوی یە، ڕەنجەکانی مریشکەکە بە فیڕۆ دەڕوات: ساردی تیژی هەواو تووڕەیی خاك و شێ ی زەوی هێلکە مریشکەکە —هەر ئەو هێلکە مریشکەی کە لایەکەی دیکەی لە باوەشی نەرم و میهرەبان و گەرمی مریشکەکەدا شاردراوەتەوە وە مەستی

گرتووی لاواندنەوە پاك و پیرۆزەكان دەنوشێت– هەڵدەوەشێنێت، لە كۆتایی دا، هێلكە مریشكەكە خەرا دەبێت، زەردێنەو سپیەنەكەی تێكەڵی یەكتر دەبێت وە بە شێوەی پارچە خوێنێكی بەستراوی لێدێت. چەندە دیمەنێكی دڵ ناخۆشكەر و رەنج هێنەرە! دڵی هەموو بینەرێك دەگەچڵێنێت، جەرگی دەگەزێت، دڵی بۆ چارەنوسی ئەو مریشكە ساغە كە، بە هیوای زیندووبوون وە لە قاوغی تەنگو رەقی هاتنەدەرو ئازادبوون، پەنای هێناوە بۆ ژێر باڵی پر لاواندنەوەو لێبڕاوی ئەو مریشكەو دەسوتێت. ئەو ئێستا لەجیاتی ئەوەی ببێتە جوجكەیەكی زیندوو و شادو جوان و خۆش ئاواز –كە بینینی چاوی هەموو بینەرێك بلاوێنێتەوە– دەبێتە پارچە خوێنێك، خوێن! خوێنێكی بەستراو كە "دەیهەویست ببێتە جوجكە وە نەبۆتی"! بریا هەر لە سەرەتاوە، ئەو ئەسیرەی زیندانی سپی، نەدەچوو ژێر هیچ باڵ و پەرێك: گەرمای سینگی مریشك نەگەیشتبا یەك لای: بریا هیوای سەردەرهێنان و زیندوو بوون و پشكوتن و هاتنەدەر لە دڵی ئەودا نەدەپشكوت.

بەڵام ئەو مریشكە دەزانێت كە چۆن ئەو بێگانەیە كە بە گەرمای لەشی لەودا گیان دروست دەكات، لەژێر باڵی خۆی بگرێت، گیانی خۆی لەودا جێ بكاتەوە: پێویستە چۆن بە گەرمی گیان و دڵی تاداری هێلكە مریشكەكە لە هەموو روویەكەوە گەرم بكات، بە گەرمی بیهێڵێتەوە، تا بیست ساڵ، ببورن، تا بیست رۆژ.

مریشك وانەیەكی تریش دەزانێت: دەزانێت كە لەو بیست ساڵەدا، نا ببورن، لەو بیست رۆژەدا، نابێت بە بەردەوامی هێلكە مریشكەكان لەژێر باڵی خۆی دانێت، هەر چەند ماوەیەك جارێك، لێ ی دوور دەكەوێتەوە، دەڕوات دەسوڕێتەوەو ئاو و دانی دەخوات و هەوایەكی هەڵدەمژێ و دەگەڕێتەوە وە بە وردی و ئاگاداری یەكی میهرەبان و بە وریایی و بە شارەزایی یەوە، هێلكە مریشكەكە –كە هێشتاش گەرمایەكەی لەناو خۆیدا هێشتۆتەوەو لە چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەودایە– لەژێر باڵ و پەڕی خۆی دەگرێت، تا لە چاوی چاوەكان و چاوی هەواو

زەوی و مارەکـان و بازەکـان و دالـەکان و پـشیلەکان و کرێکارەکـان و مرۆڤـە ورگنەکان و هێلکە فرۆشەکان وە ئەوانەی کە، بۆ بەهێزکردنی مەزاجی خۆیان، هێلکە مریشکیان خۆشدەوێت و، بۆ دروستکردنی کێك، بە دوایان دەکەون و دەیان هێنن و، بۆ هەڵلوشین، دەیشکێنن وە هەتا ئەوانەش کە زیندانی ڕەقی هێلکە مریشکەکە دەشکێنن، بۆ ئەوە نی یە کە ئازادی بکەن، بۆ ئەوەیە کە خویێ ی پـیێ بکەن وە بیکەنـە نـانی بەیانیان یـان شیرو قاوەی پـیێ دروست بکەن و بیخۆنـەوە کـەمێك چێژیان بگۆڕێت و خۆشحالێ بن، وە لـە هـەمووش خـراپتر، ئەوانەی کە هێلکە مریشك، زیاتر لە گەرمای دڵنیاو میهرەبان و پاك و پەتی سینگ و بالێ و پەڕی مریشك، گەرم دەکەن بەڵام، نەك بە گەرمای گیان و لاشەی خۆیان، بە گەرمای نەوت و غازو ڕەژوو، نەك لەژێر پەڕدا، لەسەر تاوە و تەباغ، نەك لە ئامێزی بیێ هەڵەو قوڵترین و نەرمترین لاواندنەوەی گەرمی باڵەکان، بەڵکو لە چێشتخانە، نـەك بۆئـەوەی هێلکـە مریشکەکە ببێتـە جوجکـە، قەفەسـەکەی بـشکێنێت و بێتـە دەرو ببێتـە باڵنـدەی ئـازادو فـڕۆك، بـەڵکو بۆئـەوەی ببێتـە خۆراك، پارووێکی بەتام و ئیشتیای تێربکات وە ورگ پڕبکات. ئەوانەی هێلکە مریشکیان دەستدەکەوێت دەست بەجیێ دەیشکێنن تا بیخۆن:

ئـارام نـاگرن: لەبـەر خـاتری باشـی و نـازەنینی ئـەو، ئەوسـار ناکەنـە سـەر چاوچنۆکی پیسی خۆیـان: دڕندەیی پیسی خۆیـان بۆ زگ هەڵگوشین و چێژی هێلکە مریشك خواردن ناکە قوربانی جوجکەیەك کە دەتوانیێ لەو قاوغە سپی و ڕەق و خڕو گچکەو بیێ دەنگ –کە لەناوەوەدا سپێنەو زەردێنەیەکە، لێواولێو و پڕ لە پاکێتی و خاوێنی، لە حەسرەتی لەدایکبونێکی سەیردایە– بێتەدەر پەڕو باڵ بگرێت و لەناو منداڵدانی خنکێنەرەوە ڕەهاببێتە ناو فریشتەکان. ئەو بە گەرمای ڕێکخراو و بەردەوام و میهرەبان و بیێ پچڕانی خۆی، بۆئەوەی هێلکە مریشکەکە، بۆخۆی، بێتە ژیان، ئازاد بێت، ببێتە باڵندەو بفڕێت و بۆئەوەی "بۆخۆی" ببێت، گەرمی ناکەن، هەڵی ناگرن، لیێ ی دەنێن، بە ئاو یان هەتا بە ڕۆن، وە زۆریـش کـە ئـەو چـاکەیە دەکـەن و سـوپاس و پێـزانین دەردەبـڕن وە

دەیانهەوێت وانیشان بدەن کە هێلکەناسن، بەڕوونی زەردی کرماشانی لێ ی دەنێن!

بێ ئاگا لەوەی کە ئەوەش لەبەر خاتری هێلکە مریشکەکە نی یە: بۆ چێژی خۆیانە، وە بۆ ئارامکردنی چێژو چاوچنۆکی و برسیەتیی خۆیەتی. وە دوایە، ئەو هەڵدەلوشن، دەیجون و پاشان هەرسی دەکەن وە دەربڕینی هەستەکانیشیان لە کۆتاییدا بریتی یە لە چەند قرپێك، وە شیعرەکەشیان بریتی یە لە "وەی وەی! چەندە هێلکە مریشکێکی باش بوو!؟" وە دواتر، هەست بە ڕازی بوون و پشوو و تێری و فەرامۆشی و خۆهەڵهاویشتن دەکەن، وە پاشان چونە سەر کارو کاری ژیان جێ بەجێ کردن و گرفتاریەکانی فەرمانگەو تاوەکو . . . کاتی خواردنێکی دیکەو برسی یەتی یەکی دیکە . . .

بەڵام مریشك بە شێوەیەکی تر دەڕوانێتە هێلکە، هێلکە خزمی مریشکە: مریشك بۆخۆشی لە هێلکە دروست بووە: هێلکە بۆخۆشی لە مریشکە. مرۆڤەکان و ڕۆشن-ورگەکان هێلکە مریشك بە پارویێکی خۆش دەزانن، بۆ خواردن، بەڵام مریشك ئەو بە باڵندەیەك دەزانێت کە لە قەفەسی ڕەقی دا زیندانە، تا ئێستاش فراژوویە، تا ئێستاش لە خەودایە، تا ئێستاش باڵ و پەڕی لێ نەڕواوە. باڵندەیەکە کە دەبێت "ببێت": باڵندەیەکی بێ دەنگەو چاوەڕوانی باڵندەیەکە کە عیشقێکی هێمادارو بێ خەوش بکەوێتە ناو گیانی وە ئەو لەژێر باڵە میهرەبان و پاکەکانی بگرێت و بە گەرمای سینگی، هاوکاری ئەو بکات بۆ کرانەوەو سەرهێنانەدەرو هاتنە ژیان و پەڕ لێ ڕوان، وە گەرمای پێ ببەخشێت: بە میهرەبانی، بە شانازی یەوە، بە ئارامی، بە فیداکاری، ئەو تا "ساتی فڕین" لە دامێنی خۆیدا بهێڵێتەوە وە پاشان، کاتێك ئەو ساتە هات، ئەو ڕەها بکات وە بۆخۆی -وەکو باوك یان دایکێکی پیر کە ڕەنجی پەروەردەکردنی منداڵەکەی تەنیا بە تەماشاکردنی قەدو باڵای گەورە بوو و گەنجی ئەو لەناو دەبات- فڕینە جوان و پڕ شکۆیەکانی ئەو باڵندە تازەفڕە ڕاهێنراوەی خۆی تەماشا بکات وە

خۆشەویستی پاکی خۆی بۆ ئەو، بە بێ بەزەیی یەکی توندەوە، بەو، بە خۆی، نا هەر "بە هیچ کەس، نیشان بدات.
مریشك بۆ کرانەوەی هێلکە مریشك –ئەو باڵندەیەی کە لە قەفەسی سینگی خۆیدا لە خنکاندایە– بیست ساڵ، نا، ببورن، بیست ڕۆژ، شەو و ڕۆژ ئەو دەخاتە ژێر باڵی خۆیەوە وە، بە هەموو گیانی خۆیەوە، گەرما بەو دەبەخشێت و بێ دەنگ و تەنیا، بەڵام لێواولێو لە ئومێد، هەڵنیشتووە و جگە لەو و ئایندەی نیزیك و چارەنوسی پڕ گیانی خۆشەویستی خۆی بیر لە هیچی تر ناکاتەوە وە هەموو بوونی ئەو، وە هەموو ژیانی و هەموو خەیاڵەکانی و هەتا گەرمای لەشی و ئێسکەکانی سینگیشی وە هەتا پەڕو باڵیشی، هەموویان بەوەوە سەرقاڵن: هەموو دەبنە ئەو. جیهان لەبەر چاوی ئەودا هێلکە مریشکێکی بچوکە کە لەژێر پەڕە نەرم و گیاناوی یەکانی سینگی، پەڕە میهرەبان و پارێزراوەکانی باوەشی وە شاباڵە پارێزەرو چاودێرەکانی باڵەکانی، هەستی دەکات.
بەو شێوەیە، بیست ساڵ، چ ئا! بیست ڕۆژ، تێ دەپەڕێت، وە ڕۆژی بیستەم . . . ئەری ڕۆژی بیستەم . . .
ناتوانم! قسەکردن لەبارەی ئەو ڕۆژەوە سادە نی یە.
پاشان، هێلکە مریشکەکە دەجولێت، ها . . . ژیانی هاتۆتە بەر! "بۆخۆی" دەجولێت: هەتا دەنگێکی لاوازو بێ هەڵەش لەناو هێلکەکەوە بەرزدەبێتەوە: پاشان هێلکە مریشکەکە دەتروکێت. چۆن؟ جوجکەکە، بۆخۆی، هەست بە "تەنگەتاوی" دەکات: هەست دەکات کە دەرەوە، دنیایەکی گەورەیە! هەست بە جۆرێك لە "ئەودیوی سروشت" دەکات: خەریکە دێتە ناو "جیهانەکەی تری". بەپێ ی ئەو بەڵگانەی کە دڵ هەیەتی، بەو "ئامـاژە" هێمادارانەی کە تەنیا "ڕووناکبونەوە" تێ ی دەگات، "نادیار" دەکاتە ویژدان. هەست دەکات کە لە قەفەسێکی تەنگدا گرفتارە. هەست دەکات کە دەبێت بیشکێنێت: دندوکی لێ دەدات، هێلکە مریشکەکە کون دەبێت: پەنجەرە! پەنجەرەیەك بۆ ئەو دنیایە. تیشکێك کە جیهان بێ تاقەت دەکات دەچێتە ناوەوە. سەرسوڕمان و

پەشۆکاویی و . . . چاوەڕوانی، تاڵخی و بێزاری لەوەی کە هەیە. کینە بەرامبەر ژیان، بەرامبەر دنیا، بەرامبەر خود . . . کۆتایی ئارامیی. گیان لە بەرامبەر پەنجەرەدا، هەرگیز ئارام ناگرێت.

سروەیەك هات کە "پەنجەرەکەی" کردەوە، گرفتاری تەنگەتاوی، بە گەرمی یەکی بڵێسەدارەوە، بە خۆشی یەکی شێتانەوە، خۆی دەگەیەنێتە "دەرێ". پەنجەرەی دنیای ئارامی ئەو بە تەنگی یەکی ڕەش و خنکێنەر نیشان دەدات. بە یەکەمین کەلێن کە لە "دواڕۆژەوە" بۆناو ئەو "دنیا"یە دەکرێتەوە، نامۆیی، تەنیایی، چۆڵی، تاریکی و خنکان ژوورەکە پڕ دەکات. پەستان دەخاتە سەر دیوارە بەردینەکانی خۆی وە دەشکێت. لەناکاو بەیەك "تەکان"، گەماڕۆی درزدراو و ڕزیوی خۆی دەکاتە دوو نیوە وە دێتە دەر، ڕزگاربوون! کوژکردن! موکشا!

لەو ساتە مەزنانەدا، مریشك بێ ئۆقرەیە، لە خۆشی و هەراسدا نازانێت چ بکات. بەڵام خۆی نادۆڕێنێت: ئاگادارە، ئەگەر جوجکە -لەو ساتەدا کە هەموو شتێك کۆتایی دێت وە هەموو شتێك دەست پێدەکات- سەرسام بوو، ئەگەر دیواری بەردی، بەرگری کرد، بە دندوك لێدانەکانی جوجکەکە نەشکا، جوجکەکە ماندوو بوو، بێ ئومێد بوو، لاواز بوو، ئەو دێت بۆ یارمەتی دانی. دەزانێت ئەگەر نەیەت جوجکەکەی دەخنکێت، دێت وە لە دەرەوەڕا، بە شارەزایی، بەمیهرەبانی و وردی یەکی سەیرەوە، بە شێوەیەك دندوکی لێ دەدات کە قاوغەکە بشکێت بەڵام زیان بە جوجکەکە نەگات، ئەو دەزانێت چ بکات، ئەو دەزانێت کە دەبێت هەرکارێك لە کوێوە ئەنجام بدات، ئەو دەزانێت هەر کاتێك بۆ چ کارێك گونجاوە؟ ئەو دەزانێت، هەموو شتێك دەزانێت . . .

وە پاشان مریشکەکە هەڵدەستێت، جوجکەکە بە دوایدا . . . چ هەست و هەواو لەخۆبایی بوون و ئاسودەیی یەکی هەیە ئەو مریشکە! دەڵێ ی ناپلیۆنە کە لە ئیستەرلیتز دەگەڕێتەوە! چ خۆشی و دەنگە دەنگ و ئازادی و دڵخۆشیەکی هەیە ئەو جوجکەیە! دەڵێ ی . . . ؟ دەڵێ ی . . . دەڵێ ی هێلکە مریشکە کە،

دوای تەمەنێك لە خنكان لە قاوغی ڕەقی دا، زیندووبۆتەوەو سەری هەڵهێناوەو هاتۆتەدەر!

بەو شێوەیە، چەند مانگێك تێ دەپەڕێت، چیتر ناڵێم چۆن تێ دەپەڕێت، مریشك چ دەكات؟ جوجكە چ دەكات؟ دەبێتە چی؟ چی ڕوودەدات؟ چ هەواڵێكە؟ باسی ناكەم: زۆر دوورو درێژە: زۆر بزوێنەرە: باسكردن و شیكردنەوەی زۆر گرانە، هێزو ئارامی وەسفكردنی ئەوەم نی یە. بۆ باسكردنی شانۆیەك، دەبێت ببیە بینەر، ببیە پەیامنێر، بێ لایەن بی، چاوی وشكت هەبن. كەسێك كە لە شانۆدا بۆخۆی دژوارترین دەوری هەیە، یان كەسێك كە وەكو من لەبەرامبەر ئەو دیمەنەدا ڕاوەستاوەو تەماشادەكات و دەتوێتەوەو و ئاگر دەگرێت. چۆن دەكرێت چاوەڕوانی ئەوەی لێ بكرێت كە بێت و دانیشێت بۆ ئێمە ئەو شانۆیە باس بكات؟ لە ڕاستی دا" وێنەی بكێشێت؟ ڕەخنە لە شانۆیەكە بگرێت؟

چەندە مرۆڤی ئاسودەن ئەوانەی كە ڕەخنەی شانۆ یان فلیم دەنوسن! لەوانەشە لەبەرئەوە بێت كە شانۆیەكان ئەوەندە وشك و بێ ناوەرۆك و دروستكراون وە جێبەجێكردنیان سنورداره كە دەتواندرێت باس بكرێت، وە ڕەخنەیان لێ بگیردرێت. بۆچی ناكرێت لاسایی گریانی دایكێك بكرێتەوە كە لەناكاو تاكە ڕۆڵەی خۆشەویستی دوای وون بوون دەدۆزێتەوە، یان لەناكاو لەدەستی دەدات؟ ناتواندرێت باسبكرێت؟ بەڵام گریانەكانی ماریاشل هەموو كەسێك دەتوانێت . . . ؟

لەدواییدا، "ئەو ساتە" . . . دادێت. چەندە تراژیدیایەكی پڕشكۆیە!

ئەمن هەمیشە بە وردی و چێژێكی سەیرەوە ئەو داستانەم لە سەرەتاوە تەماشا دەكرد وە خۆشترین بارودۆخی مریشك و هێلكە مریشك و جوجكەو دوایی و دوایی و دوایی . . . تەماشای هەمویانم دەكرد وە هەموویانم لەوپەڕی چاكێتی و باشی و پاكێتی و میهرەبانی یەكی سەیردا وە جوانی یەكی مەستكەردا دەبینی، كە دەگەیشتمە ئێرە هەموو جوانی یەكان و باشی یەكان وە هەموو ئەو چێژانەی كە وەرم گرتبوون خەرادەبوون، لەناودەچوون.

چەندە گران و ئازاردەربوو تەماشاکردنی ئەو دیمەنە! دڵڕەقی و دڕندەیی و توندوتیژی مریشکەکەی توشی سەرسامی یەکی ڕەنجهێنەر دەکرد. نەمدەزانی کە چۆن هەست بکەم لە بەرامبەر ئەو ڕوداوەدا: نەمدەزانی دەبێت چ بارودۆخێکم هەبێت: ئەو مریشکە چەند مانگێکە بۆ من ڕەنگدانەوەی جیهانێك بووە کە ئاسمانەکەی لێبوردن و فیداکاری یە، بۆشایی یەکەی بێ هەڵەیی و پاکی یە وە هەوایەکەی برادەرایەتی جوان و زوڵاڵە کە گیانی ئەو کەسەی کە دمی تێوەردەدات، لێوالێو دەکات لە ئازادی و ژیان و کرانەوەی چاك، وە زەوی یەکەی هەمووی وەفاو چەسپاویی و پێ گەیاندنە . . . ئێستا، ئەو باڵندە میهرەبان و وەفادارو پڕ لە ڕاستگۆیی یە -کە خۆی لەبەرامبەر هەوڵە جوانەکانی بۆ ئەو جوجکەیە، بە هیچ دەزانی وە جگە لە ئەوین و میهرەبانی و چاکێتی و باشی هیچی تر لەو نەدەتکا- لەناکاو بۆتە دڕندەیەکی دڵڕەق و شێت، ژەهراوی تر لە دووپشکە، دڕندەتر لە هەڵۆ، بێ بەزەیی تر لە شەمرا بێ چاو و ڕووتر لە پشیلە!

دەڵێ ی ئەو باڵندە دڕندەو دڵڕەقەیە کە چاوەکانی ئاشیلی لە کاسە دەرهێناو خواردنی. دەڵێ ی یەکێك لە باڵندەکانی ئسکیسە کە لە جەمەندەمی یۆنانی یەکاندا فەرمانبەری ئەشکەنجەدانی مرۆڤەکانن وە خۆراکیان گۆشت و پێست و چاو و گوێ و لوت و لێو و زمانی خەڵکی زیندووە! خواوەندی کینەو توندوتیژی و بێ سۆزی یە لە شێوەی باڵندەیەکدا!

بۆچی ئەو مریشکە ئارام و میهرەبان و فیداکارو باش و لاوێنەرەوەیە بەو شێوەیە لەناکاو بوو بە دڕندەی دڵڕەق و خراپ؟ ئەوە ناکرێت باوەڕی پێ بکرێت. بەڵام چ دەتواندرێ بکرێت؟ ئەمن ئەوە دەبینم: هەڵە ناکەم: ئەوە بارودۆخەکەیە!

بۆ ئەو هەر ئەو مریشکەی جاران نیە کە دەگەڕاو دەگەڕا دنکە گەنمێکی دەدۆزیەوەو بە چ شادی و پاکی یەکی گیانی بەگیانی، بە هات و هاواری میهرەبانی یەوە، جوجکەکەی کە سەرگەرمی یاری کردن بوو، بانگ دەکرد وە

ئەویش دەهات وە مریشکەکە، بە دندوکەکەی، دنکە گەنمەکەی هەڵدەگرت و دایدەنایەوەو نیشانی جوجکەکەی دەداو جوجکەکەش هەڵی دەگرتەوە وە مریشکەکە –کە بۆخۆی برسی بوو و چیکڵدانەکەی بە سینگیەوە نوسابۆوە– دوور دەکەوتەوەو تەنیا تەماشای دەکردو خۆشحاڵ دەبوو وە جوجکەکەی بە تەماشاکردنە شەیدایەکانی دەلاواندەوە! وەی! چەندە خۆشحاڵ بوو لەبارەی ئەو لەخۆبڕاوی یەی! بەڵێ، لەخۆبڕاوی! ئەوەی مرۆڤ تەنیا لەبارەیەوە قسەدەکات، ئەو تەنیا جێ بەجێ ی دەکات.

دیمەنێکی سەیرە! جوجکە، وەکو کاری هەمیشەی، بەدوای ئەو مریشکە میهرەبان و فیداکارەدا دەڕوات وە بە گەرمی و شادی و خۆشەویستی و دڵنیایی یەوە، بە دەوری مریشکەکەدا هەڵدەسوڕێت وە خۆهەڵداوێت وە جیکە جیک دەگرێتەوە. بەڵام مریشکەکە ئەوڕۆ شێت بووە، بۆتە دڕندە، وەکو هەڵۆ، وەکو پشیلەی دڕندە، وەکو کرکس: خوێنخۆرو دڵڕەق، جوجکەکە لەخۆی دووردەخاتەوە. وەیش! چەندە بە توندی و بێ بەزەیی یانە، پڕی دەداتێ! بە چ توڕەیی یەکەوە! ئەگەر جوجکەکەش دووبارە هاتەوە، مریشك دووبارە دڕندانەتر لێ ی دەدات. دندوکە تیژەکەی بە پشت ملە ناسك و کەلەکە نەرمەکانی جوجکەکەدا دەباتە خوار وە کۆمەڵێك لە پەڕو پێست و گۆشتی ئەو بە دندوکەکەی دەگرێت وە ئەوەندە بێ بەزەیی یانە ڕای دەکێشێ کە هەڵی دەقەنێت، جوجکەکەی بریندارو خوێناوی دەکات. ئەوە دایك نی یە، بازێکی ڕاوچی یە وە خراپترو توڕەترە لە هەموو دوژمنێك، ئەوەندە بە کینەو ڕقەوە لە جوجکەکەی دەدات و دەری دەکات و بریندارو خویناوی دەکات کە دڵی هەر بینەرێکی دڵڕەقیش دێنێتە ئازار، هەموو کەسێك ناچار دەکات کە دڵی بۆ بارودۆخی ئەو جوجکەیە بسوتێت، وە بەشداری بکات لەو جەنگە بێ بەزەیی یانەی نێوان دایك و ڕۆڵە، ببێتە هۆکارێك، نەهێڵێت کە مریشکەکە ئەوەندە جوجکەکە ئازاربدات: ئەو لە چەنگی ئەو ستەمکارە ڕزگار بکات، مریشکەکە

دەربکات، جوجکەکە ڕزگار بکات . . . ئەی! چەندە مریشکێکی خراپی بێ بەزەیی یە! جوجکەی بێچارە! تەماشابکە چەندە سەرو باڵەکانی بریندار بوونە!
ئەمن ناتوانم باسی ئەوە بکەم کە لە کاتی تەماشاکردنی ئەو دیمەنەدا چ بارودۆخێکم هەبوو! ئەمن کە چەند مانگێك، هەموو ڕۆژێك، هەموو سەعاتێك، بینەری جوانترین و خوایی ترین پەیوەندی پاك و گەرم بووم لە نێوان ئەو دووانەدا، ئەمن کە ئەو مریشکەم زۆر بەباشی دەناسی . . .
نەمدەتوانی بە سادەیی، ڕێگا بەدڵم بدەم وەکو ئەوانی تر کە ئەویان نەدەناسی، پڕ بێت لە نەفرەت و کینە بەرامبەر ئەو. بەڵام توانای بینینی ئەو ڕۆژەو ئەو بێ بەزەیە یەشم نەبوو. بۆ دوورلەهەڵەیی ناسکی جوجکەکە دڵم دەسوتا: لە دڵڕەقی و دڕندەگەری مریشکەکەش پەرێشان دەبووم، بێ ئۆقرە دەبووم: غەم پەڕی دەدا گیانم: لە داخان ڕووم وەردەگێڕا. نەمدەزانی دەبێت چ بکەم؟ نەمدەزانی دەبێت چ بڕیارێك بدەم؟ نەمدەزانی دەبێت هەست بەچی بکەم؟ چۆن بم؟ . . . هیچ . . . هیچ . . .هیچ . . .
هەوڵم دەدا تا بە هەزارو یەك بەڵگەی خەیاڵی و گریمانەیی و زانستی و . . . مریشکەکە بێ تاوان پێشان بدەم: کارەکەی ئاراستە بکەم: بەڵام دەنگی ناڵەناڵی جوجکەکە، کە لە چاوەڕوانی خۆشەویستی یەوە پەنای بۆ ئەو دێنا وە ئەوەندە بە دڕندەیی یانە ڕاودەنرا وە بە خوێناوی و پەڕ لێ هەڵقەندراوی، هەڵدەهات و دەگەڕایەوەو پەنای بۆ مریشکەکە دێنایەوە . . . نەیدەهێشت. نەمدەهێنا سەر زمانم بەڵام لە قوڵایی دڵمدا، کەم کەم، بە شێوەیەك کە بۆخۆشم بەباشی تێ ی نەگەم، قسەی ناشیرنم بە مریشکەکە دەگوتن. وورده ورده ڕق و بێزاری لەو هەموو دڵڕەقی یە لە دڵمدا دەپشکوت، هەتا، جاری وابوو بە ئەندازەیەك دەکەوتمە ژێر کاریگەری یەوە، پەرێشان و بێ توانا دەبووم کە نەك تەنیا ڕقم لەو دەبۆوە، بەڵکو بەرامبەر چاکی یەکان و میهرەبانی یەکان و لێبڕاوی یەکان و ئەوینە نهێنی ئامێزەکان و پاکەکانی ئەو کە لە ڕابردوودا هەیبوون ڕەش بێن

دەبووم، گومانم دەکرد کە نەکا ئەوانەش هەر "بەو شێوەیە" بوون: بەهۆی ئارەزوویەکی هێمادارەوە بوون، بۆ خۆشی تێ ی نەگەیشتووە . . .

بەڵام پێم ناخۆش بوو ئەو قسانە لەبارەی ئەو کە ئەو هەموو چاکێتی و جوانیەتی و برادەری و ئەوینەی بۆ من نیگا کردبوو، بێنمە گۆڕێ. بەڵام ئەوەی هەبوو، دیتنی ئەو جەنگە سەرسوڕهێنەرەی کە، لەودا، میهرەبانترین دایکی فیداکاری جیهان، بە دڵڕەقی یەکی شێتانەوە، لە ڕۆڵەکەی دەدات وە ڕاوی دەنێت، ڕۆڵەیەك کە ئێستاش نیازمەندی لاواندنەوە گەرم و ڕاستگۆیەکانی ئەوە وە بە چاوەڕوانی یەوە خۆی دەباتە ژێر باڵە پڕ خۆشەویستی و ئارامی بەخشەکانی ئەو وە لەترسی ساردی و بێ میهری و مەترسی تەنیایی و یان لەگەڵ ئەوانی تر و بێگانان و بێ هودەکان بوون، بۆ دامەنی ئەو -کە هەمیشە لەوێ بە خوپێوەگرتن و خزمایەتی و ئومێدو ئاوازگوتنەوە، پڕدەبوو لە خۆشەویستی و بە ئەوینە ئەودیویی یەکان تێرئاو دەبوو- پەنا دەبات، بەڵێ، بینینی ئەو شەڕە لاوازکەرو گیان ستێنە منی بێهێز دەکرد، ئازاری دەدام، بیرەوەری شیرنی ئەو هەموو چێژە پاك و جوانی یە پڕ جۆش و خرۆشانە کە لە تەماشاکردنی چارەنوسی ئەوین و برادەرایەتی و پەیوەندی نێوان ئەو دووە لە گیانمدا ماڵی دانابوو لە بیری دەبردەوە، ڕەشی دەکردەوە . . .

وای! چەندە مریشکێکی بێ بەزەیی و تووڕەو دڵڕەقە! بۆچی وادەکات؟ تێ ناگات چی دەکات؟ هەستی نی یە؟ بێچارە جوجکەی بێ هەڵەو ناسك! بەستەزمانەی چی بەسەردێت!؟ ئەوە زۆر بێ بەزەییانەیە. ئاخر بۆچی؟؟؟ . . .

چەند ساڵێك لەو ڕۆژانە تێپەڕیوە. چیتر ناچمەوە لادێ ئەگەر یەك دوو ڕۆژانیش دەچم، بواری سەیرکردنی ئەو شانۆ جوان و خۆشەویستەم نی یە، بەڵام، ئەو دوایی یانە چەندە بە دەردناکی یەوە تێگەیشتم، ئەوەی کە لەو ڕۆژانەدا، ئەو هەمووە نقومی تەماشاکردن و ڕامان بووم وە تێ ی نەدەگەیشتم. ڕازی ئەو داستانە چێژبەخش و سەرسامکەرە کە کۆتایی یەکی غەمهێنەرو گرانی هەبوو ئەم ڕۆژانە باش تێدەگەم. ماوەیەکە خەریکە تێدەگەم. تێدەگەم؟ نەخێر،

تێگەیشتن لە ڕازێك، یان گومانێك ئەوەندە بەردەوام نی یە. تێگەیشتن، زانین، بەئاگابوون و پەی بردن بە بابەتێك ناکرێت کارێکی بەردەوام بێت. یەك جار پەی بە نەزانراوێك دەبەین وە لەبارەی نهێنی یەکەوە ئاگادار دەبینەوە وە پاشان دەبێت بڵێین: "ئەمن لەوە بۆ نمونە" چوار ڕۆژ لەمەوپێش، دوو ساڵ لەمەوپێش، سەردەمی فڵان . . . چوارشەممە، لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەیەکدا، دۆزینەوەیەك، گەشتێك، دیدارێك، وانەیەك . . . تێگەیشتم"، ڕاستە. تێگەیشتنە زانستی و فەلسەفی یەکان بەو شێوەیەن. ئەقڵ بەو شێوەیە تێدەگات. ئەقڵ ئامێرەکەی ژیربیژی یە وە ژیربیژی جگە لە دوو بار هیچی تر نازانێت: "تێ دەگەم"، "تێ ناگەم" هەر ئەوەندە! پێویستی بە لەوە زیاتر نی یە. ئەوەی کە دەبێت ئەو لێ ی تێبگات سروشتە، نهێنی یەکانی جیهانە وە ئەوانەش هەموو یەك ڕوویان هەیە، لە یەك واتا زیاتریان نی یە. بەڵام کاری گیان بەو شێوەیە نی یە. تێگەیشتن لە ئەقڵدا، وەك داگیرسانی گڵۆپێکی کارەبایی یە لە ژوورێکدا یان ڕوناکی هەورە تریشقەیەك لە ئاسماندا، یەکاجارەکی ڕوودەدات. لە یەك ساتدا ژوورەکە تاریکەو لە ساتەکەی تردا ڕووناکە لە نێوان ئەو دووانەدا، بارودۆخێکی تر نی یە.

بەڵام تێگەیشتن لە گیاندا، وەکو دەرکەوتنی خۆرە لە ئاسۆی ڕۆژهەڵاتەوە. خۆری تێگەیشتن لە ئاسۆیەکی دوورو گوماناویی یەوە لە گیاندا دەردەکەوێت وە ڕووباری سپێدەی بەیانی زانینێك، دەرکەوتنی خۆری جۆرێك لە دانایی، جۆرێك لە عیرفان، دۆزینەوە یان بینین لەپشت لوتکەی چیایەك، لە دەشتی بێ کۆتاو پڕ نهێنی "میرنشینی گیان"دا، بەڕێ دەکەوێت. وەکو خۆرێك کە بەسەر سەهۆڵبەندانەکان و پارچە بەفرەکانی ناخۆئاگایی و بەستن و بێ دەنگی دا هەڵدێت و لێ دەگەڕێت وە دڵۆپەکان کەم کەم جۆگاو جۆگایەکان وردە وردە، دەبنە ڕووبارەکان و ڕووبارەکان خێرا خێرا، دەبنە دەریا وە مرۆڤ، لە ناوەوە، نقوم دەکەن. خۆری ئاگایی، گەرمای ڕوونی ناسین –وەکو هەڵهاتنی ئارام و بەردەوامی "بەیانی" لە گیانی "ئەو شەو" دا، وە هەر وەکو هاتنی شاردراوەو

بەردەوامی بوونی بەهار کە لە مێشکی مانگی دوازدە دا دێت و دەچێت– پارچەکانی ڕەشایی نەزانی و داوێنە بەفرگرتووەکانی زستان لەسەر زەوی گیان دەردەکات و دەتوێنێت، وە ئەو "گۆڕانی وەرزە" سەرەتای هەیە بەڵام بێ کۆتایە. لەو جیهانەدا، خۆر هەمیشە لە دەرکەوتن دایە، بەهار هەمیشە لە گەیشتن دایە و دڵ، بە بەردەوامی، لە بارودۆخی تێگەیشتندایە!

"بودا، جارێك، لە شێوەی باڵندەیەك هاتە سەر زەوی وە مریشکەکانی ئاگادارکردەوە کە ئەو دارستانە بەجێ بێڵن چونکە بەزوویی ئاگر دەگرێت . . ."

لەو کاتەوەی کە پێم نایە دنیای نهێنی ئامێزی هیندستان وە لەگەڵ جیهانی پڕ سەرسوڕهێنەری مریشکەکان ئاشنابووم، لەو ڕازە تێگەیشتم، ئافەرین بۆ تۆ ئەی سەرچاوەی پاك و ئازیزی بودایی کە خۆت لە پێناوی بڕوایەکەتدا سوتاند، ئاگرت گرت وە لە بەرامبەر مندا، لە دیواری گیانی من کە پاڵێوەرەو ناتوانی بچیە ناوی، بەو سەیرکردنە بێ پایانە پڕ لە سەیرو سەمەرەی ڕۆژهەڵات، پەنجەرەیەکت کردەوە وە فێری زمانی مریشکەکانت کردم وە دڵم لەبەر جوانی یادی تۆ بوو بە پەپولەسلێمانە.

ئەمن لەو "کاتەوە"، ڕازی ئەو دڵڕەقی یە دڵئازاردەرو باوەڕنەکراوەی ئەو سەرچاوەی سۆزو خۆشەویستی یە بێ گەردە خوایی یە تێ دەگەم: بە شێوەی بەردەوام، شەو و ڕۆژ، کاتژمێر بە کاتژمێر، لەو کاتەوە، هەموو ڕۆژەکان و شەوەکان و کاتژمێرەکان و خولەکەکان و چرکەکان و ساتەکان هەموویان، وەکو هێڵێك، ڕووبارێکی بەردەوامی لێکجیانەکراوە بوونە یەك دەست وە ئەمن بە هەمان بەردەوامی و کشان و ڕۆیشتنی بەردەوام، ئەو ڕازە دەردهێنەرو تۆڕێنەرە تێدەگەم، نەخێر، هەست دەکەم. باشتر وایە بڵێم: ئەمن چەند ساڵێکە ئەو ڕازە شاردراوە جەرگبڕو باوەڕنەکراو و بێهێزکەرە دەکێشم. بەڵێ ووشەکەیم دۆزیەوە: دەکێشم! ئەمن ئەو ڕازە، تێگەیشتنی بەردەوام و ڕوو لە زیادیی ئەو ڕازە

دەکێشم: با بڵێن ئەو ڕستەیە ڕاست نی یە: "بەکارنەهاتووە". بە جەهەندەم کە بەکارنەهاتووە، دەزانم بەکارنەهاتووە، بەڵام ڕاستە.

"چونکە ئەو تێکشکاوە لە هەزار ڕاست باشترە". ئەدیب و زانا "ڕێسایی یەکانی" ئێمە لەچی تێدەگەن؟ ئەوان تەنیا دەتوانن لە ڕاستەکان تێبگەن، چوزانن کە هەڵەی وا هەیە کە لە هەموو ڕاستەکان ڕاستترە. ئەوەش بوو بە قسە کە بڵێ ی: "بەکارنەهاتووە"؟ بۆ بەکارنەهاتووە؟ لەبەرئەوەی بە کەڵکیان نەهاتووە، ئەوان کە لەو دوڵانە نینە. هەموو نیازی گیانی و ژیانی ئەوان بە کتێبێکی "ووشەو مانا" پڕ دەبێتەوە: لێشیان زیادە. زمانی "کلیلەو دمنە" یان بەسە. مەگەر لەو دووە نیازمەندترو هۆشیارترو قوڵترن؟ زۆربەی وشەکانی ئەو زمانەش بۆ ئەوان گرانە وە زیاترە لەوەی کە پێویستیان پێ یەتی! ئەگەر وانی یە، بۆچی کلیلەو دمنەزانەکان هەموو خۆیان دەگرن؟ ئەو هەمووە "دەفرۆشن" وە خەڵکیش "دەکڕێت"؟ ئەی بۆچی ئەو کەسەی کە کلیلەی زبری زێڕی هەیە ئەو هەموو غەبغەبەی هەیە؟

بەڵێ، ئێستا خەریکە تێدەگەم. چەند ساڵێکە ئەو نادیارە باوەڕنەکراوە، ئەو تراژیدیا گرانە کە گیان دەسوتێنێت دەکێشم. تراژیدیا چی یە؟ گرانترین و باشترین کارەساتێکە کە مرۆڤ ڕەنجی پێوەبەرێت بەڵام نەتواندرێت هیچ کەسی پێ تاوانبار بکرێت. نە مریشك، نە جوجکە، نە ڕۆستەم، وە نە سوهراب.

ئێستا چەند ساڵێکە ئەو ڕازە کە گیانمی خستۆتە دەرەوە دەکێشم، نەك بەو شێوەیەی کە نادیارێکی زانستی، بابەتێکی بیرکاری یان ئەدەبی تێدەگەن، بەڵکو بە شێوەیەك کە غەمێك، بەڵاو کارەسات و دەردێك دەکێشن. کارەساتێك، وە دەردو داخێك کە پێش ئەوە، وێناکردنیشیان بۆی نەبووە. لە گەڵی ڕانەهاتوون.

چ بڵێم؟ چەند گرانە ئەو قسەیە! وامزانی کە لەژێر پەستانی ئەودا ووردو خاش دەبێت، دەشکێت. باسکردنی چەند گرانە! وەکو گیان ستاندنە . . .

تەماشای فیداکاری بکە! پڕ شکۆیە وەکو دروستکردنی گێتی!

تەماشای لێبڕاویی بکە! وەکو زولاڵی جیهانی فریشتەکانی خوایە!
کە کارەساتێك بە ناچاری دێت وە ئەوەش ئەو کاتەیە کە "ئەوین لەگەڵ ئەویندارەکەی ناکۆك دەبن" وە لەو دووانە، دەبێت یەکێکیان ببێتە قوربانی. وە خۆشویستنی ڕۆڵە لەو شێوەیەیە.خۆشویستنی ڕۆڵە؟ دەڵێم چی؟ خۆشویستنی خواش بۆ مرۆڤ بەو شێوەیەیە. بە ووتەی ئوپانیشاد: "مهراوە ی من، ئەوەندەم خۆشدەویێ ی کە خۆم بکەمە فیدای تۆ: هونەری خۆم بکەمە فیدای تۆ، بڕوای خۆم دەکەمە فیدای تۆ، میراتەکانم دەکەمە فیدای تۆ، سوارەکەم، هەموو بوونم، ڕابردووم، ئێستام وە ئایندەم دەکەمە فیدای تۆ. مهراوەی من، ئەمن ئەوەندەم خۆشدەویێ ی کە ئەوەی کە هەمە، مهراوەی من، تۆم کە هەیە دەیکەمە فیدای تۆ".
لە ئیسلامدا "دوایی هاتنی پێغەمبەرایەتی" ئەو جۆرە خۆشەویستی یەیە.
وە ئێستا هەست دەکەم کە ئەو مریشکە لەو بارودۆخەدا، ئەو مریشکە لەو ساتانەدا، ئەو مریشکە لەو کۆتایی هاتنە دژوارەدا چ بارودۆخێکی هەیە؟ چ دەکێشێت؟ لە دەرونیدا چ هەواڵێکە! خۆشەویستی لەوپەڕی لێبڕاویی دا، گەیشتۆتە فیداکاری وە لەوپەڕی فیداکاریی دا، گەیشتۆتە دڵڕەقی!ئەو بەهەر دندوکێکی توڕە کە لە پشت و شانی جوجکەکەی دەدات،
پارچەیەك لە دڵی خۆی بە دندوکەکەیەوە دێت.

## ♣ تراژیدیای خوایی

ئێستا من لە سنوری کۆتایی بەرزەخم، ڤـێرجل سوپاست دەکەم کە دەستی منتگرت کە گەنجێکی تازەپێگەیشتوو و بێ توانابووم، خستە ناو دەستە پیرو گەورەو بەهێزەکانت و منت گەیاندە ئێرە. نزیکەی بیست ساڵە کە منت ساتێك بەجێ نەهێشتووە، دەستمت گرت و هەنگاو بە هەنگاو بردتم وە لە هەموو ئەو ڕێگایـەدا بەیارمـەتی خـۆت ڕێنومـام بـوی و لـە ئـاگرە گـەورەو ئاگرکەوتنـەوە ترسناك و جەلادانی بێ بەزەیی و کەندەڵانە مەرگبارەکان و هەوای ئاگراویی و زەوی یە چنراو و دەریا زەمهەریریـەکان و چاڵە وێڵـەکان بە سەلامەتی منت تێپەڕکرد:

لە پردی چینتۆ (سیڕات) کە لە نوکی گوێزان بڕنـدەترەو لە موو باریکترەو بەسەر دوڵێك لە ئاگرە ڕەشە ڕەوانەکاندا تێدەپەڕێت کە لە تووڕەیی ترسناکی خواوەندەوە دەگرمێنن و دەکوڵن، منت بەڕێ کرد وە من، گەنجێك کە تائێستا قامچی هیچ ڕووداوێك بەخەبەری نەهێنابوو و ئاگری هیچ تاقی کردنەوەیەك نەیکوڵاندبوو، بەو شێوەیە، دەست لەناو دەستی تۆدا، بە دۆزەخدا تێ پەڕیم و، بە ڕوخساری سوتاو لـە ئـاگرە بڵێسەدارەکانی جەهەنـدەم و تەویلـەی لـوچ خواردوو بە هـۆی هـەڵکردنی با ئاگربارانەکانی هەوای ئەو، بە سەرکەوتویی هاتمەدەر و لێواولێو لە سەرکەوتویی، وەکو قارەمانێکی گەورە کە لە مەیدانی

خوێناوی خەباتی ترسێنەر دەگەڕێتەوە، پێم نایە ناو بەرزەخەوەو خەڵکی بەرزخ "لەهەرلاوە هاتن بۆ تەماشاکردنی من پیرو گەنج، ژن و پیاو، "لەهەر پۆل و سەرزەوی یەکەوە پەلەیان دەکرد تا من کە داخی سەدان تاقی کردنەوە لەسەر گیانی سوتاومە وە لە ئاگرە سوتێنەرەکانی ناو دۆزەخدا پەروەردەبووم و دەشتە سامناك و چیا مەترسیدارو دۆڵەکانی هەرەس و ڕێگا پڕ پێچ و بەرزی و نزمی و دەریاکان و هۆڕەکان و کەمینەکان و جەنگەڵە پڕ لە هەراسەکان کە، لە پشت هە سێبەرێکی، مردن لە کەمیندابوو، بێ باکانە بڕیومن و بوومە هاودەم و هاوڕێ ی شایستەی ڤێرجلی مەزن، لە نزیکەوە ببینن وە من، نقومی خۆپەسندی و هێزی ئەو بووم و، بوومە قارەمانی بەرزەخ و پەرستراوی بەرێزی بەرزەخیەکان.

بەڵام گیانی هەمیشە ڕێبواری من چۆن دەیتوانی لە شوێنێك پێگە دابنێت و لە ڕۆیشتن و ڕۆیشتن و دووبارە ڕۆیشتن بوەستێت؟ من کەنار نیم شەپۆلم.

بوونم هەیە ئەگەر دەڕۆم، ئەگەر نەڕۆم بوونم نی یە.

"ئێمە مەلێکی گوماناوین کە لە نەبووندا دەفڕین": ئەدی ئێمە چین؟ هیچ! هیچ! تەنهاو تەنها فڕین!

وە ڕۆیشتم و ڕۆیشتم، نەك بۆ شوێنێك، چونکە نازانم بۆ کوێ؟ ڕۆیشتم و ڕۆیشتم تالێرە نەبم، هەرکات کە هەڵاتنی (ڕۆژی) ئەوڕۆ دەبینم هەر لەو شوێنەم کە دوێنێ لێ ی بووم، لە زەبوونی و بێ هودەیی خۆم بێزار دەبم وە ئەو پارچە شیعرە کە بە یارمەتی رمبۆ (Rimbeau) و ئاندرە ژید (A. Gide) و خۆم پێکمهێناوە، کردومەتە زمانحاڵی خۆم کە شیعری زمزمەی بەردەوامی منە:

هەڵاتن، بۆ ئەو شوێنە هەڵاتن
هەست دەکەم کە باڵندەکان مەستن
دوێنێ لێرەبوم، ئەوڕۆ لێرەم
ئەی کێ بەدوای ئەودا دەڕوات؟؟

ڕۆیشتم و ڕۆیشتم دە ساڵ دەڕۆیشتم وە ڤـیرجل لـە هـەموو شـوێنێك لەگـەڵ مندابوو و دەستی منی لە دەستە میهرەبان و بەهێزەکانی خۆیدابوو وە بە چاوە تیژبینەکانی ئەو دەمبینی وە بە بیری ڕاست بیرکەرەوەی ئەو بیرم دەکردەوە وە بە گوێ یە وردبیستەکانی ئەو دەمبیست.

دڵی مەزن و پۆڵاینی ئەو لە سینگی مندا لێ ی دەدا: دڵێك کە دەرگا ئاسنە پتەوەکانی بە قفڵە گران و قایمەکانی کە لە سەرەتاوە بەسترابوو و کلیلەکەشی وون بووبوو، داخرابوو، دڵێك کە وەك گەماروێ "مەرگ" جگە لە خوێن گەرمی هیچ کەس لەودا نیشتەجێ نەبوو: هیچ پەتکێکی تێککراوە ناگاتە بورجە بڵندو پتەوەکانی وە تیری دورهاوێژی هیچ پەیامێك بەسەر بارووە ئەستورەکانی دا – کە یەکسان بوون لەگەڵ تەڵاشە بەردەکان– تێ نەدەپەڕی و پاسەوانانی ئاگاو هۆشیار و دلێرانی قەڵایەکەی بە فریویی هیچ پەیمانێك فریو نەدەدران . . . دڵی ڤێرجل بوو، قەڵای گەورەی سوپایەك کە لە دامێنی بڵندی کێوێك دانیشتبوو و هیچ ڕێگایەك، لە هیچ لایەکەوە، بۆ ئەوێ سەرنەدەکەوت، قەڵایەك کە سەری لە سینگی هەورەکان دەدا وە بورجە بڵندو ڕەشەکانیشی ڕۆیشتبونە ناو سینگی ئاسمان وە هیچ دەنگێك جگە لە فیشکاندنی ئەو نەدەهات وە جگە لە بە "ئەودیو:Metaphysic "هوە هیچ پەیوەندیەکی نەبوو، نە گوێ ی لە پێداهەڵگوتن دەبوو وە نە زەوی دەناسی: دڵ، دڵی ڤێرجل بوو، لە سینگی مندا، وەك بڵێ ی لێدانی نەبوو و لەرزینی نەدەزانی. دەستم هەر لەناو دەستی ڤێرجل دا بوو وە پێیەکانم، لەگەڵ پێ یەکانی هەنگاوی دەنا: لەکاتێکدا ئێمە دوو کەس پێکەوە دەڕۆیشتین وە هەرکەسێك بەدوای ئێمەدا دەهات جگە لە شوێن پێ ی یەك کەس هیچی تری نەدەدی. وە بەو شێوەیە من، دوای جەهەندەم، بە سەرانسەری بەرزەخیشدا تێپەڕیم، دەست لەناو دەستی ڤێرجل، وە هەنگاو لەگەڵ هەنگاوی ڤێرجل، وە ئێستا گەیشتومەتە کێوێکی بڵند کە لوتکەی لە دڵی هەورەکاندا وون بووە وە وانیشان دەدات کە بە ئاسمانەوە بەستراوەتەوە.

کێوەکە ترسناك و چارەگران و پڕ مەترسی یە: ڕێیەکی باریك و پێچاوپێچ وەکو مار لە ئەندامەکانی کێوەکە ئاڵاوەو بەرەو سەرەوە چووەو بە تەنیشت تەڵاشە بەردێکدا بایداوەتەوە وە لەبەرچاوان وون بووە. نازانم بۆکوێ دەڕوات، نازانم تا کوێ دەچێت؟ وە نازانم دوای ئەوە چۆنەو چی یەو چ هەواڵێك هەیە؟

کێوەکە وەکو دیوارێکی ڕاست ڕاوەستاوەو بەرەو سەرەوە چووە. هەرکاتێك دەمهەوێت تەماشای دوندەکەی بکەم ئەوەندە سەرم بەرزدەکەمەوە وەك بڵێ ی لە نیوەڕۆدا سەیری ڕۆژ دەکەم، ئەوەندە بە ڕێکی بەرزبۆتەوە کەنەك تەنها ناتوانرێ سەربکەوی یە سەرێ: بەڵکو بینەر وادەست دەکات کە ئەو ڕێگا پێچاوپێچەی کە بە تۆبزی خۆی بە سینگی کێوەکە هەڵواسیوەو سەردەکەوێت، هەر ئێستا دەگەڕێتەوەو دەکەوێتە سەرزەوی. لە بادانەوەی هەر پێچێکی دا کەندەڵانێکی ترسناك هەیە کە تێڕوانینەکان ئاراستەی قوڵایی خۆی دەکات. خلیسکەکان ئەوەندە خێراو لێژو پڕسامن کە من ئێستا کە لە تەنیشت کێوەکە، لەسەر زەوی تەخت ڕاوەستاوم و تەماشادەکەم، وادەست دەکەم کە لەناکاو بەردەبمەوە. خەیاڵی شاعیرانەشم ناتوانێت بەسەر ئەو کێوە بکەوێت وە لە وێناکردنیشی دەترسێت، بە تەنیایی دەترسم تەماشای بکەم، بیری لێبکەمەوە، چۆن دەتوانم بە تەنیایی بکەومەڕێ و سەربکەوم؟

ناتوانم، ناتوانم، ناتوانرێ، ناتوانرێ.

ڤێرجل! بۆچی بێ دەنگی؟ بۆچی واخۆت دۆڕاندووە؟ ئەژنۆیەکانت دەلەرزن، دەستەکانت، دەستە میهرەبان و وەفادارەکانت لەرزۆکن؟ پێ یە بەهێزو ڕاهاتووەکانت، ئەو پێ یانەی کە دەشتە ترسناك و دەریا ئاگرینەکانی جەهەندەمیان بڕی و بە بەرزەخدا تێپەڕین، بۆچی لەجێ ی خۆیان ووشك بوون؟ ڤێرجل! بۆچی بەو شێوەیەیە؟ بۆچی دوور ڕاوەستاوی؟ بۆچی بە سەرسوڕمانەوە چاوە تۆقیوەکانت لەو کێوە بڕیوە؟ ڤێرجل! بۆچی دەگریەی؟ ها! دەگریەی؟ ئەتۆ؟ ڤێرجل! تۆ دەترسێ ی؟ تۆ ناتوانی؟ بۆچی بەو شێوەیە بە پەشۆکاو و پەرێشانت دەبینم؟ بۆ تۆ مەزنترین شاعیری بەتوانای ئیتالیا نی؟

مەگەر تۆ ئەقڵی گەورەو درەوشاوەی جیهانی لاتین نی؟ مەگەر تۆ بلیمەتی بیری سەدە پڕ سامان و دوورەکانی سەرزەوی ڕۆژئاوا نی؟ ڤێرجل؟ بۆچی شتێك نالێ ی؟

ناتهەوێت بێ ی؟ نایەی؟ دەتهەوێت هەر لێرە بمێنیەوە؟ دەستی منت بەرهەڵداوە؟ ئەمن لە دامێنی ئەو کێوە، لەسەر ئەو ڕێگایە، بەتەنیایی جێدێڵی؟ ئەمن بەبێ تۆ چۆن بڕۆم؟ ئەمن بەبێ تۆ ڕێگای ڕۆیشتن پێ نازانم، ناتوانم. بۆ من بەبێ تۆ هیچ هەنگاوێکم هەڵێناوە؟ بۆچی من بەرهەڵدا دەکەی؟ من دەدەیەوە خۆم؟ من بەکێ دەسپێری؟

بۆچی لەگەڵ من ئەو ڕێگایە دەست پێ ناکەی؟ بۆ ئەو ڕێگایەی کە لە پێشمانە لەو ڕێگایانەی کە بە جەهەندەمدا تێدەپەڕین دژوارترە؟ ئەو دەشت و کێو و دەریایانەی کە لەمەولا دێنەسەر ڕێگا سامناکترو سوتێنەرترن لەوەی کە لەدۆزەخدا دیتمان وە پێیدا تێپەڕین؟ ئەو ڕێگایە لە پردی چینتۆش (سیرات) باریکترو، بڕندەترو ترسناکترە؟ چۆن دەبێت؟ مەگەر تۆ نەتگوت دوای بەرزەخ دەگەینە بەهەشت؟ مەگەر بەهەشت لەولای ئەو کێوە نی یە؟ مەگەر ئەو ڕێگایە بۆ بەهەشت ناچێت؟ ڤێرجل! مەگەر ڕێگای بەهەشت دژوارترو پڕ مەترسی ترە لە ڕێگای دۆزەخ؟ چۆن وادەبێت؟

ئەی ڕابەری دڵ ئاگاو هۆشیارو بەهێزی من: ئەی ئەوەی کە لە منداڵیەوە بۆمن ڕێنوماکەرێکی گەورەو بەخشندەو مەزن بووی: ئەی ئەوەی کە دۆزەخی ئاگراوی و بەرزەخی تاسێنەرم هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ تۆ دا بڕی: ئەی ئەوەی کە گیانی منت ئەوەندە پەرژێندراو و بەهێزکرد: ئەی ئەوەی کە مامۆستای خۆشەویستی گرانبەهای من بووی: ئەی ئەوەی کە من قوتابیەکی شایستەو بەرجەستەی تۆ بووم، ئەی ئەوەی کە پێشەوای من، ڕێبەری من بووی، من ناتوانم باوەڕ بەبێ توانایی بکەم لە تۆدا. من ناتوانم، ناتوانم ڤێرجل، قارەمانی سەرکەوتن کە دەشتە بڵێسەدارەکانی دۆزەخ و بیابانە بێ دەنگەکانی بەرزەخ لەژێر پێ یە بەهێزەکانی دا، وەکو پەڕ نیان و، نەرم بوو، ئێستا لە خوارووی ئەو

کێوە، لەسەر ئەو ڕێگایە کە ڕێگای بەهەشتە، ئەوەندە بە بێ تواناو هەراسان ببینم، ناتوانم، نا.

ڤێرجل! بۆچی هیچ نالێ ی؟ بۆچی دەستم بەرهەڵدا دەکەی؟ بۆچی پەرێشانی ڤێرجل؟ بۆچی دەگریەی؟

-من لە ڕۆیشتن وەستاوم: هیچی تر ناتوانم لەگەڵ تۆ بێم: لە هەڵهێنانی یەك هەنگاویش لەو ڕیگایەدا بێ توانام: ئەو ڕێگایە ڕێگای من نی یە: ئەمن پی ی ئاشنا نیم: پێگەو پێگەو پێگە گەورەکانی گەشتی ئایندەم نازانم: نایان ناسم. دەڵێن دوای ئەو کێوە، کێڵگەی سەوزو کانی ئاوی پاك و کلۆکلۆ و ڕوباری شیرو هەنگوین و خواردنەوە ئاسانەکان و دەریا بێ کۆتایی یەکان و ئاوە ژیان بەخش و باغەکان و گوڵەکان و باڵندە ئاوازخوێنەکانی لێ یە. هەوایەکەی لێواولێوە لە بۆنی یادەوەری گوڵەکانی خۆشترین برادەریەکان و ئاسمانەکەشی هەمووی ئاویی پاکەو سەرنج ڕاکێشە بەهۆی جوانترین بێ تواناکەرە ڕەنگ جوانەکان، وە هەوایەکەی گۆڕەپانی یاری نازدارترین نەسیمەکانی پەیامهێنەری باشترین و نایابترین خۆشەویستی یەکانە، وە دەشت و دەرەکەشی ڕەنگدانەوەی ڕەهایی و ئازادی لەبەندی-ڕاکێشەرترین ئارەزووەکان و، ئەسیریترین ئومێدەکان و زیندانی ترین گیانە پەرێشانەکان و تەنگترین دڵە سوتاوەکان و بێ ئارامترین تینوێتی یە بلێسەدارە کەوتوەکانی کەنار ئاو و، وە ئاگادارترین ووشەی نەوتراو لەپشت لێوە دڕاوەکان . . .

ئەوانە دەزانم و دەزانم کە هەن بەڵام، بەڵام من لێرەوە لەگەڵ تۆ نایم، من ڕێبواری ئەو ڕێگایە نیمە. ئەمن بەباشی بەجەهەندەمدا تێدەپەڕم و لە بەرزەخیشدا بەباشی ڕێ دەبڕم، بەڵام دوایین پێگەی من تەنیشت ئەو کێوەیەو لێرەوە ناتوانم یەك هەنگاو هەڵێنم. ئەو کێوە ببینە! تەماشای ئەو ڕێگایە بکە! ئەو کەندەڵانانە، دۆڵانە، بەردەڵانەکان، تەڵاشە ئەشکەوتەکان و خلیسکەکان کە من ناتوانم پێیاندا تێپەڕم. نابینی کە خەیاڵیش لە سەرکەوتن بۆ سەر ئەو لە

سامدایە؟ من "مرۆڤی ڕۆیشتنم" وە دەبێت ئەو ڕێگایە، نەك بە هەنگاو، بەڵکو بە باڵ ببڕم، گەشت گەشتی فڕینە.

ڤێرجل! من تەنها جێمەمێڵە! ڕێگایەك کە تۆ ناتوانی پێیدا بڕۆی چۆن من، قوتابی تۆ، من کە یەك هەنگاوم بەبێ تۆ هەڵنەهێناوە، من کە یەك چرکە دەستم لەناو دەستی تۆ دەرنەهێناوە، من کە هەرگیز، لە منداڵی یەوە تاکو ئێستا –کە کۆتایی گەنجێتی منە– هەرگیز بێ تۆ نەبووم، دەتوانم؟ بەبێ تۆ، بە تەنیایی بڕۆم؟ بە چ شێوەیەك؟ من بەبێ تۆ ڕێگای ڕۆیشتن پێ نازانم، ناتوانم، من تەنها جێمەمێڵە ڤێرجل! دەترسم، من بەکێ دەسپێری ڤێرجل؟ شتێك بڵێ!

بەڵام، ڤێرجل ڕووی وەرگێڕاو هیچی نەگوت، وە من سێبەری لەرزۆك و هەراسان و لاوازی ئەوم، بە تێڕوانینە ترساو و پەرێشانەکانم، لە بەرزەخدا، بەڕێ دەکرد وە ئەوم –بەبێ ئەوەی سەر بەرامبەر من، قوتابی وەفادارو دەست پەروەردەی خۆی بسوڕێنێت و تەماشام بکات– دەبینی کە بەبێ دەنگی، لە سینگی بیابانی فراوان و دەبەنگ و بێ گیانی بەرزەخ بە پەلە دەڕۆیشت وە کاتژمێرێك تێپەڕی، لە دورترین ناوچەی بیاباندا، لە نزیك ئاسۆ، سێبەرێکی وون و نادیار بوو وە پاشان هیچ نەبوو . . .

وە من تەنیا مامەوە.

من مامەوەو بیابان و چۆڵی و بێدەنگی و سەرسامی بەرزەخ لە بەرامبەرمدا، باڵای بڵندو سەرسوڕهێنەری ئەو کێوە، وە دووڵی پڕمەترسی ئەو ڕێگا پێچاوپێچ و نادیارە.

وە من تەنیا مامەوە.

بیابانی بەرزەخ منی دەترساند، بێدەنگی یەکی سەرسامکەرو ترسێنەری هەبوو. تۆزی سوارێك کە هیچ تۆزی گەردەلولێکیش ئارامیی مردووی ئەوی تێکنەدەدا. وەك بڵێ ی بوون لە ڕۆیشتن و جوڵان وەستابوو وە بونەوەر لە ترسێکی نادیاردا، لە جێی خۆی وشك بوو بوو و لێوەکانی لە بەرامبەر هەر ئاوازێکدا لەسەریەك دانابوون. هەوا بەشێوەیەك دێمکردوو و مردوو و وەستاو بوو کە

ئامارژەی سروەیەکی نەخۆشیش –کە هێلك بە ڕوخساری زەلکاوەکاندا بێنێت–پێیدا تێنەدەپەڕی. پەیکێك کە نەمدەزانی لەکوێ وە هاتبوو و کەی هاتبوو و هەواڵی چی هێنابوو وە بەدوای چ کەسێکدا هاتبوو، لەسەر زەلکاوەکە، لە بۆشاییدا هەر ڕاوەستابوو وە بچوکترین و نەرمترین تەکانی نەبوو. هەوا تەمومژێکی خەست و چەسپی و گران بوو وە ئاسمانی نزیك و کورت، لە ئاسۆوە تا ئاسۆ، بە هەورێکی ڕەش و غەمڕەنگ و پەست داپۆشرابوو، لەجیاتی باران، پەژارە دەباری، وە لەجیاتی هەورەگرمە، ناڵە ناڵی مەرگی دەهات و شیوەنی دەکرد. وای نیشان دەدا، دەنا، نە هیچ دەباری و نە هیچ دەنگێك دەهات، بەڵام بۆ نا، بەڵام نەك لە ئاسمان و نە لەسەر ڕووی زەوی وەك بڵێی ی لە دڵی مندا دەگریەت و لە گیانی مندا دەبارێت. هەموو شتێك لە شوێنی خۆی وشك بوو بوو. باڵندەکانیش وەکو باڵندە وشککراوەکانی مۆزەخانەی باڵندەناسی و پەپولەکانیش وەکو پەپولەی وشکهەڵاتوی ناو کتێبی منداڵان و ماسیەکانیش، وەکو ماسی یە دوکەڵاوی یان مردووەکان لەناو کفنی زەلکاودا. ژیان بوونی نەبوو. گێتی وەکو تەرمێکی بێ گیانی لێهاتبوو کە بۆنی کردبێت و لە دۆخی شی بوونەوەدابێت. سپێدە هەناسەی نەدەداو ڕۆژ، وەك پەڵە چڵکێك، بە ڕووی جاوی لێڵ و پیسی ئاسمانەوە نوسابوو وە ئەستێرە وشەیەکی نادیاربوو وە ڕوناکی و گەرما چەند ناوێکی دروستکراو بوون، دروستکراوی خەیاڵ و بیری شاعیران و فەیلەسوفان.

وە لەو ناوەدا، وەك بڵێی تەنهاو تەنها بوونەوەرێك کە هێشتا هەر زیندوو بوو و هەستی دەکردو دەیدیت و بیری دەکردەوە، من بووم: وە جگە لە من، هەموو شتێك کۆتایی هاتبوو: وە هەستم دەکرد کە لە ڕێکەوتێکی سەرسوڕهێنەرو یان هەڵەیەکی نەزاندراودا، کەوتومەتە دەشتی نەبوون و هەناسە دەدەم.

وەك بڵێی ی دنیا کۆتایی هاتووە: هەموویان ڕۆیشتوون: مرۆڤەکان هەموویان لەسەر خاکەوە خزیونە ناو خاك وە هەریەکەو لە کفنی خۆیدا، لەسەنگەری گۆڕی داخراو و تەنگی خۆیاندا، چاوەڕوانی هاتنی فوپێداکردنی ئیسرافیلن،

دامرکاون تا ببزون و پێ بنێنە ناو جیهانێکی تر وە سەریان لەژێر بەردی ئەلحەد دەربێنن وە چاو بە ئاسمانی جیهانێکی تر هەڵبێنن وە ئەو ساتە زۆر نزیکە. ئەو جیهانە کۆتایی هاتووەو وچانی داوەو داستانی ژیان و جوڵە، هەردوکیان، گەیشتونە کۆتایی وە هەموو، ڕۆڵەی مرۆڤ و مریشك و مراوی و کوللە و درەخت و ڕوەك و هەموو بوونەوەرەکان ڕۆیشتون و چاولەڕێ ی هاواری پەسڵانن و تەنیاو تەنیا من ماومەوە، وە فەرامۆشی یەك هەبووە کە لە ریزی هەموو بوونەوەران و هەموو زیندەوەران -کە بە قامچی مەرگ بۆ نیشتمانێکی دیکە لێخوڕدراون و سروشتیش لە ترسان، سەری لە کالانەی خۆی ناوەو زاری نیشان نادات- تەنها من بەجێ ماوم وە چ هەڵەیەك! وە گومانم نەبوو کە، بەزوویی، نهێنی هەست بە منیش دەکات وە بەدوامدا دێت. مەگەر دەکرێت؟ مەگەر دەکرێت جیهان کۆتایی بێت و مرۆڤەکان هەموو ڕۆیشتبن و چیرۆکی ژیان تەواو بووبێت و من، بە تەنیا، لەو دەشتە گێژکەرەدا -کە ڕەنگی نەبوونی گرتووەو بێجگە لە چاوەڕوانی یەکی سامناك هیچی تر لە ڕووی غوبارگرتوو و مردووی ناخوێندرێتەوە- مابمەوە؟

ئێستا کە ماومەوە چ بکەم؟ تەنیایەك، مرۆڤێکی تەنیا لە نەبووندا، لە دەشتی نەبووندا چ بکات؟

بە چ شێوەیەك دەتوانم باسی بارودۆخی خۆم بکەم؟ بە چ شێوەیەك؟ بەدوای کام وشەیە، دەستەواژەیە، زمانەدا، بگەڕێم؟ مەگەر کەس دەتوانێت مرۆڤێکی زیندوو لە دەشتی نەبووندا وێنا بکات؟ مەگەر ئەقڵ دەتوانێت تێبگات؟ مەگەر هەست دەتوانێت هەست بکات؟ مرۆڤێکی زیندوو، بە هەموو هەست و دەرك و هەستپێکردنێك، ساغ و ڕێك و تەواو، وەکو هەموو مرۆڤەکانی تر بەڵام، لە دەشتی فراوان و وەستاو و بێ دەنگی نەبووندا! مەگەر دەکرێت؟ ناکرێت، بەڵام کرابوو و من هەبووم: من هەبووم و نەبوونی ڕەها هەبوو و کێوەکە هەبوو و هیچی دیکەو هیچی دیکەو . . . هیچی دیکە. وە من هەستم دەکرد کە تەنها بونێکی زیندووم کە جگە لە هەراس هەست بە هیچ ناکات.

ماوەیەك بەسەر ئەوەدا تێپەڕی وە نازانم چ ماوەیەك، چونکە کاتیش لە ڕۆیشتن وەستابوو: کاتیش مردبوو، بۆ تەنیا جوڵە نیە کە کات دروست دەکات؟ مەگەر ڕۆژو مانگ و ڕۆژهەڵاتن و ڕۆژئاوابوون و سوڕانی زەوی و ئاسمان نی یە کە ئەندازەی کات دیاری دەکات؟ کاتژمێرەکان دروست دەکات وە شەو و ڕۆژو مانگ و ساڵەکانیش؟ نازانم بەڵام هەرچۆنێك بێت "زستان" بوو.

هەرچی بوو، ماوەیەك یان چەند ماوەیەك بەسەر ئەوەدا تێپەڕی کە لەناکاو! سێبەرێك کەوتە سەر پارچەیەکی زەوی نزیك کێوەکە، سێبەرێك کە جوڵەی هەبوو.

واتا چی؟ جوڵە؟ سێبەرێك کە جوڵەی هەبوو؟

بەدوای سێبەرەکە کەوتم و –لە دۆخێکدا دڵم لەبەر هەراس و سارێژبوون بە شێوەیەك لە قەفەسی سینگمی دەدا کە هەستم دەکرد کە لەوانەیە هەر ساتێك بتەقێتەوە– گوێم لە دەنگی پێیەك بوو: لە کوێ وە؟ لە کێوەکەوە! وە بەدوای ئەودا، خشەخشی خزانی بەردەکان و بەربونەوەی کورت و بڵندی خیزەکان . . .

وە من کە سەرتاپا بووبومە "چاوەڕوانی بێ ئۆقرە"، لەناکاو تارمایی مرۆڤێکم بینی.

بەڵێ، تارمایی مرۆڤێك کە لە کێوەکە دەهاتە خوارەوە وە چەندە ئاسان و زاڵ و ئارام! وەك بڵێی بەسەر ڕێگایەکی ساف و پاندا دەڕوات کە کەمێك لێژایی یەکەی زۆرە! باڵندەیەك بوو کە لەسەر سینگی شەپۆلەکان دەخلیسکا، وە من کە هەرگیز توانای ئەوەم نی یە بڵێم چ بارودۆخێکم هەبوو، چۆن بووم؟ دڵم چی دەکرد؟ گیانم چۆن بوو؟ وە خوێنم چۆن لەناو لولەکانی خوێنمدا دەڕۆیشت و دەسوڕایەوەو خوێهەڵدەداو چالاك دەبوو وە، لەبنەڕەتدا"، پەشۆکابوو و وەکو شێتان دەخولایەوە؟ چاوم چۆن بوون؟ تێڕوانینم چی دەکرد؟ هاتنە خوارەوەی ئارەق بەسەر ڕوخسارمدا، بە ژێر گەرومدا، گەردنمدا، سینگمدا، ئەولاولامدا، چۆن بوو؟ "بۆخۆم" بووم؟ نەبووم؟ بەو شێوەیە بووم؟ بەشێوەیەکی تر بووم؟

شێوەم، ئەندازەم، ڕەنگم، لاشەم، بوونم، دەست و پێ و سەرو گەردنم، هەبوو؟ نەبوو؟ چۆن بوو؟ . . . بەڵام، دیتم کە: بئاتریس بوو.

بەڵێ، بئاتریس بوو. ئەمن ئەوم پێش ئەو کاتە، لێرە، دیتبوو کە دەستی لەناو دەستی دانتە دابوو کە چۆن بەسادەیی و نەرمی گیانێکەوە، لەو کێوە هاتەخوار و دەستی ئەوی خستە ناو دەستە لاوێنەرەوەو میهرەبانەکانی و وە ئەوی وەکو سێبەرێکی نەرم و سوك بەدواخۆیدا ڕاکێشا. دەست لەناو دەستی یەکتردا، بەبێ دم کوتان، چاو لە چاوی یەك، بەبێ چاوتروکان، پێیان نایە ئەو ڕێگایەو ڕۆیشتنە سەر کێوە بڵندو سەختەکەو، لە دوندی کێوەکە ئەوێ کە وەك ئەوە وایە کە ئاسمان پاڵی پێوەداوەتەوە، ساتێك ڕاوەستان، ڕوویان سوڕاندەوە وە هەردووکیان، بۆ ساتێك، ئەو بیابانەیان وە ئەو ڕێگە دژوارو سوتێنەرو درێژو ئاسمانی گیراو و کورت و زەوی مردوو و تەمومژاوی و وەستاو و زەلکاوە بێ دەنگ و بێ جموجوڵەکانی بیابان تا ئاسۆ لێڵ و گێژکەرەکانی بەرزەخ و پەڵەی چڵکن و ناشیرنی ڕۆژ لەسەر بنمیچی کورت و گرانی بەرزەخیان تەماشاکرد وە پاشان، ڕووبەڕووی یەك، ساتێك تەماشای یەکتریان کردو، جگە لە زەردەخەنەیەك، هیچیان نە گوت و پاشان، پشتیان لەم لایە کردو بۆ ئەولا شۆڕبونەوە، بۆ ساتێك دەنگی نەرمی پێیەکانیان دەهات وە پاشان هەموو شتێك کۆتایی هات و بیابان مایەوەو دەبەنگی بیابان و بێ دەنگی بیابان کە دەتگوت جیهانە لە دوایین ڕۆژەکانی بووندا، بە ئارامیەوە لە چاوەڕوانی هەستانی وەیشومەی پەسڵاندان!

وە من لە زمانی دانتەوە گوێم لە چیرۆکەکەی بووە کە لەوێوە بۆ کوێ چوون وە دەست لەناودەستی بئاتریس تاکوێ و کوێ ڕۆیشتن وە بە ڕێگاو کێڵگەو باغ و کەنار جۆگەلەو ژێر سێبەری درەختەکانی بەهەشدا، دەست لەناو دەستی یەکتر، دەڕۆیشتن وە هەوای پاکی بەرەبەیانیان هەڵدەمژی و سرودی باڵی فریشتەکانیان دەبیست کە، پۆل پۆل، لە لایەکەوە بۆ لایەکی، لێواولێو لە شادی و مژدەو پەیام، بە فەرمانی خوا دەفڕین...

وە مـن دەسـتم خـستە نـاو دەسـتی بئـاتریس و ئـەویش، منـی بەسـوکی سـێبەرەکەی، بـەدوای خۆیـدا بـردە سـەرەوە وە مـن -بـێ ئـەوەی ئەژنۆیـەکانم هەست بکەن- لـەناکاو گەیشتمە بڵندی هەورەکانی کێوەکەو چاوم لـە ئاسمان بڕی و تێڕوانینم لەگـەڵ سـوڕانی ئاسۆدا دەسـوڕاند، وەك بڵـێ ی بـوون گیـانی هاتەوەبەرو سروەی بەهاری هاتە بزوتن و بۆنە خۆشەکان بە خێرایی لە هەموو لایەکەوە بڵاوبونەوەو ڕووبارەکان شۆڕبونەوەو بە هات و هاوارێکی هاندەرانەوە بە دەست ڕاوەشاندن و پێ بە زەوی دادان، دەشتەکانیان بەرەو دەریا دەبڕی وە باڵندە مەستەکان هەستان و ماسی یەکان بە شادی یەوە دەستیان بە مەلە کرد.
ژیـان لەسـەرەتاوە دەسـتی پـێ دەکـردەوە. سـاتێك ڕاوەسـتام و دەسـتم لـەناو دەستی ئەودابوو، تەماشای بوونم دەکرد وە چێژی بێ تواناکەری ڕزگاربوونی خۆمم لە ئارەزووی گیانمەوە هەستپێدەکرد وە پاشان، بەسوکی دوو پەپولە، بۆ ئەودیوی کێوەکە شۆڕبوینەوە .
وە لە بەرامبەرمدا بەهەشت دەرکەوت.
وە من باروودۆخ و دڵی گەشتیارێکم هەبوو کە تەمەنێك لە دەشتە ئاگراویەکانی جەهەندەمدا گەشتی کردووەو دەشتە مردووەکانی بەرزەخیشی بڕیوە وە ئێستا خۆی لە سنوری بەهەشتی خوادا دەبینێتەوە.
دەسـتە میهرەبانـەکانی بئاتریـسم، لـە شـادی و سوپاسـگوزاریان، دەگوشـین و هەرساتە پەلەم دەکرد، بۆ گەیشتن بە دڵی بەهەشت، دڵم بۆ دۆزینـەوەی حـەوزی کەوسـەر، سـێبەری بەختـەوەری، جۆگایـەکانی شـیر و هـەنگوین و کۆشـکە شکۆدارەکان کە لەسەر ڕووبارەکانن، چاوەڕوانی ئێمەن پەلەی دەکرد.
پەلـەکردنم بـەو شێوەیە لـێ ی دەخـوڕیم وە، لـە ڕۆیـشتندا، بەشـێوەیەك شـادی گەیشتن بە سەرچاوەی بەجۆشی هەموو ئارەزووە ڕەنگینەکانی خەیاڵی مرۆڤـی وردەوردە سوکترو بێ ئۆقرەتر دەکرد، کە هەستم دەکرد دەست و پێ یـەکانم، بە بێ تواناکەری شادی، گۆڕاون بۆ شاباڵی گەورەی هەڵۆی تیژ فڕ وە هەرساتەو زیـاترو بـەهێزتر دەڕوێن، وە مـن ئەوسـا لـە جیـاتی ڕۆیـشتن ڕامدەکرد، وە لـە

جیاتی ڕاکردن خۆمهەڵدەدا. لە زەوی جیابوبومەوەو لە بۆشایی دا، بەسەر ڕووی ڕێگەکان و درەختەکان و باغەکان و کوڵانی باغەکانی بەهەشتدا، لەخۆشیان، دەفڕیم!

وە لەو کاتەدا، لەناکاو، کۆشکێکی گەورەی زێڕم لەدامێنی کێوێکی زێودا دیت کە بە ژێریدا ڕووبارەکانی ئاوی ژیان دەڕۆیشتن وە هەوایەکەی بۆنی گیان پەروەردەکەری گولی پێنج پەڕی هەبوو کە لە باغە هەڵواسراوەکانی ئاسمانەکاندا دەڕوێن وە ئەولاولای کۆشکەکە دەورەدرابوو بە لاولاوەی گەشاوەو پڕ جموجوڵ -وەکو منداڵی جوان و دوور لەهەڵە کە خۆیان بە دایکیانەوە هەڵدەواسن- وە دەمبینی کە سات بە سات دەڕوان و کۆشکی منیان بە پەنجە خۆش ڕەنگ و نەرمەکانی خۆیان دادەپۆشی وە هەستم دەکرد کە ئەو کۆشکە، بەو پەلە پەلە، بۆ من دەڕازێننەوە.

وەکو کۆتر لەسەربانی کۆشکی خۆم نیشتمەوە وە پاشان بێ ڕاوەستان، لەسەر لقی درەختێکی مەزن و پاراو کە سەرانسەری ئەو سەرزەمینە گەورەیەی خستبۆ ژێر سێبەری خۆیەوە، دانیشتم وە بەبێ ڕاوەستان، لەوێوە، لەسەر هەیوانی کۆشکەکە، لەسەر کەناری ڕووبارێکی گەورەو سازگار کە بە ژێر کۆشکەکەدا تێدەپەڕی، نیشتمەوە. ئاوی ڕووبارەکە وەکو ڕووی پاك و ساف و تیشکدەرەوەی ئاوێنە بوو وە ڕۆژی وا لە خۆیدا وێنادەکرد وەك بڵێی ی سەرچاوەی زێڕینی هەتاو لێرەوە سەرچاوەدەگرێت وە ئاسمان لێرەوە ڕووناکی وەردەگرێت، وە ڕۆژ لێرەوە پەیدابووە وە ڕۆژی ئاسمان تیشکدانەوەی ڕۆژێکە کە لە ئاوێنەی ئەو ڕووبارەدا هەڵاتووە.وە من بۆ یەکەمین جار، "وێنەی خۆم" — بەو شێوەیەی کە هەبوو- لە دڵی پاك و پەتی و ڕاستی ڕووبارەکەدا تەماشاکرد وە چەند سۆزبزوێنە تەماشاکردنی ڕاستەقینەو ڕاستی خود: چەندە سۆزبزوێنە کە کەسێك وێنەی گیانی خۆی لە ئاوێنەکەیدا ببینێت! ئاه! کە چەند بە چێژە! لە بەهەشتدا هیچ چێژێك لەوە باڵاتر نی یە.بەڵام . . . ئەی!! بۆچی؟ کوا؟ کوا وێنەی بئاتریس؟! بۆ وێنەی بئاتریس . . .؟ بۆچی . . .؟ بە سەرسوڕمان و

هەراسەوە، تەماشای لای ڕاست و چەپی خۆم کرد، بئاتریس لەوێ نەبوو! تەماشای پشت سەرم کرد، لەوێ نەبوو، سوڕامەوە، خولامەوە، زەوی و ئاسمان، دوورو نزیك، هەموو شوێنێك گەڕام، دیتم: لەوێ نەبوو!

فریشتەکان دەهاتن و دەچوون باڵیان لەناو باڵی یەکتردابوو وە بەسەرسەرم دا تێدەپەڕین، ڕوخساری ئەو ژن و پیاوانەی کە خەرمانی ڕووناکییان لە مل بوو وە جوانی یەکی قوڵیان هەبوو بۆ چاوی من، لەبەرامبەرمدا بە ڕیز دەڕۆیشتن: لەناو پۆلە بچوك و گەورەکانی ئەوان -کە بە هەنگاوی ڕێك دەڕۆیشتن- هەندێکیان بە باڵایەکی ڕێکترو ڕوویەکی جوانترو خەرمانی ڕووناکی یەکی قوڵتر دەهاتنە بەر چاو . . . دەمتوانی هەندێکیان بناسم: محمد لە نێوان عەلی و سەلمان و ئەبوزەڕ و بیلال . . . لەگەڵ خەدیجەو زەینەب . . . عیسا لەگەڵ سەینت پۆڵ و چەند حەواری دیکە کە بەباشی نەمدەناسین: سوکرات بە هەمان ڕوخساری فەیلەسوفانەیەوە لە دۆخێکدا وەکو ئەسینا، ئەفلاتون و ئەرەستۆ و لوکاس و گەزەنۆفۆن و ئەلکبیادس لەدەوری ئالابوون دەڕۆیشتن و قسەی دەکرد. ئیبراهیم، موسا . . . زەردەشت . . . وە کۆمەڵە پیاوان و ژنانێك کە نەمدەناسین بەڵام زۆر پیرۆزو شکۆمەندو ڕووناکاوی بوون، ئارامی، بەختەوەری و دڵنیایی لە تێڕوانینە جوان و لێبڕاوانەکانیان دەتکا .

ڕۆچوومە ناو وێنەی خۆم کە لە ڕوبارە سازگارو پاکەکەی بەرامبەر خۆمدا شڵتوشۆی دەدا، وردتربوومەوە.

وێنەیەکی گوماناویی و لەرزۆکم لە قوڵایی ئاوەکەدا دیت کە هەرساتەو لە من نزیکتر دەبۆوەو ڕوخساری ڕوونتر دەبۆوە. سەری لە ئاو هێنا دەرێ و وەکو مراوی یەك، نەرم لەسەر سینگی ئاو، بە خلیسکان بەرەو ڕووی من دێت، وە بزەیەکی ئاسیاوانەو بەخشندەی هەبوو، لە ساتێکی جادوویی دا، کە دەستە جوانەکانی، وەکو نیازمەندی، بۆلای من درێژکردبوو، لە ئاو هاتەدەر وە دیتم کە "ئەو"ە.

هەورە خۆش هەواڵەکانی ڕەشەمێ بەسەر سەرمدا تێدەپەڕین وە ئەو –کە دوای چەند ساڵێك لە دەمی دەریاوە بەرەو من دەگەڕایەوە، دەستە ماندوو و تەنیایەکانمی لە دەستەکانیدا بە دڵنەوایی یەوە گوشی وە من بۆ یەکەمین جار، لە کەنارێکی پەژاراوی کە چەند ساڵێك لەسەر ئەو، تەنیاو بە چاوەڕوانی یەکی دڵساردەوە، چاوم چڕداگرتبوون، هەستامەپێ وە لەژێر سێبەری ڕووناکی یە ڕازدارەکانی درەختەکان و لەسەر ڕووی فەرشی سەوزی بەهەشتی هەنگاوم دەنا، دەستێکم لەناو دەستەکانی ڤیرجل و دەستەکەی دیکەم لە ناو دەستەکانی بئاتریس دابوو وە لە بەرامبەرمدا، زەردەخەنەیەك لە ڕووناکی لەسەر لێوە میهرەبانەکانی خوا.لەناکاو لەژێر پێمدا چاڵێك زاری لێککردەوە! بەربومەوە. چاڵەکە "وێڵ" بوو، وێڵ، "وەیش!" لەناکاو کونێك دەرکەوت. کونێك لەسەر بنمیچی ئاسمانی ئەو جیهانە.ساتێك و چەند ساتێك تێپەڕی. کەوتمە سەر زەوی. تەماشای دەوروبەری خۆم کرد: دیسان بیابان! چۆڵ و ترسناك و بێ کەس! وە من باڵندەیەکی بریندار، لەدڵی چنراوی بیاباندا!

وە زانیم کە . . . ڤیرجلی من مردووە وە دەریا بئاتریسی من ئازاد ناکات.

وە لە بەرامبەرمدا، تەنیا ڕێگەیەك هەبوو کە، لە منەوە، بۆ شاری ئەو بێ هودانە دەڕۆیشت!

-----

• ڤیرجل (٧٠–١٩ پێش زاین) شاعیرێکی ڕۆمانی بووە.

• بئاتریس ژنێکی فلۆرنتاینی یە کە دانتە وێنای کردووە لە شانۆیەکانی دا.

• دانتە (١٢٦٥–١٣٢١) زاینی، شاعیرێکی ئیتالی بووە.

## ♣ بۆ "خود"
## بۆ "ئێمە"
## بۆ "ئەوانی تر"

جیهانی ئێمە لە "کۆمەڵەی" بێ شومار دروست بووە. لە ناوەڕاستی هەر کۆمەڵەیەك خۆرێك هەیە وە کۆمەڵە ئەستێرەیەك کە بەدەوریدا دەسوڕێنەوە.

هەر کۆمەڵەیەك، یەکەم جار، لەشێوەی پارچە هەویرێکی گەورەدا یە. هەورەکە بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، لەهەمان کاتدا پارچەیەکی بچوکی لێ جیادەبێتەوە وە وردە وردە ئەو پارچانە دەبنە ئەستێرە وە ئەو پارچە گەورەیەی ناوەڕاست، دەبێتە خۆر وە بەو شێوەیە، جیهانێکی خۆری دروست دەبێت.

"دانە: تۆو"ێك لەناو خاك و ئاو و هەواو ڕۆژی باشدا، وردە وردە گەشەدەکات و دەبێتە نەمام و نەمامەکە گەورەو گەورەتر دەبێت، دەبێتە دار وە دارەکە لاخ و گەڵایەکانی ساڵ بە ساڵ زیاترو زیاتر دەبن وە گوڵ و میوە دەردەکات،

یان لەناو سکی دایکی دایە کە شوێنێکی گەرم و نەرم و پارێزراوە، بەخواردنێکی تایبەتی لەڕێگەی خوێنەوە، گەشەدەکات وە وەکو پارچە خوێنێکی بەستراوی لێ دێت وە وردە وردە سەرو لاشەو دەست و پێ پەیدادەکات ودەبێتە کۆرپە، وە کە تەواو بوو لە سکی دایکی دێتە دەرەوە، "لەدایك بوون"، تا ماوەیەك لە کەنار دایکیەتی و لە سنگی ئەو شیر دەخوات،

بەڵام وردە وردە گەورە دەبێت و لە زاریدا ددان دەڕوێن، دەبێتە خۆراك خۆر و پێ یەکانی هێزیان پەیدادەبێت و فێری ڕۆیشتن دەبێت و دەستەکانی چاپوکتر دەبن فێری کارکردن دەبێت وە وردە وردە زمانی دەکرێتەوەو فێری قسەکردن دەبێت و مێشکی دەکەوێتە کار هەر ڕۆژەو و باشتر دەناسێ و باشتر تێدەگات دەست بەخوێندن دەکات و هەر ساڵەو زانستەکەی زیاتر دەبێت و پەروەردەکردنەکەی باڵاترو هەستی زیاترو لەمنداڵیەوە بۆ مێرمنداڵی و لە مێرمنداڵیەوە بۆ گەنجیەتی و لە گەنجیەتیەوە دەگاتە تەواوی وە بیردەکاتەوە و کاردەکات و ژیانی هاوسەری پێکدێنێت و ماڵ دروست دەکات و دەبێتە ژن یان پیاوێکی باش.

ژیانیش لەو جیهانەدا لە سەرەتادا دروست بوو وردە وردە بەرەو پێش چوو. "بەرەو پێش چوون یاسایە": هەموو شتێك لەبەرەو پێش چوون دایە. ئەگەر بوونێك شایستەیی بەرەو پێش چوونی نەبێت لەناودەچێت، تەنیا شایستەکان مافی مانەوەیان هەیە وەکاتێك مانەوە بۆ هەمیشە ناکەونە دواوە، بەرەو پێش دەچن، سادەکان ئاڵۆزترو لاوازەکان بەهێزترو پەستەکان بەرزتر و باشترو ناتەواوەکان تەواوتر دەبن. چونکە لەسروشتدا هەموو شتێك لەگۆڕان و جوڵە دایە، بەرەو تەواوی دەچن لەبەر ئەوەی کە دەڵێن "تەواو بوون یاسای سروشتە ".

بوونەوەرە زیندوە سەرەتاییەکان گەردی بچووك بوون لەناو پیسای زەلکاو و گۆم و پاشماوەی کەنار دەریاو ڕووبارەکان دروستکران، هەریەکەی یەك "خانە" بوون بەوانە دەگووترێ بوونەوەرە زیندووە "تاك خانەکان" ئەمیبا لەو جۆرانەیە.

هەزاران ساڵ تێپەڕی و ژیان بەرەو پێشەوە چوو، تاك خانەییەکان بەرەو تەواو بوون ڕۆیشتن، بوونە فرەخانە وە شێوەی جۆراو جۆریان لێ دروست بوو وە جەستە نەرمەکان "بێ بڕبڕەکان" دروست بوون وەکو کرمەکان، لەناو ئەندامی هەندێك لەوانەدا وردە وردە ئێسکەکان پەیدابوون وە جۆری تەواوتریان

بـەدی هێنـا وەکـو باڵنـدەکانی نـاو هـەوا، ماسـیەکانی نـاو دەریـا، لـەناو ئێسکدارەکانیش وەکو مریشك و ماسی کە هێلکەیان دەکردو گەرایان دادەنا، جۆرێکی تەواوتر هاتە بوون کە هێلکەی لەناو سکی خۆیدا هەڵدەگرت تا ببێتە کۆرپەلـەو پاشـان لـەدایك بێـت. وە بـەو شـێوەیە لـەناو هێلکەکـەران "کۆرپەلـە بووەکـان" و "شـیردەرەکان" پەیـدابوون. بزنـەکان، مانگایـەکان، ئاسـکەکان، مەیمونەکان . . .

وە لەناو شیردەرەکان کە لەسەر چوار دەست و پێ دەڕۆیشتن وە هەمیشە بەرەو ڕوی زەوی چەماوەن و سەریان هۆکاری بەرگری کردنەو گەڕان بەدوای خۆراکیاندایە، جۆرێکی تەواوتر بوون، واتا قەدی ڕاستکردەوە وە لەسەر دوو پێیەکانی وەستا.

بۆچی تەواوتر؟

چونکە پێیـەکانی دەسـتەکانی لـە لەسـەر ڕۆیشتن ئازادکرد وە دەستەکانی سەری لە شەڕکردن ڕزگارکرد.

لـە ئەنجامـدا دەسـتەکانی بـۆ "کـارکردن" ئـازادبوون وە سـەری بـۆ "بیرکردنـەوە" بـەو شـێوە بـوو کـە تـەواوترین بـوونی زینـدوو لەسـەر زەوی پەیـدابوو. بوونێـك کـە جـوانترین پەیکـەری هـەبوو وە گونجـاوترین ئەنـدام وە چاپوکترین دەست و پەنجە بۆ گرتن و دروستکردن و هاویشتن و لێدان و ئاواز دروست کردن و . . . بە هەموو جۆرە ئامێرێك کارکردن، هەموو کارێك لەبەرد بەردانـەوەو بەپەنجـە ڕاکێـشان و مـست هاویـشتنەوە، تـاکو گـوریس ڕسـتن و ئاوریشم چنین و وێنە کیشان و هەڵکەندن و خەت . . .

بەڵام تەواوی ئەوانە دەرەوەی کارەکەیە .

بوونێکی ئاوا تەواوترین ئاژەڵە بەڵام ئێستاش "مرۆڤـ" نییە.

باشە کەی دەبێتە مرۆڤـ؟

لەو کاتەوە کە لەجیاتی سروشت بۆ خۆی خۆی تەواوتر دەکات. لە ئەمیباوە تا دەگاتە مەیمون، سروشت بونەوەرانی تەواوتر دەکرد کاتێك گەیشتە مرۆڤـ تەواوتربوون خرایە ئەستۆی خۆیەوە.

بوونەوەران بە گۆڕانکاری لە لەشیاندا تەواوتر دەبن.

مەلەوانەکانی ناو ئاو، لەسەر خاك بوونە خشۆك و خشۆکەکان پێیان دەرهات و توانای ڕۆیشتنان پەیدا کرد یان پەڕیان لێ ڕواو بوونە باڵندە وە بەو جۆرە هەر جۆرەو لەجۆرەکەی پێشتر تەواوتر بوو. بەڵام هیچ ئاژەڵێك بە "بێ قوچ بوون" و ڕاست ڕاوەستان، نابێتەوە مرۆڤـ

مرۆڤ بەگۆڕان لەگیانی دا تەواوتر دەبێت.

کەی مرۆڤ دەبێتە مرۆڤ؟

کاتێك کەدەتوانێت "تێ بگات"

کەی "تێگەیشتن" لەودا بەتەواوی دەگات؟

لەو کاتەوە کە ﴿باش﴾ و ﴿خراپ﴾ تێدەگات.

کەی تێ گەیشتنی ﴿باش﴾ و ﴿خراپ﴾ لەودا تەواو دەبێت؟

کاتێ کە لە ﴿ژیان بەسەربردن بۆ خود﴾ ەوە بگاتە ﴿ژیان بەسەربردن بۆ ئێمە﴾

کەی ﴿ژیان بەسەربردن بۆ ئێمە﴾ لەودا بەتەواوەتی دەگات؟

لەو کاتەوە کە دەتوانێت ﴿بۆ ئەوانی تر﴾ ژیان بەسەربەرێت.

کەی دەتوانێت ﴿بۆ ئەوانی تر﴾ ژیان بەسەربەرێت؟

لەو کاتەی کە ئەو ڕازە گەورەی خوایی یە دەدۆزێتەوە کە: ﴿هەرکەسێك ژیانی خۆی بە ئەوانی تر بەخشی، بۆخۆی لە ژیان کەڵك وەردەگرێت﴾.

بەدوای چاوچنۆکی خۆدا گەڕان و سەر لەخاك وەردان و سەر لە ئاخوڕ وەردان ژیان بەسەربردنی مەڕانەیە.

مرۆڤانە ژیان بەسەربردن نەك ﴿بۆ خود﴾، بەڵکو ﴿بۆ ئەوانی تر﴾ە.

ئاژەڵ دەڵێت:

﴿بۆ من﴾،

مرۆڤ دەڵێت:

﴿بۆ ئێمە﴾،

وە تەواوترین مرۆڤ، مرۆڤی پرهێزکارە.

وە مرۆڤی پرهێزکار دەڵێت:

﴿بۆ ئەوانی تر﴾.

﴿بۆ ئەوانی تر﴾ ژیان بەسەربردن تەواوترین جۆری ﴿ژیان بەسەربردن بۆ خودە﴾.

وە ئەوەش وانەی مەزنی ژیان بەسەربردنە کە دەبێت لە خودی ﴿ژیان﴾ەوە فێری بین.

لەشی زیندوو، کۆمەڵگایەکی زیندوویە. کۆمەڵگایەك کە لە سەدان ئەندام پێکهاتووە کە هەریەکەیان ژیان بەسەردەبات.

تەماشای دەست بکە!

زەوی هەڵدەقەنێت، وەردی دەداتەوە، تۆو دەچێنێت، ئاوی دەدات، نیوەی ساڵێك لەکێڵگەدا ڕەنج دەدات، دەیدروێتەوە، خەرمان گێرەدەکات، گەنمەکە دەباتە ئاش، لە ئارد، نان دروست دەکات، نان بەپەنجەکانی خۆی دەکاتە پاروو، بەچنگی خۆی دەیگرێت.

ئێستا بەرووبومی کارەکەی لەچنگی خۆی دایە.

بەڵام دەست چ دەکات؟

ئەو پارەوەی بۆ خۆی دروستی کردەوە بۆ ساتێکیش ﴿بۆ خۆی﴾ هەڵی ناگرێت هەمووی بە ﴿زار﴾ دەسپێرێ.

پرهێزکاری دەست تەماشابکە!

ئەگەر کەمترین بەشی ئەو پاروە لەلای بمێنێتەوە، بە پێستی بکەوێت، لەولاولای پەنجەکانی دابمێنێتەوە، بچێتە ژێر نینۆکەکانی، بەدوو دڵی و

**وردیەکی زۆرەوە خۆی پاك دەکاتەوە، هەتا بەئاو و سابون خۆی دەشوات، پاك دەکاتەوە.**

**دەست بوونێکی پاك و پرهێزکارە.**

**لەوەی کە بۆ خۆی دروستی کردووە و دابینی کردووە و بەدەستی هێناوە، گەردێکیشی بۆ خۆی ناوێت.**

**ئەوەی هەیەتی دەیبەخشێت. رەنجی دەستی خۆی هەموو دەداتە ئەوانی تر، ئەو بۆ ئەوانی تر کاردەکات، هیچ دەستێك خۆپەرست، خۆبین، چاو چنۆك و لە کەمیندا نیە. هیچ دەستێك "بۆ خۆی" ژیان بەسەرنابات. دەست دەزانیٚ کە:**

**ئەگەر ئەو خۆراکەی کە بۆ خۆی بەدەستی هێناوە، بهێلێتەوە، خواردنەکە بۆگەنیو دەبێت.**

**- دەست پیس دەبێت،**

**- لەش دەمرێت،**

**وە لەسەر لەشی مردوو کام دەستە دەتوانێت ژیان بەسەربەرێت؟**

**خۆراك لەناو لەپی دەستی دایە وە بەبرسیەتی دەمرێت،**

**وە لە کۆتایدا دوژمنەکانی ئەو -میکرۆبەکان و مێش و مەگەزەکان رەنجی دەستی ئەو**

**دەخۆن،**

**وە**

**سەمادەکەن و**

**وە**

**گۆرانی دەڵێن و**

**قەڵە و گۆشتین دەبن وە .**

## ♣ مرۆڤ، خوا-یی یەك لە تاراوگە

(خوا مرۆڤی لە پیسی[١] دروست کرد: پاشان لە گیانی خۆی فوی پێداکرد وە "بە شێوەی خۆی دروستی کرد"[٢] وە فێری ناوەکانی کرد وە ئەو "سپاردە"یەی خستە پێش زەوی و ئاسمانەکان، خۆیان لە هەڵگرتنی لادا، مرۆڤ هەڵی گرت، پاشان بە فریشتەکانی فەرموو کە لەپێش ئەودا کڕنوش بەرن)[٣]

[١]- حمائ مسنون ((قران)) [٢]- فەرمودەیەك و ئایەتێکی ئینجیل [٣]- دروستکردنی مرۆڤ لە قورئاندا

ڕوخساری ئەو مرۆڤە بەبەردەوامی، شەپۆلێك لە "پەژارە"ی تێدایە وە لە یەکەمین ڕۆژەکانی مێژووەوە، هەرکاتێك کە لەبەر پەژارەیی لە هەوڵەکانی ژیان، خۆیان بردوّتە سوچێکی لاچەپ تا بیر لە "خۆی" و لە "جیهان" بکاتەوە، پەردەیەك لە بەدبینی پێشچاوانی بەستووەو شەپۆلێك لە دوودڵی لەسەر ڕووی نیشتووە لەبەرئەوەی، ئەو هەموو کاتێك خۆی لەو جیهانە بە "زیاتر" بۆدەرکەوتووەو بۆی دەرکەوتووە کە "ئەوەی هەیە" بەس نیە بۆ ئەو، هەستەکانی لە سنوری ئەو بوونە تێدەپەڕێت وە لەوێ کە "هەرچی هەیە" کۆتایی دێت، ئەو درێژە پەیدادەکات وە تاوەکو "بێ کۆتایی" درێژدەبێتەوە. وە ئەو کاتە، لە ڕووخساری ئەو کاولگەیەدا، لەگەڵ سروشتی گیانی بە گیانی خۆی وە "خۆبوونی زوڵاڵی خۆی" نامۆیی خۆی دەبینێت کە نائومێدی دەکات

لە خووکردن و پەیوەندی دروستکردن وە هەستی تەنیایی لە قوڵایی ویژدانی خۆیدا بەخەبەر دێنێت وە چونکە بە شێوەیەکی دەردناك هەستی کردووە کە سروشتی پەست و بێ مێشك و بێگانە بەو سێبەری خۆی بەسەر ئەویشدا کێشاوەو، "بەبێ ئامادەبوونی ئەو" ئەویشی لەخۆی گلاندووە، لە بوونی خۆی و بوونی سروشت بێزار دەبێت. هەستکردن بە تەنیایی لەو جیهانەو بێزاری لە بێگانەیی لەگەڵ خۆیدا -ئەو خودەی کە هاودەست و هاوداستانی ئەو جیهانەیە- "نیشتیمان" و "خزمایەتی" بۆ ئەو هاواردەکەن وە لێرەوەیە کە "دووتاپەرستی"، ڕەگداکوتراوترین بنەمای فەلسەفی مرۆڤ، لە سەرەتاوە لە بڕوای ئەودا جێگای خۆی دەکاتەوە وە بە بەلاش نیە کە یەکێك لەو پڕۆژە سەرەتاییە کە کاڵ و گوماناوی یانەی کە لە مێشکی مرۆڤی سەرەتایی دا شێوەی پەیداکردووە، بیرۆکەی "جیهانی زێڕین" و "جیهانی زبر"- لە هەر زەمانێکدا بە ناوێك وە لە هەر هۆزێکدا بە شێوەیەك- هەمیشەو لە هەموو جێگایەك هەیەو بێقەراری لێرەو شەیدایی بۆ ئەوێ وە ئارەزوو و کۆشش بۆ نزیکبوونەوە لەو، لە دەرکەوتنی مێژووەوە تا ئێستا، جوڵێنەرترین دڵەکوتەو کۆششی گیانی ئەوی کە کۆمەڵەی ژیانی واتایی ئەون، دروستکردووە. لە ئاسۆی لوتکەی مێژووەوە، دەبینین کە مرۆڤ.

بەدوای دۆزینەوەی ڕێگایەکە بۆ "ئەولا"، دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوە، یان چاوی لە چاوی ڕۆژ بڕیوە وە یان لە بەرامبەر بڵێسەی ڕازدارو بێقەراری ئاگر دانیشتووەو ڕۆچوۆتە ناویەوە وە ئارەزووی "ڕزگاری" و سەرچاوەی "نیازی"، کە لیواو لێوە لە لێڕان و شەیدایی، لەگەڵ خۆی دەڵێتەوە چونکە، لە ڕووخساری ئەو سێ یانەدا، لە "نهێنی یە گوماناوی یەکانی" ئەو نیشتیمانە، ئاماژەیەکی خوێندۆتەوەو "ڕووناکی" یەکەی -کە لەگەڵ سروشتی کوێرو قوڕاوی ئەو ماڵە خاکی یەدا بە ناموێ زانیووە- بە سێبەرێك داناوە کە لە ئاسمانەکانی دیکەوە کەوتۆتە سەر ئەو ناوچە ساردو پەرتەوازەیە.

مرۆڤ، وون بووی ئەو خاکستانە نائاشنایە، کە خۆی لەژێر ئەو ئاسمانە بە کورت و نامۆیەکی گرفتار دیتوە، سەرتاپاو بە بەردەوامی، لە ڕێگای گەڕان بەدوای ئەو "بەهەشتە وون بووەی" خۆی -کە دەزانێت هەیە- بەلای هەر شتێکدا تێپەڕیوە کە نیشانەیەکی لەو تێدا دۆزیوەتەوە، بە پاڕانەوەوە کەوتۆتە سەر چۆکان و هەرکاتێك لەبارەی بێهودەیی ئەوەوە بەئاگاهاتۆتەوە بەبێ ئەوەی کە لە دڵنیایەکەی لەبارەی بوونی ئەو "نازانم کوێ یە" کەم و کورتییەك دەرکەوتبێت، بەبێ دواخستن بەدوای نیشانەیەکی تردا گەڕاوەو، لەو بەهەرلاڕاکردنە ماندوونەناسەدا، ئەوەی هەرگیز دانەمرکاوە، هاوارە بە ئازارەکانی ئەو گرفتارەی تەنیایی بووە کە ئێستاش بە بێئۆقرەیی دەست بە دیواری ئەو جیهانەدا دێنێت تا بەرەو دەرەوە دەلاقەیەك بکاتەوە.

ناکۆکی وەڵامەکان و جۆراوجۆری و دژیەکی ڕەنگدانەوەکان یەکیەتی دەردو نیاز لەبەرچاوی ئێمە دانەپۆشێت! هاوارە پەرێشان و پەشۆکاوەکانی گەلگەمێش لەژێر ئاسمانی سۆمەردا، هەوڵە ئەشکەنجاوی یەکانی بودا بۆ ڕزگاربوون لە "کارما" وە گەیشتن بە "نەیرەوانا: ڕووناکبونەوە"، ناڵە ئازاراوی یەکانی عەلی لە تەنیایی شەوە بێدەنگەکانی باغە خورمایەکانی دەوری مەدینە وە هەروەها تورەیی سەرکەش و بێ ئومێدی سارتەرو کامۆ لەبارەی "گەمژەیی و بێ مانایی ئەو جیهانە"، هەموویان ڕەنگدانەوەی جۆراوجۆری گیانی پەشۆکاوی مرۆڤێکە کە خۆی لەسەر ئەو خاکە بە تەنیاو بێگانە دەزانێ وە لەژێر ئەو بنمیچەدا بە زیندانی، وە دەزانێت کە "ئەو ماڵە ماڵی ئەو نیە".

بۆچی مرۆڤ، هەرکاتێك، دوور لە هاتوهاواری ڕۆژانەو باشتر لە ملکەچبوونی ژیان بەسەربردن، بیر لە خۆی و دنیا دەکاتەوە وە لە ڕامانە قوڵ و دڵەکوتە بەلەرەلەرەکان و خەیاڵە بڵندەکاندا نقوم دەبێت، پەنجە لەسەر دڵی دادەنێت و سێبەری خەمێکی نەناسراو دەکەوێتە سەر گیانی، وە دوور لە چالاکی و خۆشەویستی، لە تەنیایی غەمگینی خۆیدا دادەنیشێت، سەری بە دوو دەستەکانی دەگرێت وە "نیوە فرمێسکی یەو لەگەڵ خۆی گفتوگۆ" دەکات،

وە بە پێچەوانەوە، هەرچەندە لە ژیانی ڕۆژانەو پەستی ئەو جیهانە نیزیکتر دەبێتەوە، زیاتر ڕوو لە دەست و بردی و خۆشی و خۆشەویستی منداڵانەی کەروێشکانە دەکات؟ بۆچی هەموو کاتێك قوڵی بەرزی بارودۆخ و گیان و بیرو هونەر لەگەڵ غەم، وە گەمژەیی و پەستی و بێ واتایی لەگەڵ شادی دایە؟ بۆچی لە ڕۆژگاری ئەرستۆوە، یاسای نوسراو وایە کە لە هونەردا، ئەوەی قوڵ و جدی یە غەمناکە، وە ئەوەی سەرپێ ی و بێ ماناو پێکەنیناوی یە شادە؟ بۆچی مرۆڤەکان، وە ئەوەی کە مرۆڤترە زیاتر، بە مەبەستەوە، بەدوای بەرهەمی غەمهێنەردان وە غەمیان خۆشدەوێت؟ بۆ لەبەر ئەوە نیە کە غەم ڕەنگدانەوەی گیانێکە کە چونکە باشترو وریاترە، تەنگی و تەنگدەستی جیهان باشتر هەست پێدەکات؟ بۆچی مەستی و سەرخۆشی یان خۆشدەوێت؟ بۆ لەبەرئەوە نییە کە لەو بارودۆخەدا زۆربەی پەیوەندیەکانیان بەوەی کە ژیان پێویستی پێێن، دەپچڕێنێت وە باری گرانی بوون لەسەر گیان لادەچێت، پەستانی خنکێنەرو سەرزەنشتکراوی "بوون" سوك دەبێت وە تەنها لەو ساتە بێکێشانەدایە کەیادی تڵخی تەنیایی فەرامۆش دەکرێت وە ڕووخساری ناشیرینی "بوون" لەبەر چاوان نامێنێت؟ بۆچی گیانە بڵندو دڵە قوڵەکان، غەم، پایز، بێ دەنگی، خۆرئاوابوونیان خۆشتر دەوێت؟ بۆ لەبەرئەوەنیە کە لەو ساتانەدا خۆمان لە سنوری کۆتایی ئەو جیهانە نیزیکتر هەست پێ دەکەین ؟

مرۆڤ لە قوڵایی سروشتی خۆیدا، هەموو کاتێك لە ئارەزوی "ڕەها"، "بێ کۆتا"، "نەبڕاوەیی"، "ڕوناکی" "مانەوەو نەمری"، "بێ کاتی"، "بێ شوێنی"، "بێ سنوری"، "بێ ڕەنگی"، "دابڕانی ڕەها"، پیرۆزی"، "ئازادی بەرهەڵدایی ڕەها"، "یەکەمین دەستپێکردن"، "دوایین ئەنجام"، "مەبەستی ڕەها"، "تەواوی ڕەها"، "بەختەوەری ڕاستەقینە"، "ڕاستی ڕەها"، "دڵنیایی"، "ئەوین"، "جوانی"، "چاکەی ڕەها"، "باشترین باشی"، "پاکترین پاك"، . . . دابووە وە ئەو "منی" ڕاستەقینەو ئەهورایی یەی خۆی لەگەڵ ئەو واتا ئەودیویانەدا بە خزم زانیوەو وە زۆر نیازمەند بووە بۆ ئەوانە، وە ئەو جیهانە ڕێژەیی یەو

سنوردارو ڕووخساریی و ناوەندیی و پابەندو ناشیرین و ڕەنجهێنەرو پیس و ساردو دڵ پەرت و بەندەی ژێردەستی شوێن و کات و بڕیار بەسەرداداراو بەکەموکورتی و مەرگ، لەگەڵ ئەو بیرکراوە بەجۆشانەی گیانی بەرزەفڕی مرۆڤـ نائاشناو ناسازە. باشە ئەو واتایانە لەکوێوە هاتۆتە ناو دڵی مرۆڤـ؟ ئەو سەرچاوە سەرسوڕهێنەرە واتایی یانە_ کە بەردەوام لە قوڵایی گیانی مرۆڤدا دەجۆشێن _ لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ ئەو گیانە بێ ئۆقرەیە لە تینوێتییە هەو کردووەکان، لەو بیابانە سوتاوە کە لەودا جگە لە فریوی تراویلکە نی یە، ئازادبووە وە ڕێگای ماڵی خۆی لێ ون بووە.

بەو شێوەیەیە کە بەدبینی و نیگەرانی و سەرپێچی و خۆشەویستی بۆ هەڵاتن، لەسەرەتاوە، لەگەڵ سەرەتای ئەو زیندانە گەورەیەی خاکدا ڕواوەو وە لە قوڵایی ویژداندا "پەشۆکاوی" ماڵی داناوەو لەهەمان ئەو شاراوگەیەدایە کە ئەو سێ یە ڕەگدانەوەو هاوریێ ی بوو-ون، دەرکەوتووە:

ئاین ، عیرفان و هونەر:

ئاین کۆششی مرۆڤـە کە "لەگەڵ بووندا تێکەڵە" تاخۆی پاك بکاتەوە وە لە خاکەوە بگەڕێتەوە بۆ خوا، سروشت و ژیان کە بە "جیهان" دەزانێت، "پیرۆزی" پێ ببەخشێت وە بیکاتە "ڕۆژی دوایی"، پیرۆزی، بەووتەی دورکهیم، بەشی ئاینە و تایبەتمەندی گەوهەری ئەوە.

وە عیرفان ڕەنگدانەوەی بلێسەی سروشتی مرۆڤـ کە خۆی لێرە بە تەنیا دەزانێت وە لەگەڵ بێگانان، کە هەموو بونەوەرو زیندەوەرەکانن، هاومالْ. بازێکە کە لە قەفەسێکدا دیلە وە بەبێ ئۆقرەیی، خۆی بە دەرو دیواردا دەدات بۆ فڕین بێ قەرارەو، لە بیری نیشتیمان و خۆشەویستی خۆیدا، هەوڵدەدات کە بوونی خۆشی کە مایەی دیلی ئەوە وە "خود بۆتە پەردەی خۆی" لەناوبەرێت.

هەروەها هونەریش ڕەنگدانەوەی گیانێکە کە ئەوەی هەیە تێری ناکات وە بوون لە بەرامبەری خۆیدا بەکەم و ساردو ناشیرین وە هەتا، بە ووتەی سارتەر، گەمژە دەردەکەوێت بۆی! وە داڕنراوە لەماناو بێ گیان و هەستە وە ئەو

تڵخکامی و دڵفراوانی یەکی بەرزەفڕو بیریاری گەورەو سەرمایەداری ماناو هەست و زانستی هەیە کە لەناو کۆمەڵی خەڵکی بێ دەردو بێ گیان و پەست و قسە خۆشدا هاتووە وە خۆی لەگەڵ هەموو ئەوانی تر، جگە لە خۆی، بەتەنیا بۆ دەردەکەوێت وە لەگەڵ ئەو زەوی و ئاسمان و هەرچی لەو ناوەدایە نامۆ.

وە هونەر، زادەی دیدێکی ئاوا بێزارو هەستێکی ئاوا تڵخ لە بوون و ژیان، هەوڵدەدات تا ئەو تەواو بکات، ئەوەی "هەیە" لەوەی کە "دەبێت ببێت" نزیک بکاتەوە وە لە کۆتایدا، ئەوەی ئەو جیهانە نیەتی، پێی ببەخشێت.

ئاین و عیرفان لێرەوە ڕێگایان لە هونەر جیادەبێتەوە کە ئەو دووانە مرۆڤ لە تاراوگەوە بۆ نیشتیمانی خۆیان ڕێنوما دەکەن، لە "وەڕاستکەڕاو" دووری دەخەنەوە تا لە "ڕاستەقینە" نزیکی بکەنەوە. ئاین و عیرفان، هەردووکیان، بێقەرارین لێرە وە فەلسەفەی هەڵاتنن، ئەویان بۆ شوێنێك و ئەمیان بۆ "هەر شوێنێك کە ئێرە نیە"! بەڵام هونەر فەلسەفەی مانەوەیە، وە ئەو کاتە، چونکە دەزانێت کە ئێرە جێگەی مانەوە نیە، هەوڵدەدات تا بە "وێناکردنێك" وە، وەك دەڵێی، بە "بیرەوەری یەك" کە لەبارەی ماڵ و نیشتیمانی خۆیەوە وە ژیان بەسەربردن لەودا، ئێرەش وەك ئەوێ بڕازێنێتەوە وە بە داهێنانە هونەریەکان، زمان، دەنگەکان، شێوەو ڕەنگەکان، ئەو "نیشتیمانە نادیارو ناسیاو و جوانە" لەو "دیارە بێگانەو ناشیرنەدا"، لاسابکاتەوە وە لێرەدایە کە هونەر، هەروەکو ئەرستۆ دەڵێت، لاسایی کردنەوەیە (دراما) بەڵام بە پێچەوانەی قسەی ئەو، لاسایی کردنەوەی سروشت نیە بەڵکو، تەواو بە پێچەوانەوە لاسایی کردنەوەی ئەو دیوی سروشتە تا سروشت لەسەر شێوەی ئەو بڕازێنێتەوە.

هونەرمەندیش وەکو کەسی ئاینی یان عیرفان، ڕووخساری ئەو جیهانە لەگەڵ خۆیدا بە نامۆ دەزانێت بەڵام، بە پێچەوانەی ئەو دووانە، چونکە سۆراغی لە ناسیاو نیە، هەوڵدەدات تاوەکو بە ڕێنومایی ئەو "پێکەنینە شاراوەیە" کە خۆشەویستی و جوانی لەوەوە سەرهەڵدەدات وە بە ووزەی دروستکەرانەی خۆی، لەسەر ڕوخساری ئەو بێگانەیە، کە هەرچۆنێك بێت خۆی بەناچار بە ژیان

و لەگەڵ ئەو بوون دەزانێت، ڕەنگێکی ئاشنای پێ ببەخشێت و "زیندانی" خۆی وەکو "ماڵی"ی خۆی برازێنێتەوە. لەو ڕووەوە، هونەر ڕەنگدانەوەی ئارەزووی دروستکەرانەی مرۆڤە لە درێژەی ئەو بوونەدا کە درەوشانەوەی دروستکەریی خوایە تاوەکو ئەو کەموکورتیەی کە لەو جیهانەدا هەستی پێ دەکات پڕ بکاتەوە وە بەو شێوەیە بێزاری و بێ قەراری خۆی، لەو نوایەدا کە بۆ ئەویان درووستنەکردووە، کەم بکاتەوە و بەرگەی ژیان لەو تەنیایی و تێکەڵاوبوون لەگەڵ کۆمەڵی بێگانەکان بگرێ.

پیشەسازیش، وەکو هونەر، ڕەنگدانەوەی ئارەزووی دروستکەرانەی مرۆڤە بەڵام، بە پێچەوانەی هونەرەوە، لە هەستکردن بەتەنیایی وە دوو دڵی و نیگەرانی لە "ئەوەی هەیە" سەرچاوە ناگرێت بەڵکو، بەپێچەوانەوە، بۆ نیزیکبوونەوەو ڕاهاتنی زیاترە لەگەڵی، مەبەستی ئازادی نیە، بەڵکو دیلی زیاترە. هونەر دەیهەوێت ئەوە بۆ مرۆڤ فەراهەم بکات کە سروشت نیەتی وە پیشەسازی هەوڵدەدات تا ئەوە زیاتر بداتە مرۆڤ کە سروشت هەیەتی.

بەڵام هەر هونەرێك، هەتا لە پەسترین قۆناخەکانی دا: لاسایی کردنەوەو فرەجۆری، وە بەتایبەتی لە بەرزترین جۆرەکانی دا: مۆسیقاو شیعر وە هەرچەندە باشتربێت، زیاتر درەوشانەوەی "وێڵی" مرۆڤە کە لە کەموکورتی ئەو جیهانە"دەناڵێت" وە یان نیشاندەری داهێنانەکانی ئەوە تاوەکو ئەو "تەواو بکات. لەو ڕووەوە، ئاین و عیرفان "دەرگایەکن" بۆ دەرەوەی ئەو زیندانە وە هونەر "پەنجەرە"یەکە. بەگشتی" جوانی بە مایەی هونەر دەزانن وە بە پێوانەی ئەو وە دەڵێن هونەر ئامانجی پێشاندانی جوانیەکانە. ئەوقسەیە، بە تەواوی پوچ نەبێت، کە پوچە بەلایەنی کەمەوە گوماناوی یە وە لەهەمان کاتدا، ...وکاری، لە دۆخێکدا جوانیش بەرهەمێکی هونەریە کە هونەر، لەو جیهانەدا ... جوانی نیە، دروستی دەکات، ئەو گوڵە جوان نیە، ئەمن جوانیەکەی دروست ...م. هەروەکو چۆن وێنەکێش وێنەکەی وە شاعیر ئەویندارییەکەی وە ...انێك ئاوازەکەی دروستکردووە .

کێ یە کە بەڕاستی" نەزانێت کە لە پاکی فریشتە ئاسای سپێدە، لە زمزمەی جادوویی سەرچاوەکان، لە سرووەی پەیامهێنەری بەرەبەیاندا، لە چاوی پڕ لە خوێنی ڕۆژئاوادا، لە ئاوازی ئاسمانی شەبەقدا، لە چوڵەوانی نیوە شەوە ڕووناکەکانی تەنیشت باغە بێ دەنگەکان، لە خەمی ماندووی چاوێك لە تای خۆشەویستی، لە باوەشی مانگ و زۆنگدا، لە پێکەنین دا، لە تێروانین دا لە ڕۆژدا، لە گەمەی شاراوەو پڕ هاتوهاواری با لەسەر چڵە بەرزەکانی ڕۆژئاوا، لە ئاسۆدا، لە یەکەم ڕووناکی ڕۆژدا و لە هەرچی ئێمە لە خۆمان دەباتەدەر، ڕاست بە هەمان ئەندازەی قوڵیی، واتا، ڕازو جوانی دا شاراوەیە کە لە باڵای "گۆشت کوت"دا! وە هەتا لە هەمان درزی پڕ لە گۆشتی کوتراوی ماوەی شەو؟!.

ئەو بێچارەیە مرۆڤە کە دەیهەوێت دنیایەکەی ئاوا بێت وە ئاوا نیە. ئەوە کە خۆی لەو "کۆختە" تاریك و پەست و تەنگ و ناشیرنەدا بە گرفتار دەبینێ وە بە فریوی هونەر، ئەو وەکو "کۆشکێك" کە شایستەی "نیوە خوایەکی" وەکو ئەو دەڕازێنێتەوە. لەو ڕوانگەیەوە ، هونەر ،لە هەموو جۆرو هەموو قۆناغەکانی دا، ڕەنگدانەوەی پێویستی ئەو "نیوە خاك–نیوە خوا"یەیە، ئەو "کۆبوونەوەی دوو بێ کۆتایە"، ئەو "کۆبونەوەی ئەو دوو دژیەکە" لەوە دوودڵی خەم و ئەوین و بێقەراری و ناڕازی بوون و بێزاری یە پێداویستی بینایەکی لە شێوە دوو سەرەیە، کە سەرێکی، لە ڕەقی و بۆگەنی ئەو ماددەیە، ئەو مرداربووەدا نقوم بووە وە سەرەکەی تری، لە سنوری بوون تێدەپەڕێت و کات و شوێن _ئەو دوو چوار دیواریە تەنگ و خنکێنەرە_ تێکدەشکێنێت وە لەسەر ئاسمانی بڵندی هەتا هەتایی بوون، دوندی بڵندی فریشتەکان دەنوێنێت، ئەو شوێنەی کە وشەکان باڵ دەسوتێنن وە خەیاڵ لە نیوەی ڕێگا دەگەڕێتەوە.

هونەر – قەڵەمی دروستکراوی ڕۆڵەکانی ئادەم _ کە لە "بەهەشتەوە" هێنرایە "زەوی" _ تێدەکۆشێت تا زەوی ناشیرن و دڵتەنگ وەکو بەهەشتێك کە جێگەی شایستەی ئەو بووەو هەیە بڕازێنێتەوە هەر بەو شێوەیە کە لە ژیانی یەکەمی دا هەبووە، لەو ژیانەشی دا لە تاراوگە، کە ماوەی فەرمانبەسەرسەردادراوی

بەسەر دەبات _ وە ئەوەیان هەموو گوتووە _ بە شیعر بیر بکەنەوەو بلێن، بە مۆسیقا بیبیستن، بەسەما بڕۆن، بە وێنە ببینن، بە هێزی وێکچواندن ئەوەی لە سروشتدا بێ حاڵ و بێ تونایە گیانی بەبەردا بێت وە، بە وزەی خوازە ئەوەی کە نیەتی بیبەخشێت، بە زمانی توانج پۆشی و هێما، لە وشەکان کە شتی بێ گیان و بێ توانای ئەو جیهانەن، ئەوەی کە ئەوان نیانەو ئەو دەیهەوێت، دەربکێشێت، بە سەرە پەنجەی مەسیحای وێناکردن، بە هەموو شتەکان _ کە دراوسێی مردوو و تاریك و گەمژەو بێگانەی ئەون _ ژیان و زمان و هەست و ئاشنایی یان پێ ببەخشێت وە لە ڕوخساری نائاشنای زەوی و ئاسمانی گێل ئەو کۆمەڵە کۆکراوەیە لە توخمەکان، ڕەنگی هوگری و واتاو هەست و خزمایەتیان لێ بدات.. چونکە لە ڕوخساری سروشتداو لە ئەوەی لە ناویدایە، هیچ کاتێك هاودەردی و هاوشێوەی بۆ خۆی نەدۆزیەوە وە هاودەردی و خزمایەتی تینوترین نیازی گیانی مرۆڤن. ئاسمانی ساف و ئەستێرەو باران و پڕ لە ئارامی نیوەشەوێکی هاوین، ئاسمانێکی ئاسوودە وە بێ دەردە وە گیانی شڵەژاو و گیراوی "تینتۆریت (وێنەکێشی ئیتالی ١٥١٨-١٥٩٤" ئاسمانی گیراو و شڵەژاوی دەوێت، ئاسمانی ئاوی نا بەڵکو زەرد! وە ئەو جیهانە ئاسمانێکی زەردی نیە کە شڵەژاوی بنێرێت، تینتۆرێت لەسەر "گیل گلسا: شوێنێکە لە دەرەوەی ئۆرشەلیم کە دەڵێن عیسای لێ لە خاچ دراوە" ئاسمانێکی زەرد دروست دەکات. هەوڵەکانی "پیکاسۆ" بۆ ئازادکردنی هونەر لەبەندی لاسایکردنەوەی سروشت، نیشانەیەکی ڕوونە لەسەرپێچی لە سروشتی هەر هونەرێکدا، وە دەرەوشانەوەی شڵەژاویی گیانێکە کە کەموکورتی سروشت لەبەرامبەر نیازە بڵندەکانی خۆیدا دەردناکانە هەست پێ دەکات بە ووتەی "سارتەر"، پیکاسۆ هەوڵدەدات تا قوتویەکی گوگردی دروست بکات کە لەهەمان کاتدا، فیشەکی ڕووناککەرەوە بێت بەبێ ئەوەی لە قوتوی گوگردی دەربچێت. بۆچی! چونکە سروشت لە کۆمەڵدا دوو دژی بێ توانایە وە مرۆڤ نایەوێت ئەو بێ توانایی یە قبوڵ بکات .

## ♣ ئیبراهیم لە کێشمەکێشی هەڵبژاردنێك دا

**دوای شکاندنی دوایین بت بێ ڕاوەستان قوربانی بکە!**
**ئێستا تۆ لە مینای ئیبراهیمی و ئیسماعیلت هێناوە بۆ قوربانگا،**
**ئیسماعیلی تۆ کێ یە؟**
**چی یە؟**
**پلەو پایەتە؟ ئابرووتە؟ پۆست و پیشەکەتە؟ پارەکەتە؟ خانووەکەتە؟ باغەکەتە؟ سەیارەکەتە؟ خۆشەویستەکەتە؟ بنەماڵەکەتە؟ زانستەکەتە؟ پلەکەتە؟ هونەرەکەتە؟ ڕوحانی یەتتە؟ جلو بەرگەکانتە؟ ناو و نیشانتە؟ گیانتە؟ گەنجێتی تە؟ جوانیتە؟ ...؟**
**من چوزانم؟ تۆ بۆخۆت ئەوە دەزانی، 'تۆ بۆخۆت دەبێت ئەو' –هەرچی یان هەر کەسێکە– دەبێت بێنی بۆ مینا و بۆ قوربانیکردن 'هەڵیبژێری'، من تەنیا دەتوانم نیشانەکانیت پێ بڵێم:**
**ئەوەی تۆ 'لە ڕێگای بڕوا' دا لاواز دەکات: ئەوەی کە 'داوات لێدەکات بمێنیەوەو نەڕۆی': ئەوەی کە تۆ 'لە ڕێگای بەرپرسیاری دا دەخاتە گومانەوە': ئەوەی تۆی 'بەخۆیەوە بەستۆتەوەو هێشتویەوە': ئەوەی کە 'دڵبەستنت پێیەوە نامێڵێت کە پەیامەکە ببیستی' وە کە دان بە ڕاستی دا بنێ ی: ئەوەی داوای هەڵاتنت لێدەکات: ئەوەی کە تۆ بەرەو ئاراستەکردن و لێکدانەوەی بەرژەوەندی ویستی**

ڕادەکێشێت، وە خۆشویستنی کوێر و کەڕت دەکات: تۆ ئیبراهیمێکی وە خاڵی لاوازت کە ئیسماعیلەکەتە تۆ دەکاتە یاری شەیتان. لە لوتکەی بەرزی ڕێز دای وە سەرتاپا شانازی و چاکەی، لە ژیانت دا تەنیا یەك شت هەیە کە بۆ بەدەستهێنانی 'لە بڵندی یەوە دێیە خوارەوە': بۆ لەدەست نەدانی هەموو دەستکەوتەکانت لەدەست دەدەی، ئەوە ئیسماعیلی تۆیە: دەکرێت ئیسماعیلی تۆ کەسێك بێت یان شتێك بێت، یان دۆخێك و هەلومەرجێك، وە یان هەتا خاڵێکی لاوازت!

بەڵام ئیسماعیلی ئیبراهیم کوڕەکەی بوو!

پیاوێکی بەتەمەن لە کۆتایی تەمەنی دا، دوای سەدەیەك ژیانی پڕ کێشمەکێش و پڕ بزوتنەوەو، هەموو ئاوارەیی و جەنگ و تێکۆشان و هەوڵدان و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ نەفامی گەلەکەی و ستەمی نەمرود و دەمارگیری بەڕێوەبەرە بت پەرستەکان و پوچی یەکانی ئەستێرە پەرستی و ئەشکەنجەی ژیان. لاوێکی ئازادیخواز و ڕووناك و سەرکەش لە ماڵی باوکێکی دەمارگیر و بت پەرست وە بەڵکو بت تراش! وە لە ماڵی دا ژنێکی 'دەمارگیری' خانەدان: سارا، وە ئێستاش لەژێر باری سەنگینی پەیامی یەکتاپەرستی دا لە ڕژێمی ستەم و نەفامی و هاوبەشی پەیداکردن دا، وە بەرگەگرتنی سەدەیەك ئەشکەنجەی بەرپرسیاریەتی ڕۆشنگەری و ئازادی لە چاخی تاریکی دا وە لەگەڵ گەلێك کە خووی بە ستەمەوە گرتووە، پیر بووە. وە بە تەنیایی 'لەوپەڕی لوتکەی بڵندی پێغەمبەرایەتی دا' دیسان وەك مرۆڤ ماوەتەوە وە لەکۆتایی پەیامی مەزنی خوایی خۆیدا بەندەیەکی خوایە کە پێ ی خۆشە ڕۆڵەیەکی هەبێت.

خوا ڕۆڵەیەکی پێدەبەخشێت 'ئەویش ئیسماعیل'

ئیسماعیل بۆ ئیبراهیم تەنیا کوڕێك نەبوو بۆ باوکی،

کۆتایی تەمەنێك چاوەڕوانی بوو،

پاداشتی سەدەیەك ڕەنج بوو،

میوەی ژیانێکی پڕ ڕووداو بوو،

تاکە کوڕی لاوی باوکێکی پیر بوو،
بەڵێنێکی خۆشەویست بوو دوای نائومێدی یەکی تاڵ،
بۆ ئیبراهیم ئیسماعیل بوو. 'ئیسماعیلی تۆ' دەکرێت بۆخۆت بی، دەکرێت بنەماڵەکەت بێت، دەکرێت پیشەکەت، سامانەکەت، ڕێزو پایەت...چوزانم؟ بۆ ئیبراهیم 'کوڕەکەی بوو'، ئەویش کوڕێکی ئاوا بۆ باوکێکی ئاوا!
ئێستا، لە بەرامبەر چاوەکانی باوکی –چاوێك کە لەژێر برۆ سپی یەکانی کە لەسەریانن لە 'شادی' دا دەدرەوشێنەوە– دەڕوێت وە لەژێر بارانی لاواندنەوەو خۆری ئەوینی باوکێك کە گیانی بە جەستەی ئەوەوە بەندە گەورە دەبێت، وە باوك وەکو باخەوانێك کە لە بیابانی فراوان و سوتاوی ژیانیدا چاوی بڕیوەتە تاقە نەمامی گەش و تازەی، هەروەکو بڵێی ڕووانی ئەو دەبینێت وە لاواندنەوەی ئەوین و گەرمای ئومێد لە قوڵایی گیانیدا هەست پێدەکات.
لە تەمەنی درێژی ئیبراهیم دا، کە هەمووی لە سەختی و مەترسی دا تێپەڕیوە، ئەو ڕۆژانە، ڕۆژەکانی کۆتایی ژیان –کە بە وتەی ئاندرە ژێد کە دەبێت هەر ساتێکی بە چێژەوە بنۆشی– بە چێژی هەبوونی ئیسماعیل تێدەپەڕێت. کوڕێك کە باوکی سەد ساڵ چاوەڕوانی هاتنی بووە، وە کاتێك کە هاتووە باوك چاوەڕوانی هاتنی ئەوی نەکردووە!
ئیسماعیل ئێستا بۆتە نەمامێکی بەپیت، لاوێك کە گیانی ئیبراهیمە، تاکە میوەی ژیانی ئیبراهیمە، تەواوی ئەوین و ئومێد و چێژی پەیوەندیدارە بە ئیبراهیمەوە!
ئیبراهیم بە دوو دەستەکانی خۆت چەقۆ لە گەردنی ئیسماعیل بنێ و بیکوژەوە!
بۆ دەکرێت بە وشە تۆقانی ئەو باوکە لەکاتی هاتنی ئەو پەیامەدا وەسف بکرێت؟ هەتا ئەگەر لەوێ بواین و بینیباشمان تەواو هەستمان نەدەکرد، ئەندازەی ئەو دەردە لە خەیاڵدا ناگونجێت!
ئیبراهیم بەندەی گوێڕایەڵی خواو مرۆڤی سەرپێچیکاری مێژووی ئادەمیزاد، بۆ یەکەمین جار لە تەمەنی درێژی دا، لە ترسان دەلەرزێت، قارەمانی پۆڵاینی پەیام

دەتوێتەوە، بت شکێنی مەزنی مێژوو تێکدەشکێت: لە وێناکردنی پەیامەکە دەتوێت بەڵام فەرمان فەرمانی خوایە.

جەنگ! مەزنترین جەنگ 'جەنگ لەناو خوددایە'، گەورەترین تێکۆشان!

سەرکەوتووی مەزنترین جەنگی مێژوو ئێستا 'شکستخواردوو و لاواز و ترساو و پەرێشان و بێچارەیە!

جەنگ، جەنگی نێوان خواو ئیسماعیلە لە ئیبراهیم دا.

دژواری هەڵبژاردن!

کەمەیان هەڵدەبژێری؟ ئیبراهیم!

خوا یان خۆت؟ سود یان بەها؟ پەیوەندی یان ڕزگاری؟ بەرژەوەندی یان ڕاستی؟ مانەوە یان ڕۆیشتن؟ خۆشبەختی یان تەواوی؟ چێژ یان بەرپرسیاریەتی؟ ژیان لەپێناوی ژیان دا یان ژیان لەپێناوی ئامانج دا؟ پەیوەندی و ئارامیی یان بڕواو تێکۆشان؟ غەریزە یان شعور؟ سۆز یان بڕوا؟ باوکایەتی یان پێغەمبەرایەتی؟ پەیوەندیی یان پەیام؟ و...

وە لەکۆتاییدا، ئیسماعیلەکەت یان خوایەکەت؟

هەڵبژێرە! ئیبراهیم.

لە کۆتایی سەدەیەك پەیامی خوایی لەناو خەڵك دا، تەمەنێك پێغەمبەرایەتی و یەکتاپەرستی و پێشەوایەتیکردنی خەڵك و تێکۆشان لەدژی هاوبەشی پەیداکردن بۆ خواو بنیادنانی یەکتاپەرستی و شکاندنی بت و لەناوبردنی نەفامی و سەرکوتکردنی لەخۆبایی بوون و مەرگی ستەم و لە هەموو بەرەکان سەرکەوتن و لە هەموو بەرپرسیارییەتی یەکان دا سەرکەوتوو بوون و، لە هیچ شوێنێك لەبەر خاتری خۆت خۆ دوانەخستن و لە ڕێگادا هەنگاوێکیش لەبەر خۆت لەڕێ-لانەدان و لە هەموو مرۆڤێك بوونە خوایی ترو دامەزراندنی نەتەوەی یەکتاپەرست و بەرەوپێش بردنی پێشەوایەتی مرۆڤ و لە هەموو شوێنێك و هەموو کاتێکدا زۆر باش بوون لە تاقیکردنەوەو... لەخۆت بایی نەبی، کەموکورتیت تێدا دەرنەکەوێت، وانەزانی کە قارەمانی بێ شکستی، بێ

لاوازی: سەرکەوتنەکانی سەد ساڵ تێکۆشان فریوت نەدەن، خۆت لە کەوتن بە پارێزراو نەزانی، خۆت لە وەسوەسەی دێوەکان بە پەنادراو نەزانی: لە بەرامبەر ئەو دەستە نادیارانەی کە هەموو کات مرۆڤ-بوون دەکەنە ئامانج خۆت بە شکست-نەدراو هەست پێ نەکەی، چاوەکانت ڕێگای چوونە ناوەوەی تیرە ترسناکەکانن، وانەزانی کە ڕۆستەمت پیر و جیهانگیر کردووە، سیمورغی ئەفسانەیی تۆ لەخۆت باشتر دەناسێت، دەزانێت کە ئێستاش هەر دەکرێت زیانت بەربکەوێت، شت دەتوانێت بێتە ناوتەوە، سەرتاپات لە جلوبەرگی پۆڵایین دایە وە پێت وایە کە ناتواندرێت شکست-بدرێیت. تۆ نازانی وە ئەو دەزانێت کە هێشتاش کەلێنێك هەیە کە بێتە ناوەوەو بە تیر تۆ بپێکێت، بریندار و ژەهراویت بکات، چونکە ئێستاش چاوت بە جیهانەوەیە، دەتپێکێت، کوێرت دەکات: ئەی هێزی جەستەم لەو شوێنەوە کە پەیوەندیت بە جیهانەوە هەیە بە هەمان تاڵ کە بە دنیا بەستراویەوە، لە هەمان پەنجەرەوە کە سەیری دنیا دەکەی، جیهانت لەبەر چاوان ڕەش دەکات، ئەی قارەمان کە وەستاوی و سرودی سەرکەوتن دەخوێنی! لەناوت دەبات، لەگەڵ خاك و خوێن تێکەڵت دەکات، سیمورغ لەگەڵ ڕۆستەمی ناو داستانەکە هاودەست و هاوداستانە بۆ هەرەسهێنانی تۆ.

ئەی ئیبراهیم! قارەمانی سەرکەوتووی پڕشکۆترین نەبەردی مێژوو! ئەی هێزی جەستە، پۆڵای گیان، ئەی پێغەمبەری ئولول عەزم، پێتوانەبێت کە لە کۆتایی دا سەدەیەك پەیامی خوایی گەیشتوویە کۆتایی! لە نێوان مرۆڤ و خوادا هیچ دووری یەك نی یە، خوا لە مرۆڤ لە شادەماری ملی نیزیکترە لیێ ی: بەڵام ڕێگای مرۆڤ تا خوا بەئەندازەی هەتا هەتایەیە، بێ کۆتایە! پێت وایە چۆنە؟

تۆ پەیامکەت گەیاندۆتە بڵندترین لوتکەی تەواوی، بەڵام لە بەندایەتی دا ئێستاش کەمیت هەیە ئەی خۆشەویستی خوا! ئەی بنیادنەری یەکتاپەرستی لەسەر زەوی، ئەی ڕێگا خۆشکەری موسا و عیسا و محمد! ئەی دیمەنی شکۆ

سەربەرزی و تەواوی ئادەمیزاد! بوو–ویت بە ئیبراهیم، بەڵام بوون بە بەندە دژوارترە! دەبێت بەرەهایی ئازاد ببیت، ببی بە ئازادی رەها!

سرودی سەرکەوتن مەخوێنە، چونکە ئادەمیزاد لە لوتکەش دا هەمیشە لە مەترسی کەوتنەخوارەوە دایە، وە کەوتنەخوارەوەی ئەوەی زیاتر سەرکەوتووە، مەترسی دارتر و کارەسات ترە!

ئیسماعیلەکەت بکوژەوە!

بە دەستەکانی خۆت بیکوژەوە!

رۆڵە خۆشەویستەکەت، میوەی دڵت، جەرگت، رووناکی چاوت، بەرهەمی تەمەنت، هەموو پەیوەندەکەت، چێژەکەت، بەهانەی بوونت، هەموو ئەوەی کە تۆی بە ژیانەوە بەستۆتەوە، لەو دنیایە هێشتوویەوە، واتای بوون و ژیان و مانەوەت، کورەکەت، نــا، ئیسماعیلت، وەکو مەرێك بکە قوربانی، بۆخۆت بیگرە و لەسەر خاك درێژی بکە، دەست و پێ یەکانی لەژێر دەست و پێ یەکانت توند دابگرە، تاوەکو دەست و پێ یان رانەوەشێنێت، موی سەری بە چەنگت بگرە و سەری توند بگرە، و بۆ زەوی دایگرەو بۆ دواوە بیچەمێنەوە تاوەکو شادەماری ملی دەرکەوێت، وە یاری بە رۆخی پۆڵاییی چەقۆ نەکات. پێستی گەردنی خرنەبێتەوە و قوربانی یەکە ئەزیەت نەدات! شادەمارەکەی ببڕە، لەژێر پێ یەکانت بیهێڵەوە تاوەکو هەست دەکەی هیچی تر دڵی لێنادات، ئەو کاتــە لەســەر لاشــەی ســاردی قوربــانی یەکــەت هەســتە، راوەســتە، ئــەی خۆبەدەستەوەدەر بۆ راستی، بەندەی خوا!

ئەوەیە کە راستی داوات لێدەکات. ئەوەیە بانگەوازی برِوا، پەیامی نامەکە، ئەمە بەرپرسیاریەتی تۆیە ئەی مرۆڤی بەرپرس! ئەی باوکی ئیسماعیل.

ئێستا ئەوە ئیبراهیمە کە لە کۆتایی رێگای پێغەمبەرایەتی دا گەیشتۆتە دوو–ریانێك: سەرتاپای بوونی هاوار دەکات: ئیسماعیل!

وە خوا بەسەریدادەدات: سەر ببڕە!

دەبێت هەڵببژێرێت!

**ڕاستی و سود لەناو ئەودا لەگەڵ یەك لە جەنگ دان، سودێك کە بە گیانیەوە بەستراوەتەوە، وە ڕاستی یەك کە بە بڕوایەکەیەوە بەستراوەتەوە!**
**ئەگەر ڕاستی مەرگی خۆی ویستبا، ئاسان بوو، ئیبراهیم چەندین ساڵە کە لە ڕێگای ڕاستی دا لە گیانی خۆی بوراوە، وە هەر ئەوەش ئەوی دڵنیا کردبوو کە: بۆتە بەندەی ئازادی ڕاستی، وە ئەمەش بۆ ئیبراهیم جۆرێك خۆ-ویستنە، لاوازی یە.**
**ئەوەی بۆ گیانە جوان و مرۆڤە باشەکان باش و جوانە، بۆ ئیبراهیم -کە گیانی خوایی و مرۆڤی خوایی یە- ناشیرن و خراپە.**
**ڕێژەیی بوونی ڕەوشت لە مەکتەبی ئیبراهیم دا ببینە کە چۆنەو تا کوێ یە؟!**
**ئەی ئەوەی لە گیانی خۆت بوراوی، لە ئیسماعیل ببورە!**
**دوو-دڵی،**
**چەند گیان ستێن! چەند مەترسیدار!**
**وە لە ئەنجامدا، ئاراستەکردن!**
**کاتێك کە ئادەمیزاد بڕوایەکەی بانگی دەکات وە دڵی نایهەوێت!**
**بەرپرسیاریەتی داوای لێدەکات کە دڵ هەڵگرێت لەسەر ئەوەی کە بەئاسانی لە دڵدا هەڵناکەندرێت، وە ئەویش ڕێگای هەڵاتن دەدۆزێتەوە:**
**وە خراپتریش لە ئاراستەکردنە هەڵەکان ئاراستەکردنە ڕاستەکانن! واتا بە پشت بەستن بە ڕاستی یەك، پێشێلکردنی ڕاستی یەکی تر!**
**وە چەندە کارەساتێکی گەورەیە کە پوچ بە دەستێك عەقڵ دەکاتە شمێر، وە بە دەستێك شەرع بکاتە سپەر!**
**لەو دۆخەدایە کە قورئان دەبێتە ئاڵای هاوبەشی پەیداکردن وە عەلی چەك دەبێت!**
**وە نەتەوەی حوسێن دوچاری چارەنوسی یەزید دەبێت!**
**ئاراستەکردن!**
**وە خراپترین جۆری: ئاراستەکردنی ژیرانە!**

وە کارەسات هێنەرترینیشی: ئاراستەکردنی شەرعی!

هەڵاتن لە بەرپرسیاریەتی!

- ئیسماعیلەکەت بکوژەوە!

- چۆن بزانین کە لەو دەستەواژەیەدا ویستراوە هەمان واتا ببەخشێت کە ئێمە لێ ی تێدەگەین؟

- چۆن بزانین کە مەبەست لە وشەی 'بکوژەوە' واتای ناو فەرهەنگیی وشەکە بێت و بەواتایەکی تر بەکارنەهاتبێت؟ هەروەکو بۆ نمونە دەڵێن: 'نەفست بکوژە': کە مەبەست ئەوەیە خۆت لە وەسوەسەی نەفست بپارێزە. یان 'بەندەی نەفست مەبە': یان 'بمرن پێش ئەوەی بمرن': 'مردن' لە دووەمجاردا بە واتای راستەقینە بەکارهاتووە وە لە یەکەمیاندا بەواتایەکی تر بەکارهاتووە، مەبەستەکەی ئەوەیە کە 'بە ویستی خۆتان خۆتان بمرێنن' وە واتا خۆپەرستی لە خۆتان دووربخەنەوە، کەواتە سەلمێندرا کە لێرەدا باسکردنی 'مردن' بە واتای 'مردن' نیە.

- چۆن بزانین کە جێناوی 'ت - تۆ' کە بۆ 'ئیسماعیلەکەت' زیادکراوە بەتایبەتی بۆ من بگەڕێتەوە، وە لەو دواندنەدا دوێندراو من بم؟ چۆن بزانین کە لێرەدا دواندنەکە دواندنێکی گشتی نیە؟ کە بۆ گواستنەوەی واتایەکی تر ڕوو لە دوێندراوی تایبەتی کراوە؟ چونکە ئەوە لە زانستەکانی واتاسازی و وشەدا گونجاوەو دەکرێت چەند نمونەیەکی لەو جۆرە لە ئایەتەکان و فەرمودەکان و شیعری شاعیراندا وەك بەڵگە بێنینەوە.

- چۆن بزانین کە لە بنەڕەت دا مەبەست لە وشەی 'ئیسماعیل' هەر ئەو 'ئیسماعیل' ی کوڕی من بێت؟ لەوانەیە خوازەی تێدابێت بۆ واتایەکی تر، ئاماژەیەکی تری هەبووبێت، دەکرێت وشەی 'ئیسماعیل' ناوی واتایەك بێت یان ئاوەڵناوێکی دروستکراو بێت وە دوور نیە کە واتایەکی تری زمانی هەبێت وە لەو دەستەواژەیەدا وەکو ناوێکی تایبەتی بەکار نەهاتبێت.....؟

– چۆن بزانین کە لە دیارخستنی 'ئیسماعیل بکوژەوە'، وشەی 'ئیسماعیل' دیارخراو نیە کە لەشوێنی دیارخەر داندراوە، وە دیارخەر بە لێکچواندنی ئەقڵی لابردراوە، وە ئەو یاسایە لە زمانی عەرەبی دا باوە وە لە وشەکانی خواش دا هاتووە، وەکو :'لە گوندەکە بپرسن'، واتا 'لە خەڵکی گوندەکە بپرسن'. وە لێرەشدا مەبەست لە 'کوشتنەوەی ئیسماعیل'، 'بڕینی پەیوەندی و خۆشەویستی لەگەڵ ئیسماعیل' بێت.

– ئەگەر هەموو ئەو ئەگەرە جۆراوجۆرانە ڕەتبکەینەوە، واتا کە هەموو ئەگەری هەموو ئەو واتایانە بە نەگونجاو دابنێین، وە فەرمایشتی خوا بەو جۆرە دابنێین کە لە یەکەم جار واتایەکەی بە مێشکی بیستەر دەگات، وە هیچ یەکێك لەو واتایانە بۆ هیچ یەکێك لەو وشانە دانەنێین، چۆن بزانین کە کاتی جێبەجێ کردنی فەرمانەکە و دارشتنی فەرمانی خوای مەزن ئێستایە؟

لە دەقی ئەو فەرمانەدا، کاتی کارکردن بە فەرمانەکە دیاری نەکراوەو سنوری بۆ دیاری نەکراوە، وە ئەوەش بنەمایەکی ئەقڵی بەڵگەنەویستە کە ئەوەی شەرع دیاری نەکردووە وە لە سروش دا بە دەق ئاماژەی بۆ نەکراوە، بۆ ئەنجامدانی پشت بە ئەقڵ دەبەسترێت: وە پێویستە کەسەکە ئەو بابەتە لەسەر بنەمای خواستەکان و بەرژەوەندی یەکان و هەلومەرجەکانی کات و شوین و توانایەکان و هۆکارو پێداویستی یەکانی بەردەست هەڵبژێرێت! هەروەکو چۆن لە کتێبدا 'فەرمانی تێکۆشان هاتووە'، بەڵام شێوەی تێکۆشان لەلایەن تاکەکانەوە بەگوێرەی بارودۆخ و هەلومەرج و خواستەکان ئەقڵ دیاری دەکات: وە یان لە فەرمودەدا 'فەرمان بە ویستنی زانست کراوە' وە ویستن و گەڕان بەدوای زانست دا لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویست کراوە، وە هەموو کەسێك پێویستە جێبەجێ ی بکات، بەڵام هیچ کەس نەبەستراوەتەوە بەوەی کە دەست بەجێ دوای ئەوەی ئەو واجبەی خرایە سەر شان دەست بکات بە ویستن و گەڕان بەدوای زانست دا، وە ئەگەر لە ساتەکانی کۆتایی تەمەنیشیدا بێت کە لە پێخەفی سەرەمەرگ دایە وە نیوە–گیانی لەبەردایەو کەوتووە، ئەو واجبە ئەنجام

بدات، ئەوا پەیڕەوی لە فەرمانەکە کردووە: وەکو فەرمانی حەج کردن، چونکە حاجی نابەستێتەوە بە کاتێکی دیاریکراو لە تەمەنی دا، بۆیە حەج بەجێدێڵن بۆ کاتێك کە زۆربەی ژیانی خۆیان ئازادانە بەسەربردووە، وە پێیان وایە لەڕووی شەرعیشەوە کێشەی نیە چونکە ئەوە قەرزێکە کە دەبێت لە گەردەنی خۆتی بکەیەوە، وە هەرکاتێك لێتکردەوە، لێتکردەوە: چونکە ئەو موسڵمانە لە ڕۆژی دوایی دا بەرپرسە بەرامبەر ئەنجامدانی حەج، نەك لە دنیا دا، وە پێ ی وایە کە یاسایەکانی شەرع بۆ بەدەستهێنانی چاکەو پاداشتە لەدوای مردن، نەك وانە- وەرگرتن و گەیشتن بە تەواوی و فێربوون و پەروەدەبوون و بیرکردنەوە و هەستکردن لە ژیانی پێش مردن دا.

چۆن بزانین کە لە بنەڕەتدا ئەو کردارەی 'ئیسماعیل بکوژەوە!'- کرداری داخوازی دانانی یە؟ بەڵکو بە ئەگەری بەهێز وە ئەگەرێك کە دڵنیایی لەبارەوە هەیە، گونجاوە کە کردارێکی ڕێنوماکارانە بووبێت، بەو بەڵگەیەی کە وەکو ئایەتی 'زەکات بدەن' نیە کە خەڵك بەرپرس بن لەوەی کە دەست بەجێ زەکات بدەن چونکە داخوازی یەکە لە سەرەوە کراوە، وە فەرمانی خوایە بەسەر بەندەکەیدا کە دانانەکەی -واتا ئەنجامدان و دروستکردنی- واجبە وە دەستبەجێ دەبێت پەیڕەوی لێ بکرێت.....

لەسەر ئەو بنەمایە، ئەگەر ئەگەر و شیکردنەوەو لێکدانەوەکانی تریش ڕەت بکەینەوە، ئەوەی دڵنیایە ئەوەیە کە مەبەستی خوای یەکتا لەو فەرمانە ئەو خاڵەیە کە: لە بنچینەدا لە پلەی بەندایەتی و پەیڕەویکردنی خوایی دا پەیوەندی و خۆشەویستی بۆ ڕۆڵە هیچ نیە، وە ئەو واتایەی بەدەست دێت لەو ڕاستی یە هەمەکی یە ئەوەیە کە: لەبەرامبەر خوادا دەبێت بەڕەهایی یەکلاببینەوەو بەتەواوی خۆبەدەستەوە بدەین و لە هەموو شتێك ببورین وە خۆشەویستترین پەیوەندی ژیان نابێت ببێتە ڕێگر لەبەردەم پەیوەندی لەگەڵ ڕاستی و هۆکاری دوورکەوتنەوە لە ڕاستی، چونکە پەیوەندی و خۆشەویستی بەهێز بۆ ڕۆڵە بەندە سەقاڵی خۆی دەکات و لە یادی خوا دایدەبڕێت، وە

ئیسماعیل بۆتە جێ ی خۆشەویستی بەهێزی ئیبراهیم، لە زمانی سروش دا بە وشەی 'بکوژەوە' نەهی لەو خۆشەویستی یە کراوە، وە مەبەست لەو نەهی یەش، هەم نەهی یەکی ڕێنوماکەرە: واتا سەرنجراکێشانی ئیبراهیمە بۆئەوەی کە خۆشەویستی بەهێزی تۆ بۆ ئیسماعیل ڕێگری لەوە دەکات کە گیان و دڵت بەتەواوی بۆ ئەوینی خوا تەرخان بکەی وە بێجگە لەو هیترت خۆش بوێت- هەروەکو لە پێشتر سەلمێندرا- مەبەست لە 'کوشتنەوەی ئیسماعیل'، کوشتنەوەی خۆشەویستی یە بۆ ئیسماعیل وە ئەمەش هەمان واتایە کە لە ئایەتی 'انما اموالکم و اولادکم فتنە' دا بەشێوەی هەواڵی هاتووە.

- وە سەرەڕای ئەو هەموو لایەنە ئەقڵی و شەرعی و گەڕانەوە بۆ ئایەتەکان و فەرموودەکان و بەڵگەهێنانەوە بە تەرازووی زانستی وشەو ئوسول و گەواهی دان بە بەڵگەی ئەقڵی و نەقڵی... بەپێ ی ئەو پێوەرانەی کە ئێمە لەبەر دەستماندایە، لە بنەڕەتدا ئەو کارە پێچەوانەی شەرعی ڕوونە!

کەواتە، قەت ناتواندرێت فەرمان بە هەڵەو کرداری قەدەغەکراو بدەینە پاڵ خوای یەکتا.

بەڵێ ئاراستەکردن! دۆزینەوەی ڕێگای هەڵاتن کاتێك بەرپرسیاریەتی سەنگین دەبێت و ناسازگار دەبێت لەگەڵ ئەوەی دڵی مرۆڤ دەیهەوێت. بەڵام کاتێك کە ڕاستی هاوئاراستەیە لەگەڵ ژیان دا، زۆر خەڵك ڕاستی یان دەوێت، دەکرێت ڕاستی بە ئەنجامدانی کاری چاکەو هاوکات لەگەڵ کارو کاسبی و بازار و ژیانێکی باش و خۆش و بێ مەبەست و بێ دەردەسەری ڕازی بکەن. وە کاتێك ڕاستی دێتە سەر ڕێگای ژیان، وە ڕاستی بۆخۆی دەبێتە دەست مایەو سەرمایەی کار و نان و ئاو هێنەر، وە لە ئەنجامدا دەبێتە پیشەیەکی ڕەسمی و ڕووخسەتی کاسبی کردن و نان و ئاو و ناوبانگ بە خەڵك دەبەخشێت، ئەو کاتە هەموو دەبن بە ڕاستی پەرست و بڕواداری دەمارگیر، وە هەموو ئارەزووی ئەوە دەخوازن کە ببن بە سەرچاوەی خزمەتگوزاری و خاوەن کاریگەری.

بەڵام کاتێک ڕاستی ڕووبەڕووی ژیان دەوەستێت و ڕاستی-ویستی دەبێتە هۆکاری ئەزیەت و دەردەسەری و زیان و مەترسی...وە بەرپرسیاریەتی یەک دەخاتە سەر شان کە سەخت سەنگینە وە ڕێگا ڕوو لەسەرەوەیەو گرد و بەردەڵانە و تاشە بەردەکانی بەسەردا دەکەونە خوار و کەمینی زۆری لەیاسا یاخیبووەکانی لێ یە، وە هەوا زریاناوی یەو ڕەشە شەوە و ترسناکە وە هاوڕێ یانی ڕێگا کەمن و لە هەر هەنگاوێکدا کەمتر دەبنەوەو لەکۆتایی دا تەنیا دەمێنیەوە! وە دڵ هەڵکەندن لە هەرچی ئەوەی واتلێدەکات کە لە قوڵایی دوڵەکەدا بمێنیەوەو بسازێ ی لەگەڵ گەل و هۆزی خۆت کە خوویان بە شەوەوە گرتووە و لە دوڵەکەدا جێگیر بوو-ون، وە هەموویان لەگەڵ یەکتر ڕێککەوتون: پەیکی ڕاستی پێت دەڵێت کە دڵت لە ئیسماعیلی ناو و نان و گیان و ئەوینت هەڵکەنەو بڕۆ، وەسوەسەی دڵت دەڵێت: بمێنەوە، بیهێڵەوە، بسازێ. لێرەدا، دوایین پەنای مرۆیی کە هەم هۆشیارەو هەم بەرپرس، ئاراستەکردنە: دۆزینەوەی ڕێگایەک کە بتوانێت بیهێڵێتەوەو بمێنێتەوە، بەڵام ویژدانیشی بەجۆرێک بەنج بکات، دەنگی سەرزەنشتکردن لە خۆیدا کپ بکاتەوە، بەجۆرێک ئاین بگۆڕێت کە بۆ دنیا بگونجێت، ڕێگایەک بدۆزێتەوە کە وەکو ئەوانی تر ئیسماعیلەکەشی بپارێزێت، بەڵام وەکو ئەوانی تر تاوانبار نەکرێت بە داپۆشینی ڕاستی و هەڵگەڕانەوە لە خوا و خیانەتکردن لە خەڵک. شەراب بخواتەوە بەڵام بە مەبەستی شەربەت، بە نیەتی دەرمان! ئاراستەکردن واتا ڕووی ڕاستی بە ناڕاستی ببەخشی. ئەتۆ هەر ناوێکی لێدەنێ ی لێ ی بنێ: ئاراستەکردنی فیقهی، شەرعی، عورفی، ڕەوشتی، زانستی، کۆمەڵایەتی، دەروونناسی، کۆمەڵناسی، دیالێکتیکی، ڕۆشنبیری....

بەڵام 'لە حەج دا' وە ئەویش لە سەرگوزشتەی ئیبراهیمی مەزن دا، وە ئیبراهیمی پیر کە لە هەموو تاقیکردنەوەکان سەرکەوتوو بووە، لە ڕاستگۆیی و پرهێزکاری و زانست و کار و ڕەنج و تێکۆشان و ڕاستی-ویستی ڕەهادا! خوا ناوی لێناوە 'ئاراستەکردنی شەیتان'.

یەکێك لەو 'چۆن بزانینە' زانراوانە یەخەی ئەقڵی بەهێزو ڕاستگۆیی زولاڵ و چەسپاوی ئیبراهیمیش دەگرێت:

من ئەو پەیامەم لە خەودا بیست، چۆن بزانم کە...!

شەیتان لە دڵیدا خۆشەویستی ڕۆڵە دادەگیرسێنێت وە لە ئەقڵیشیدا بەڵگەی ژیربیری دێم دەدات.

ئەم جارەی یەکەم،

جەمرەی یەکەم، بەردباران بکە!

خۆی لە ئەنجامدانی فەرمانەکە لادەدات و ئیسماعیلەکەی دەپارێزێت،

- ئیبراهیم، ئیسماعیلەکەت بکوژەوە!

ئەم جارە پەیامەکە ڕوونترو بڕاوەترە!

جەنگ لە دەروونی ئیبراهیم دا پشێوی دەنێتەوە. قارەمانی مەزنی مێژوو بۆتە بێچارەی دەستی پەرێشانی و دوودڵی و ترس و لاوازی: ئاڵا هەڵگری نامەی مەزنی یەکتاپەرستی بۆتە یاری دەستی شەیتان؟!

لە کێشمەکێشی نێوان خوا و شەیتاندا ووردو خاش بووە، وە ئازار ئاگری لە ئێسکەکانی بەرداوە.

بوونی مرۆڤ، درێیەکی لە قوڵایی بوونی ئادەمیزاددا، ئەقڵ و ئەوین، شعور و ویژدان، ژیان و بڕوا! خود و خوا!

ئادەمیزاد، ئەو ئەڵقەی پەیوەندی یەی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ، سروشت و خوا، غەریزە و خۆئاگایی، زەوی و ئاسمان، دنیا و دواڕۆژ، خۆ-ویستی و خوا-ویستی، واقعیەت و ڕاستی، چێژو فەزیلەت، مانەوەو ڕۆیشتن، ئامادەبوون و ون-بوون، بوون و وەڕاستگەڕان (being and becoming)، دیلی و ڕزگاری، ڕەهایی و بەرپرسیاریەتی، خۆ-تەوەرە-بوون و خوا-تەوەرە-بوون، هاوتاپەیداکردن و یەکتاپەرستی، لەپێناوی من و لەپێناوی ئێمە دا...

وە لە کۆتایی دا، ئەوەی هەیە وە ئەوەی کە دەبێت ببێت.

ڕۆژی دووەمە، سەنگینی بەرپرسیاریەتی، لەبەرامبەر ڕاکێشانی خۆشەویستی دا زیاتر لە ڕۆژی پێشوو ڕوو لە زیادبوونە.

ئیسماعیل کەوتۆتە مەترسی یەوە و پاراستنی دژوارترە.

شەیتان، دەبێت هۆشیاری و ژیریری و شارەزایی زیاتر بۆ فریودانی ئیبراهیم بەکاربێنێت.

لەو میوە قەدەغەکراوەی کە دەرخواردی ئادەمی دا!

ئیبراهیم: مرۆڤ، ئەو کۆکراوەی دوو دژیەکی یە، بەرەی نەبەردی ڕووناکی و تاریکی، ئەهوراو ئەهریمەن، ئەم دروستکراوە لە قوڕی لیچق و گیان، قوڕی لیچقی بۆن ناخۆش و گیانی خوا، ئەم دەروونە!

ڕێگای چاکەو خراپەی بۆ ئیلهام کردووە!

وە تۆ، دوودڵی یەکی، هەڵ بەزینەوەیەکی، هەڵبژاردنێکی، هەر ئەوەندە!

پەیوەندی یان پەیام هەڵدەبژێری؟

ئەی نێردراوی خوا! ئەی بەرپرسیار! ئەی پێغەمبەری خەڵك! تۆ دەتهەوێت بە باوکی ئیسماعیلەکەت بمێنیەوە؟

– بەڵام...ئیسماعیلەکەم بکوژمەوە؟ بە دەستەکانی خۆم؟

– بەڵێ!

بەڵێ، لە بەرامبەر ڕاستی دا دەبێت لە ئیسماعیل ببوری، بەرپرسیاریەتی بڕوا لە بەرپرسیاریەتی هەست و سوز باڵاترە.

– بانگەوازی پەیامەکە؟ یان چێژی باوك؟

شەیتان لە دڵی دا خۆشەویستی ڕۆڵەکەی دادەگیرسێنێت وە لە ئەقڵی دا بەڵگەی ژیریری دێم دەدات:

– بەڵام ...من ئەو پەیامەم لە خەودا بیستووە، چۆن بزانم کە...؟

ئەم جاری دووەمە،

جەمرەی ناوەڕاست، بەردباران بکە!

لە ئەنجامدانی فەرمانەکە خۆی لادەدات وە ئیسماعیل دەپارێزێت.

ئیبراهیم! ئیسماعیلەکەت بکوژەوە!...

وەکو شێرێکی بریندار هاواردەکات، بە ئازار و تورەیی یەوە، بەدەوری خۆیدا خولدەخوات، دەترسێت، لە باوك–بوونی خۆی دەترسێت، وەکو هەورەتریشقە لە شوێنی خۆی هەڵدەستێت و تاودەداتە چەقوو و دووبارە هێرش دەکاتەوە سەر قوربانی یەکەی کە هەر رامەو و بێ دەنگەو ناجولێت، کە لەناکاو، مەڕێك دەردەکەوێت!

وە پەیامێك کە:

ئەی ئیبراهیم! خوا لە کوشتنەوەی ئیسماعیل بوراوە، ئەو مەڕەی ناردووە بۆئەوەی لەجیاتی ئیسماعیل بیکوژیەوە، تۆ فەرمانەکەت ئەنجام داوە!...

وە ئێستا، تۆ–یەك کە گەیشتوویە مینا، وەکو ئیبراهیم، دەبێت قوربانی یەکەت لەگەڵ خۆت هێنابێت، دەبێت هەر لە سەرەتاوە، ئیسماعیلەکەت بۆ کوشتنەوە لە مینا دا ئامادەکردبێت!

ئیسماعیلی تۆ کێ یە؟ چی یە؟

پێویست ناکات کە کەس بزانێت، دەبێت بۆ خۆت و خوا بیزانن،

لەوانەیە ئیسماعیلی تۆ ڕۆڵەکەت نەبێت، کوڕە تاقانەکەت نەبێت، هاوژیانەکەت، پیشەکەت، ناوبانگەکەت، هەوەست، دەسەڵاتت، پلەو پایەت، جێگاو شوێنت....بێت

من نازانم، هەر شتێك کە لە چاوی تۆدا، جێگای ئیسماعیلی هەیە لە چاوی ئیبراهیم دا، هەر شتێك کە بۆتە بەربەست لە بەردەمت بۆ ئەنجامدانی بەرپرسیاریەتی یەکەت، بۆ کارکردن لەپێناوی ڕاستی دا، بۆتە کەلەپچەی ئازادی تۆ، بۆتە پەیوەندیکی بەچێژ کە داوات لێدەکات لەگەڵ ئەودا بمێنیەوە، وەکو گوڵمیخی کۆمەڵگا بەتوندی بە زەوی یەوە بەستویەوە و نامێڵێت بڕۆی، هەمان شت کە لەگەڵ شەیتان دا دەبێتە هاوداستان تاوەکو بیهێڵیەوە. هەر شتێك کە گوێت لەبەرامبەر پەیامی ڕاستی دا کەڕ دەکات وە تێگەیشتنت تاوەکو دڵت چلکن دەکات، ئەوەی کە هەڵگەڕانەوەت لە بەرامبەر فەرمانی بڕواو هەڵاتن

له ژێر باری بەرپرسیاریەتی سەنگین و دژوار بۆ ئاراسته دەکات، هەرچی و هەر کەسێك که تۆ دەهێڵێتەوه بۆئەوەی بیهێڵیەوه...!

ئەمانه نیشانەی ئیسماعیلەکەتن، تۆ بۆخۆت له ژیانت دا بەدوای ئەودا بگەڕێ و لای ببه، وه ئێستا که ئاوازی خوات له دڵ دایه، له مینا بکوژەوه!

تۆ هەر له سەرەتاوه مەڕ هەڵمەبژێره، لێگەڕێ با خوا هەڵبژێرێت، وه ئەو (مەڕ) 'لەجیاتی کوشتنەوەی ئیسماعیلەکەت' بە تۆ ببەخشێت، بەم جۆرەیه که کوشتنەوەی مەڕ 'بەناوی قوربانی' له تۆ قبوڵ دەکات،

کوشتنەوەی مەڕ 'لەجیاتی ئیسماعیل' قوربانی یه: کوشتنەوەی مەڕ لەژێر ناوی مەڕ دا قەسابی یه!

## ♣ دوژمنەکانی مرۆڤ

مەبەست لە دوژمنەکانی مرۆڤ، ئەو هۆکارانەن کە بەدرێژایی مێژوو مرۆڤیان ڕەتکردۆتەوە. ئەو کاریگەری و هەلومەرج و هۆکارە جۆراوجۆرانەی کە هەمیشە لە ڕژێمەکان و جیهانبینی یەکان و شێوە بیرکردنەوە جۆراوجۆرەکاندا، گرنگی یان بەهەرچی داوە بێجگە لە مرۆڤ وە مرۆڤیان لە خۆی بە نەناسراوی و جودا لە خۆی هێشتۆتەوە وە سەرقاڵی شتی تریان کردووە.

ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی هەرەسهێنان، سڕانەوەو لاوازی حەقیقەتی مرۆڤ، لەکاتێکدا دەکرێت لەپێناوی شارستانیەت، لەپێناوی پێشکەوتن، لەپێناوی دەسەڵات دا بکرێن بە هۆکاری ئەریٚ. چونکە بە وتەی هایدیگەر هەموو ئەو شارستانیەتە مەزنانە، بە بەهای قوربانی کردنی حەقیقەتی مرۆڤ خراونەتە سەر یەك. چونکە لە سیستەمەکاندا وەکو دیلێکی ناچارکراو زیاتر لەوەی پێویستی بێت کاری دەکرد، وە مرۆڤ کاتێك کاری ناچاری (بەزۆر) دەکات، خۆی وەکو مرۆڤ هەست بەخۆی ناکات، خۆی وەکو ئامێرێك هەست پێدەکات، وە شارستانیەت لەدایکبووی ساتەکانی کارکردنی ناچاری (بەزۆری) مرۆڤەکانە لەو دۆخانەدا. بەپشت بەستن بەوە، هەموو پاشماوەکانی شارستانیەت، یادگاری ئەو ساتانەیە کە مرۆڤ، لەناوچووە. ئەمە مرۆڤناسی، و هیومانیزمی تایبەتی هایدیگەر و مامۆستا سارتەرە.

باشە، ئەو هۆکارانەی کە دوژمنی مرۆڤن چین؟

تەواوی ئەو کەسانەی کە لە بەرە جۆراوجۆرەکانی ئەمڕۆدا بیردەکەنەوە، بەرەی مارکسیزم، بەرەی ئێگزیستانسشیالیزم (بوونگەرایی)، و بەرەی ئاین، کە سێ بەرەی دیاری ڕۆژئاوان، هەموو بڕوایان وایە کە مرۆڤ، حەقیقەتەکەی، ناوەڕۆکەکەی، ئامانجەکەی، نیازەکەی و بەهایەکانی، جا هەرچی یەك بن، سێ لایەنی بنەڕەتی حەقیقەتی ئەو مرۆڤە پێکدێنن، کە بە وتەی هایدیگەر یەکەم 'ئاگایی'، دووەم 'ئازادی' و سێ یەم 'ئافەراندن'ە.

کەواتە مرۆڤ هەر حەقیقەتێك و ناوەڕۆکێکی هەبێت، ئاماژەیە لە بوونێك کە ئاگاو ئازاد و داهێنەرە. دەرکەوتنەکانی ئافەراندنەکەی یەکێکیان 'پیشەسازی' و ئەوی تریان 'هونەر'ە. دەرکەوتنی ئاگایی 'زانست'ـەو دەرکەوتنی ئازادی یەکەشی 'داهێنان و بەرەو تەواوی ڕۆیشتن'ـە کە دەتوانێك دیاری بکات و هەڵبژێرێت.

کەواتە دوژمنەکانی مرۆڤ زۆر ئاشکران. کۆمەڵە هۆکارێکن کە مرۆڤ لە سەرنجدان لەو سێ لایەنە بنەڕەتی یەی خۆی دووردەخەنەوە وە سەرقاڵی شتێکی تری دەکەن. (هەتا ئەگەر ئەو شتە پیرۆزترین شت بێت) ئەڵبەت ناکرێت هەموویان ڕوونبکەینەوە وە ئەگەر بشکرێت، بە یەك دانیشتن ناکرێت: وە من تەنیا ناونیشانەکانیان دەڵێم و بە کورتی ڕوونیان دەکەمەوە، وە ئێوە لێرەدا دەبینن کە ئەو هۆکارانە، دژیەك و جۆراوجۆرن. هەتا هەندێك هۆکار هەن کە یەکتر ڕەتدەکەنەوەو دژی یەکترن. دەبینین کە هەردووك هۆکار کە دژی یەکترن، بەڵام لە ڕەتکردنەوەی مرۆڤدا بەیەکەوە هاوبەشن.

وە با دووبارە ئەوەش ڕوون بکەمەوە کە مەبەستم لەو دەستەواژانە، واقعیەتی دەستەواژەکانە: نەك حەقیقەتی دەستەواژەکان. چونکە حەقیقەت شتێکی ترەو جیاوازە لە واقیع. حەقیقەت ئەو شتەیە کە دەبێت ببێت، یان بەشێوەی ڕەها هەیە، وە واقعیەت شتێکە کە لە جیهانی دەرەوەدا، بوونی دەرەکی بینراوی پەیداکردووە. بۆ نمونە ئیسلام وەکو حەقیقەتێك، ئاینێکی پێشکەوتوو و ئازادی بەخشە: بەڵام ئیسلام وەکو واقعیەتێك، ڕژێمێکی دژە

ئازادی و دژە مرۆیی و دژە نەژاد و سەربەرزی کۆمەڵانی خەڵك بووە. ئیسلام وەکو واقعیەت، ئەو مێژو دەسەڵاتەیە کە بەناوی ئیسلامەوە لە مێژوودا هەبووە وەك واقعێك و کاری کردووە: وە ئیسلام وەکو حەقیقەت، ئەو بەهایانەیە کە لە کتێب دا، وە لە پەیام دا، ڕەنگی داوەتەوە وە ئادەمیزادی لێکۆڵەرەوە دەتوانێت بچێت و لێکۆڵینەوە بکات و لێ ی تێ بگات.

سۆسیالیزم، بەشێوەی حەقیقەت، بەجۆرێك بڕیاری لەبارەوە دەدرێت، وە بەشێوەی واقعیەت بەجۆرێکی تر بڕیاری لەبارەوە دەدرێت کە لەوانەیە ئەو دوو بڕیاردانە دژی یەکتر بن.

مەسیحیەتی حەقیقەت، ڕەنگدانەوەی خۆشەویستی و لێبوردن و ئەوینە، وە مەسیحیەتی واقعی، گەورەترین بکوژی خوێنڕێژە کە هیچ جەنگیزێکی پێ ناکات وە بە یەك ڕۆژ ٣٠٠ هەزار کەس لە بەرشەلۆنا بەکۆمەڵ دەکوژێت. -لە خودی مەسیحیەتەوە- سەیری جەنگی خاچپەرستەکان بکە وە بزانە لە فەلەستین چیانکرد وە ئێستاش چ دەکەن. هەرچۆنێك بێت ئەو هۆکارانە بەشێوەی هەڕەمەکی باس دەکەم، بۆخۆتان لە مێشکی خۆتاندا ڕێکیان بخەن.

زانست، ڕەتکەرەوەی مرۆڤ:

یەکێکیان خودی زانستە. دیسان دووبارەی دەکەمەوە کە کاتێك دەڵێم زانست، واتا واقعیەتی زانست. ئەو شتەی کە لە مێژوودا لەژێر ناوی زانست بۆتە واقع وە ئەو زانستەی کە ئێستا هەیە وە ئامارژەیە لە ئامرازی بەکۆیلەکردنی نوێ. ئەڵبەتە دەزانم کە لە هەندێك ناوچەی ئەفریقا ئێستاش کویلایەتی هەیە، وە هەندێك لە مرۆڤەکان کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرێت. بەڵام هەرچۆنێك بێت، ئەگەر کۆیلایەتیش بوونی هەبێت، لە چەند ناوچەیەکی دواکەوتوو دایە کە چەند کۆمەڵە ئادەمیزادێکی زۆر گەنیوو و دڕندە مرۆڤەکانیان خستۆتە داوی خۆیانەوە. بەڵام من بۆخۆم بە چاوی خۆم بینیم وە هەندێك لە دۆستان ئێستا لێرەن بینیان کە بازاڕی کۆیلەفرۆشی لە ئەفریقا و باشوری فڵان شوێنە نیە. بەڵکو بازاڕی کۆیلەفرۆشی لە زانکۆی کامبریجە. لە

زانکۆی هارڤارد و زانکۆی سۆربۆنە. ئەویش نەك فرۆشتنی کرێکار و کارکەر. بەڵکو فرۆشتنی مەزنترین بلیمەتەکانی مرۆڤایەتی.

سەرمایەدارەکان دێنە پێش پۆلەکان، یەخەی خوێندکارە یەکەم و دووەم و سێ یەمەکان دەگرن و هەڕاجیان دەکەن. یەکێك دەڵێت من دە هەزار تمەن دەدەم، یەکی تر دەڵێت پازدە هەزار تمەن دەدەم، ئۆتۆمۆبیلێکیشی پێ دەدەم. یەکێکی تر دەڵێت من شوفێریشی بۆ دابین دەکەم، یەکی تر دەڵێت من سکرتێرێکیشی بۆ دادەنێم، وە لە کۆتایی دا ئەو کەسەی پارەی زیاتر دەدات بە زیادکردن، ئەو کەسە بلیمەتە هەڵدەگرێت و دەیباتە کارگەکەی و پێ ی دەڵێت لێرە ببەو هەرچی پێت دەڵێم بۆم دروست بکە. ئەویش دەڵێت بەسەر چاوان. کەواتە جیاوازی نێوان کۆیلەی نوێ لەگەڵ کۆیلەی کۆن ئەوەیە کە کۆیلەی کۆن بۆخۆی سەرۆکەکەی (سەرۆك=خاوەنکار) هەڵنەدەبژارد. بەڵام کۆیلەی نوێ بۆخۆی سەرۆکەکەی هەڵدەبژێرێت. بەڵام هەرچۆنێك بێت، پێویستە سەرۆك هەڵبژێرێت. دەنا زانا نی یە و لە دنیادا هیچ پێگەیەکی نابێت. ئەگەر زانست بە سەرمایەداری نەفرۆشرێت، ئەوا تەنیا بەکەڵکی وتاردان و قسە بۆ خەڵك کردن دێت. حەقیقەت ئەوەیە کە ئەم سەدەیە، سەدەی ژیانی هاوبەشی زانست و پارەیە. ئەم دووە هەمیشە لە مێژوودا دژی یەك بوو-ون، ئێستا شوویان بەیەکتر کردووە وە منداڵێکی نایاسایی یان بووە کە ئامێر (machine) ـە، وە کاتێك زانست لەگەڵ پارە ژیانی هاوبەش پێکدێنێت، دیارە کامە سەروەرەو کامەش ژێردەست. لێرەشدا دەبینین کە لە کۆتایی دا، سەرکەوتنەکەی بڕندەترین ئامێرە بەدەستی سەرمایە دارانەوە. مەزنترین هۆکارە بۆ جەنگەکان، وە هەتا خراپتر لە هەموو ئەوانەش، گەورەترین ئامێری ئارستەکردنی (بەباش نیشاندانی) ڕژێمە پیسەکانی وەکو فاشیستە.

هیتلەر پێنج سەد فەیلەسوف و زانای نمرە یەکی ئەڵمانی بۆخۆی بەکرێ گرتبوو، وە فەرمانی دەدا کە هەچی من دەیڵێم، دەبێت ئێوە ئارستەی بکەن (بەڕاستی نیشان بدەن) بەشێوەی زانستی. چونکە من نازانم زانست چییە. واتا

ئێمە چرت و پرت دەڵێین، ئێوە دەبێت ئاراستەی زانستی بۆ بدۆزنەوە. مۆسۆلۆنی بیست فەیلەسوفی ئیتاڵیایی بانگهێشت کردو لە ژوورێکدا داینیشاندن. لەناکاو هاتە ژوورەوەو گوتی من دەمهەوێت تاوەکو پازدە ڕۆژی تر دیاریبکرێت. ئێوە دەبێت ئایدۆلۆجیایەك دروست بکەن. ئەوانیش گوتیان باشە بەسەر چاوان قوربان، ئێمە کارمان ئەوەیە.

ئەو زانستە، لە کۆتاییدا دەگاتە فاشیزم. فاشیزم تەنها ئەو شتە نی یە کە لە ڕووخساری بزوتنەوەو ڕژێمی مۆسۆلۆنی و هیتلەردا دەیبینین. بەڵکو لە ڕژێمە جۆراوجۆرەکاندا، لەژێر ناوی جۆراوجۆر دا، فاشیزم بوونی هەیە. ئەو ڕژێمەی کە ئێستا بەسەر شارستانیەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا فەرمانڕەوایی دەکات، ناوەکەی هەر چی یەك بێت، شێوازەکەی فاشیزمە، وە سیستەمەکەی هەر چی یەك بێت، چینی فەرمانڕەوایەکەی تەکنۆکڕاتە. جا چ لە سیستەمی ڕۆژهەڵات دا بێت، چ لە سیستەمی ڕۆژئاوادا.

ئادەمیزادە ڕووکاربینەکان، تەنها لەسەر بنەمای زانست بڕیار دەدەن وە ئێستا کە ئەو زانستە، بە قسەی 'برشت' کاتێك گەیشە فاشیزم، شکستی هێنا. لە ئەنجامدا مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە، کە بێ ئومێدە لە ئاین چونکە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا یادەوەری خراپی لەگەڵ هەیە، وە بێ ئومێدە لە زانست چونکە لەسەردەمی فاشیزم دا یادەوەری خوێنینی لەگەڵ هەیە، نازانێت ئومێد بە چ شتێك ببەستێت.

لەم دۆخەدا، زانست دەبێتە ژێردەست و کارکەری نەزانی. بەو شێوەیە کاتێك زانست دەبێتە بەکرێگیراوی زێڕ (سەرمایەدار) و زۆر (دەسەڵات)، ئەو ئامانجانەی کە گرنگی یان پێدەدات، بریتین لەو خاڵانەی کە سەرمایەداری و دەسەڵات بۆی دیاری دەکەن: وە زانست کە ئاماژەیە بۆ چاوکرانەوەی مرۆڤ و بەئاگاهێنان و دۆزینەوەیە، بۆ ئەنجامدانی ئەو فەرمانبەریەتی یەی کە نەزانی خستویەتە گەردەنیەوە، ئاراستەی جگە لە مرۆڤ دەکرێت وە بۆئەوەی داواکاریەکانی خاوەنکارەکانی ئەنجام بدات، سەرقاڵی جگە لە مرۆڤ دەبێت وە

هەتا لەو سەرقاڵ بوونە نامرۆیی یەدا، هەندێکجار دەبێتە ڕەتکەرەوەو بکوژی مرۆڤ. هەتاوەکو لەو شوێنانەشدا کە زانست شێوەی فاشیزم بەخۆوە ناگرێت وە وەکو زانستێکی ساغە، چونکە فەرمانبەریەتی نازانستی هەیە و ئامانجەکانی لەلایەن ڕژێمە نازانستی و نا-زانایەکان دیاری دەکرێن، دیسان مرۆڤ لەپشت زانست بە نەناسراوی دەمێنێتەوە. ئەمەیە کە بە وتەی ئێلکسیس کارل، ئەمڕۆ مرۆڤ لە گەردیلە و ناوك و وزەو پرۆتۆن دا ڕۆچووە وە تا قوڵایی ئاسمانەکان بەرزبۆتەوە، بەڵام کەمترین هەنگاوی لەپێناوی خۆیدا هەڵنەهێناوە. مرۆڤی ئەمڕۆ لەبارەی دورترین هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر زانیاری وردی هەیە. بەڵام لەبارەی بچوکترین کێشەکانی ژیانی ئادەمیزاد، بچوکترین چارەسەری بە مێشکدا نایەت.

چونکە مرۆڤ لەپشت ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی زانست دا، خەریکە لەبیردەچێتەوە و لەناودەچێت. داستانێکیان دروستکردووە کە هەرچەندە گاڵتەیە، بەڵام پێشاندەری حەقیقەتێکە، وە ئەویش ئەوەیە کە کاتێك گاگارین ڕۆیشت بۆ بۆشایی ئاسمان، هەواڵنێرێك دەچێت بۆ ماڵیان و لە منداڵەکەی دەپرسێت:

بابت لە کوێ یە؟

منداڵەکە دەڵێت: ڕۆیشتووە بۆ بۆشایی ئاسمان.

هەواڵنێرەکە: کەی دەگەڕێتەوە؟

منداڵەکە: کاتژمێر ٢ و ٣٥ خولەك و ٧ چرکە.

دواتر هەواڵنێرەکە دەپرسێت: دایکت لە کوێ یە؟

منداڵەکە: ڕۆیشتووە نان بکڕێت.

هەواڵنێرەکە: کەی دەگەڕێتەوە؟

منداڵەکە: دیار نیە (کەی دەگەڕێتەوە).

ئەو باوکە لێرەدا ڕەنگدانەوەی پێشکەوتنی زانستی یە، وە ئەو دایکە ڕەنگدانەوەی حەقیقەتی مرۆڤە کە لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، وە ئەو منداڵە

مرۆڤــی داهاتوویـە کـە لەسـەرکەوتنی باوکی دا جگـە لـە پێشکەوتنی زانستی (ئەڵبـەت زانسـت بـەم واتایـە) هیچی بە میرات بۆ نەمێنێتـەوە. بەڵام بە ڕەنجی دایکی ژیـان بەسـەر دەبات. بەکورتی، واتا پیرۆزترین شت کە دەیتـوانی مرۆڤـ ڕزگار بکات، ئەمڕۆ بۆتە کارەساتترین و کارەساتهێنەرترینی شتەکان.

ئاین ئومێدی ڕزگاری بە مرۆڤـەکان دەدا وە ئەمڕۆ دەنگی خامۆش بووە، وە زانسـت لـە سـەدەکانی ١٧ و ١٨ دا بـە هاتوهۆریـای زۆرەوە بـوو بـە جێنـشینی ئاین و دروشمی ڕزگاری مرۆڤـی کردە پیشەی خۆی و بەڵێنی دا کە بەهەشتی ئاین هەر لەسەر ئەم زەویە دروست دەکەم بۆتان. بەڵام کاتێك بەهەشتی دروست کـرد، دیـتم چـی دروسـتکرد! ئـەڵمانیای هیتلـەری دروسـتکرد، وە ئـەمریکای هاوشـێوەی ئـەو. وە دەبیـنم کـە لـەپێش هـەموان و زیـاتر لـە هـەموان، هـەر ئـەو ڕژێمانـەن کـە مرۆڤـی ئـەمڕۆ دەخەنـە ڕەنجـەوە کـە مرۆڤـ بـۆ فەرامۆشـکردنی کارەسـاتی ژیـانی مـەدەنی و شارسـتانیەتی بورجـوازی پـیس، هـەتا پـەنا بـۆ هیرۆینیش دەبات.

ئەمانــە لــەو ڕژێمانــەدا شــتێکی جــەبرین وە بــە ڕێنومــایی کــردن و ئامۆژگاریکردن باش نابن. بێچارەکان دەبینین کە دێن بۆ ڕۆژهەڵات بۆئـەوەی بگەنە ئەو ڕووناکی ڕێنومایی یە. نازانم کە ئایا فلیمی 'یەك شـەممە، هـەرگیز' ت بینیـوە یـان نا، کـە دڵـەڕاوکێ ی گەڕانـەوە بـۆ ڕۆژهـەڵات ، گەڕانـەوە بـۆ یۆنـان، گەڕانەوە بۆ بەهەشت، ئەوانیشی بێچارەو گرفتـار کـردووە، دەگەڕێنـەوە دەبینن کە لەجیاتی عیرفان توشی تریاك و حەشیش و ئەو شتانە بوو-ون. وەکو ئێمە کـە دڵـەڕاوکێ ی شارسـتانیەت و زانـستی ئـەمڕۆو فەلـسەفەی ئـەمڕۆ، ئێمـە ڕاکێـشاوە بـۆ ڕۆژئـاوا وە چوارچـێوەی لـە دابونـەریت و فەرهـەنگ و ژیـانی خۆمانەوە تونێلمان لێداو و تێکشکاند لەپێناوی جیهانی دەرەوەو شارستانیەت دا، وە بەداخەوە توشی زێراب بووین.

**ماتریالیزم**

دوژمنێکی تری مرۆڤ، ماتریالیزمە (ماددی گەرایی). ماتریالیزم جاری وایە دوژمنی مرۆڤە وە جاری وایە شێوە بیرکردنەوەیەکی دوژمنی مرۆڤە. چونکە ماتریالیزم بە مرۆڤ دەڵێت تۆ بوونێکی ماددی و لە ڕەگەزی ئەم سروشتەی، بەبێ ئەوەی هیچ تایبەتمەندیەتیەکی تایبەتی و نایابت هەبێت. لە واقع دا ڕەتکەرەوەی بەهای مرۆیی یە، وە کاتێك مرۆڤ بڕوای بە پەستی خودی خۆی و ئاسایی بوون و سروشتی بوون و ماددی بوونی ڕەگ و ڕیشەکەی و هاوئاهەنگی و هاوجۆری خۆی لەگەڵ هەموو بوونەوەران هێنا، بێ بڕوا دەبێت بەرامبەر هەموو بەها مرۆیی یە نایابەکانی خۆی. وە لە بنەڕەتدا گونجاو نی یە مرۆڤ خۆی بە دیاردەیەکی ماددی لەو جۆرە بزانێت کە لە سروشت دا وەکو گیایەکان دەڕوێت، وە لە هەمان کاتدا پەیامی خوایی و نائاسایی تایبەتی بۆ خۆی دابنێت. شتێکی لەو جۆرە گونجاو نیە. هەر لەبەر ئەمەشە کە سارتەر پێناسەیەك بۆ مرۆڤ دەکات کە جیاوازە لە هەموو دیاردە ماددی یەکانی تر. ئەو دەڵێت مرۆڤ سەرەتا بوونەکەی دروست دەکرێت، دواتر ناوەڕۆکەکەی بۆخۆی دروست دەکات. لە کاتێکدا هەموو دیاردە ماددی یەکانی تر، سەرەتا ناوەڕۆکەکەیان لە مێشکی خوا یان سروشت دا دروست دەبێت وە دواتر بوون پەیدا دەکەن.

باشە، بۆچی سارتەرێك کە خواپەرست نی یە، بڕوای بە میتافیزیك (غەیب) نیە، لەناو دروستکراوەکاندا مرۆڤ لە هەموو دروستکراوەکانی تر جیادەکاتەوە؟

چونکە ئەگەر مرۆڤ بڕوای خۆی بە باڵاتربوونی خوی و دروستبوونەکەی لەدەست بدات، بڕوای خۆی بەرامبەر مرۆڤایەتی لەدەست دەدات. چونکە بڕوابوون بە مرۆڤایەتی، بڕوابوون بەوەیە کە مرۆڤایەتی لە بنەڕەتدا بوونێکی هەڵاوێراوە لە سروشت دا وە لەبەر ئەوەشە کە بەرپرسیاریەتی هەڵاوێراوی هەیە، وە ئەو خاوەنی ئەو بەهایانەیە کە سروشت نینی، وە هەر لەبەرئەوەشە کە مرۆڤ هەست بە کۆمەڵە پێداویستی دەکات کە سروشت لە دابینکردنی ئەو پێداویستی یانە بێ توانایە. ئێمە دەبینین کە لەبەر کەموکورتی سروشت و

وەڵامدانەوەی پێداویستی و نیازە ئەودیوی یەکانی (مێتافیزیکیەکانی)، دەست دەداتە هونەر، دەست دەکات بە دروستکردنی شیعر، خۆی خەریکی ئەدەبیات و عیرفان و ئاین دەکات.

بەڵام ماتریالیزم، بە بڕوا بوون بە ماددی بوون و بێ هەست بوونی خودی مرۆڤ و هاوئاهەنگی ڕەگەزی مرۆڤ لەگەڵ هەموو ئەو ڕەگەزانەی کە سروشتی کوێرو ناخۆئاگاو بێ ئامانج و بێ هەست پێکدێنن، دەبێتە هۆکاری ڕەتکردنەوەی بەها مرۆڤایەتی یەکان. وە سەیر ئەوەیە کە لە 'جۆرج بولیستر' دەپرسن تۆ کە ماتریالیستی، چۆن دەڵێ ی پێویستە مرۆڤ لەپێناوی ڕێنومایی و ئازادی کۆمەڵگای ئادەمیزاد فیداکاری بکات؟ ئەویش وەڵامێك دەداتەوە کە زۆر بەتامە، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێت: ئێمە لە فەلسەفەدا ماتریالیستین، بەڵام لە ڕەوشت دا ئایدیالیستین!

ئەو وەڵامە کابرایەك بەبیر من دێنێتەوە کە لە پاریس دەژیا، وە جلوبەرگ و ڕیش و گۆچانێکی پێبوو. ڕۆژانی هەینی بۆ پیاوی ئاینی گونجاو بوو، وە ڕۆژەکانی تر بۆ یانەکان گونجاو بوو. چۆن دەکرێت کە کەسێك لە ڕەوشت دا ئایدیالیست بێت بەڵام لە بڕوای فەلسەفی و جیهانبینی دا دژە ئایدیالیست بێت؟ مەگەر دەکرێت لەدەرەوەی بڕواو ڕەفتار، لەدەرەوەی جیهانبینی و ڕەوشت، لەدەرەوەی واقعیەت بوونی هەبێت؟

ئـایـن:

یەکێکی تر لە دوژمنەکانی مرۆڤ، ئاینە. (ئەڵبەت ئاین بەشێوەی واقعیەتێك کە لە مێژوودا هەیە، نەك بە واتا ڕاستەقینەکەی.) ئاین بەو واتایە، لە درێژایی مێژوو دا، لە ڕژێمە کۆمەڵایەتی یەکاندا، لە سەرزەمینە جۆراوجۆرەکاندا، هەمیشە ئامێری دەستی ئەوکەسانە بووە کە دژی مرۆڤن، وە ئەو کەسانە بۆئەوەی لەسەر لە نەفامی و نەزانی خەڵك بلەوەڕێن، ئاینیان کردوٚتە هۆکارێکی دژە مرۆڤ.

دوژمنانی مرۆڤـایەتی، گەورەترین کار کە ئەنجامیان دا ئەوەبوو کە ئاین کە هەسـتێکی ئـەودیوویی (میتـافیزیکی) و هۆکـاری پێـشکەوتن و هۆشـیاری و شـانازی و تـەواوی ئـادەمیزاد بـوو وە هۆکارێـك بـوو کـە دەیتـوانی مرۆڤـ لـەو چوارچـێوەیەی ژیـانی ڕۆژانـە ڕزگـار بکـات، کردیانـە کارایـەکی بێهۆشـکەر و ئامرازی ئاراستەکردنی (بەئاسایی نیشاندانی) ئەو بارودۆخەی کە هەیە.

بـەم جـۆرە ئاینیـان سـنورداركردو بەسـتەوە بـە دواڕۆژەوە. بەشـێوەیەك کـە تەنیا بەکەڵك ئەوە دێت کە کاتێك سەرت خستە ناو گۆڕەوە، سودی بۆت هەیە. باشە، پێش ئەوەی سەر بخەینە ناو گۆڕ، دەبێت چ کەسانێك بەکەڵکمان بێن؟ باشـە ئـەو کـارە چ سـودێکی هەیـە؟ ئـەو سـوننەت و ئـەو بڕوایـە، دەکرێـت چ ئەنجامێکی هەبێت؟

هەرچۆنێك بێت، کاتێك لەلایەکەوە ژیان لە ئاین جیابکەنەوە، ئەوا ئاین کە هۆکـاری بەئاگاهاتنەوەیـە، لـە دەسـتی مرۆڤـ دەردێـنن وە هـەروەها پەیوەنـدی مرۆڤـ لەگەڵ ئەودیوی سروشت (لەگەڵ خوا) دەگۆڕن بۆ شێوەیەك کە مرۆڤـ بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خوا، هـەروەکو چۆن کە لـە ژیانی دنیادا وە لـە ڕژێمـەکانی دەسـەڵات دا، تاکـەکان و کۆمـەڵانی خـەڵك سـەرەڕای ژێردەسـتە بوون و نزمـی و ماسـتاوکردن، دەبـوو سـەنجی دەسـەڵاتەکانی بـۆلای خـۆی ڕاکێـشابا وە ئەگـەر ویـستبای لەبەرامبـەر دەسـەڵاتێکدا پـشت بـە کەسـایەتی خـۆی ببەسـتێت، نەفرینلێکراو دەبوو، پەیوەندی ئەو لەگەڵ خوا بەو جۆرە بێت تاوەکو لەژێرناوی هیچ-بوونی مرۆڤـ لەبەرامبـەر خـوا دا بتـوانن بەسـەر خەڵکدا شـانازی بکـەن و ئاغـایی بکـەن، وە ئـادەمیزاد لـەژێرناوی مرۆڤـێك کـە لەبەرامبـەر خوادایـە، سەرشـۆڕی بکـەن و وای لێبکـەن خـوو بە ماستاوچیەتی یـەوە بگرێـت و بەهاو هۆشـیاری و خواسـت و ویـست و کەسـایەتی و ئـازادی خـۆی ڕەتبکاتـەوە، وە بتهـەوێت یـان نەتهـەوێت مرۆڤـێکی لـەو جـۆرە کـە بـەناوی خـواوە کـراوە بەژێردەسـتە، بۆ خواوەنـدەکانی سـەر زەوی باشـترین ئـامێری چەوسـاندنەوە و سواربوونە وە هـەروەکو چەندین جار وتم، چونکە ئـاین هەمیشە مـەزنترین وزە

بووه لە سروشتی مرۆڤەکاندا، کاتێك دەبێتە ئامێر بەدەستی دوژمنانی مرۆڤەوە، دەبێتە گەورەترین بەڵاو کارەسات بۆ ڕەتکردنەوەی بەها مرۆڤی یەکان. لە وتارێکدا بەناوی 'ئاین لەدژی ئاین' باسم کرد کە مرۆڤەکان دەبنە قوربانی ئاراستەکردنی ئاینی و ئاین، وە هەموو کات دەسەڵات پەرستی و فریودان بەناوی ئاینەوە ئاراستەکراوە، وە کۆمەڵانی خەڵك ژێردەستەو سەرشۆڕ کراون بەناوی ئاینەوە: وە هەموو کات ئەو هۆکارەی کە مرۆڤەکانی بۆ هۆشیاری و ئازادی و سەرپێچیکردن لەدژی ئەو ڕژێمە دژە مرۆڤی یانە بانگکردووە دیسان ئاین بووە.

بەکورتی، جەنگە بیری یەکان هەمیشە جەنگی ئاین لەدژی ئاین بوو-ون، وە هەر بەو جۆرەیە کە دەبینین کە پێغەمبەرانی ئیبراهیمی کە شوانە نێردراوەکان بوون لەناو خەڵکەوە، هەموو کات سەرپێچی یان دەکرد وە کۆمەڵانی خەڵکیان بۆ سەرپێچیکردنی ڕژێمە دژە مرۆڤی یەکان بانگدەکرد، دیسان لەبەرامبەر خۆیاندا دوژمنێکیان بەناوی ئاین دەبینی وە گەورەترین هۆکار کە دژی ئەو بزوتنەوانە دەوەستا، دیسان ئاین بووە.

کاتێك پێغەمبەرەکان بزوتنەوەکەیان دەستپێدەکرد، ئاینە فەرمانڕەوایەکان لەدژیان دەوەستانەوە. ئەگەر لەناویان بردبا، ئەوە هەر بۆخۆیان لەسەر کاردەمانەوە: وە ئەگەر ئەو پێغەمبەرە بەسەر ئەواندا سەرکەوتباو ئەوان شکستیان هێنابا، لەدەوری ئەو کۆدەبوونەوە، بەڵام دواتر دەبوون بە جێنشینانی ئەو و بەشێوەی زنجیرەی جێنشینانی ئاینی یان سیاسی ئەو پێغەمبەرە، بزوتنەوەکەی ئەویان وە بەهایەکانی کاری ئەو و پەیامەکەی ئەویان دەسڕیەوەو دەیانخستە خزمەتی خۆیانەوە.

هەروەکو چۆن کاتێك پێغەمبەری ئیسلام کۆچی دوایی کرد، دوژمنەکانی حونەین و ئحود و بەدر و خەندەق کە شەڕیان لەگەڵ ئەو دەکرد، لە هەموو بەرەکاندا بوونە جێنشینی ئەو وە لەژێر ناوی جێنشینی رسول الله و بەناوی جیهاد و زەکات و مزگەوت، دیسان دەستیانکردەوە بە تاڵانکردنی کۆمەڵانی

خــەڵك وە دیــسان دەســتیانكردەوە بــە قوربــانی كردنــی ڕابــەرانی خــەڵك و ڕووخسارەكانی ڕاستی و ئازادی و سەربەرزی مرۆڤ، وە زیاتر لە هەموو ڕابەران و ڕووخسارەكانی ڕاستی، خودی ئەو ئاین و خودی ئەو ڕاپەرینە سەرەتایی یەیان لەناو بردو بەكۆمەڵ كوشتیانن. ئەو واقعیەتەی مێژوو بەسەر هەمواندا فەرمانڕەوایە. هـەروەكو چۆن موسا دێت و ڕووبەڕووی فیرعەون دەبێتەوە و ململانێ ی لەگەڵ دەكات وە لەكۆتایی دا سەردەكەوێت بەسەریدا. بەڵام كاتێك موسا كۆچی دوایی دەكات، خاخامەكانی جولەكە دەبن بە جێنشینی. دواتر عیـسا دێـت و لەگـەڵ زلهێزەكـان ململانـێ دەكـات. سـەردەكەوێت وە خـەڵك ڕزگاریـان دەبێـت. بـەڵام دیـسان دەبیـنین كەسـانێك بانگەشـەی جێنـشینی ئـەو دەكەن كە لە ڕاستیدا دوژمنی ئەون.

خەرجی (مەسرەف):

یەكێكی تر لە دوژمنەكانی مرۆڤ خەرجی یە خەیاڵی یەكانن، وە ئەمەش شتێكە كە لەم ڕۆژگارەدا شوێنی زانست ویستی، شوێنی ئاین، شوێنی عیرفان، شوێنی بەها مرۆیی یەكان و شوێنی مرۆڤـدۆستی گرتۆتەوە وە هەموو خەڵك بڕوایان پێ یەتی. ئێمە هەموو خەرجی پەرستین و بووینە قوربانی پەرستگای خەرجی. خەرجكردنێك كە تەنها بارازەكانی بەرهەمێنانی جیهان لەپێش ئێمەی هەڵدەڕێژن وە بودایی و موسڵمان و ماددی یەكان و مەعنەویی یەكان و زەرد پێست و ڕەش پێست هیچ جیاوازی یەكی نی یە لەلای ئەوان.

بە كورتی، هەموو فەلسەفەی ژیانمان، كە لە بنەڕەتدا پێویستە دانیشین و شیكاری بكەین كە لە بنەڕەتدا ژیان چی یە؟ ئامانجی مرۆڤ چی یە؟ پەیامی مرۆڤایەتی چی یە؟ حەقیقەتی ژیان چی یە؟ بۆتە خەرجی.

ڕژێمەكانی بەرهەمهێنان بە ئەندازەیەك ئێمەیان بۆمبباران كردووە كە بەهیچ شێوەیەك هیچ دەرفەتێكمان بۆ نەماوەتەوە. خەڵكی وا دەبینی كە لە ١٠، ٢٠ ساڵی داهاتوودا دەبێت قیستی ئەو ئامێرو كەلوپەلانە بداتەوە كە پێشتر كڕیونی و ئێستا هیچیان لێ نەماوەتەوە، ناچارە سەراوبن بژیەت.

سەراوبن ژیان واتا چی؟ واتا لە ئایندەدا لەپێناوی ڕابردوو بژیەی: واتا کارکردن لەپێناوی ئەو خەرجی و پێداویستیانەی کە کاتەکانیان تێپەڕیوە و هیچی تر بوونیان نی یە. ئەمەش واتا هەموو تەمەن و توانایەکانمان کە سەرمایەی مرۆیی ئێمەن، پێش-فرۆش بکەین:

لەلایەکەوە خەرجی پێداویستی یەکان لەلای ئێمە دروست دەکات وە چونکە بەرهەم و داهات نی یە، ناچارین کات لەجیاتی ئەو ببەخشین. ئەگەر سەیری پێنج بەرنامەی تەلەفزیۆنی بکەین، سیٚ خەرجی نویٚ دێتە ناو ماڵەکانمانەوە. وە بەو شێوە ڕوولەزیادبوونە خەرجی دێتە ناو ماڵەکانمان. بەڵام ئەی داهات؟ هەر سیٚ چوار ساڵ جارێك، ئەگەر لوتف بکەن و پلەیەك بەرزبکەنەوە، ١٠٠ تمەن (بۆ ئێستا نیزیکەی ٤٥٠٠٠ دینار) موچەکەمان زیاد دەکەن، وە دەبینی کە لەو نێوانەدا مرۆڤ بەتەواوی فەلەج دەبێت و ڕەتدەکرێتەوە. مەزنترین بەخشش و مەزنترین توانا لە ژیانی ئادەمیزاد دا وە مەزنترین دەرفەت بۆ هەر مرۆڤێك کە مرۆڤە، واتای پشوودان و کات و ڕامان و دانیشتن و بیرکردنەوەو هەڵسەنگاندنە کە بلیمەتی یەکان لەو دۆخانەدا دەپشکون و مرۆڤ دەبێتە کریستاڵێکی نویٚ و هۆشیاری یە مەزنەکان بەدەست دێنێت، بەڵام لیٚ ی دەستێندرێن.

ئامێرەکان دە کاتژمێر کاری کۆن بە دوو کاتژمێر ئەنجام دەدەن. ئامێرەکان هەشت کاتژمێر کاتی ئازادمان بۆ دەهێڵنەوە. بەڵام سەرمایەداری و سەپاندنی خەرجی یەکان و بنەڕەتبوونی خەرجی نویٚ، ئەو هەشت کاتژمێرەو هەشت کاتژمێری تریشی دەخاتەسەر و لێمان دەستێنێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بنەڕەتبوونی خەرجی وەکو ئاینێکی لێهاتووەو بۆتە عیبادەت و پەرستنی کرداری مرۆڤ، هەم کاری مرۆڤ، هەم کاتی بیٚ ئیشی مرۆڤی کردۆتە قوربانی، کە تاوەکو زیاتر بەرهەمبێنێت لە بنەڕەتبوونی خەرجی دا، مرۆڤ زیاتر بنەڕەتبوونی خۆی لەدەست دەدات وە هەتا بچوکترین دەرفەت نادۆزێتەوە بۆ بیر

لەخۆ کردنەوەو جارێك سەیری خۆ کردن، وە هەر بە زیندوویی ماوەتەوە بۆئەوەی بمرێت (بەس چاوەڕوانی مەرگە).

**کتێبی ژیان:**

دوژمنێکی تری مرۆڤ کتێبی ژیانە. وە ئەو نەخۆشی یە زیاتر هی ڕۆشنبیرەکانە. کتێبی ژیانی مێشکی، ئایدیۆلۆجیا دروست دەکات، فەلسەفە دروست دەکات، ڕێگاچارە دروست دەکات، ئاراستە دەکات، ئەنجامگیری دەکات، شی دەکاتەوە، بەڵام هەمووی پوچە وە هیچ پەیوەندی یەکی بە واقعیەتەوە نی یە. کەسەکە چونکە دەخوێنێت، کتێبی کۆمەڵناسی و فەلسەفی و ئابوری و سیاسی و مێژوویی دەخوێنێتەوە. وردەوردە ئەو خوێندنەوانە، بابەتە مێشکی یەکانی ئەو کەسە ڕادەکێشن بۆ بابەت و شیکردنەوە مێشکی یەکانی تر، وە دواتر ڕێگاچارە نیشاندان، وە دواتر دەرمان نیشاندان، وە دواتر ئایدۆلۆجیا دروستکردن، وە دواتر بڕوا دروستکردن، وە دواتر گەیشتن بە هەندێك بڕوا بەناوی زانست، وە دواتر دێتەوە ناو کۆمەڵگا، دەبینێت توێشووە مێشکی یەکانی ئەو هیچ پەیوەندی یەکیان بە پرسەکانەوە نی یەو تازە دەزارێت کە دووچاری کتێبی ژیان بووە وە هەندێك بابەتی مێشکی بڕوایەکانی ئەویان دروستکردوون، وە بڕیاردانەکانی لەبارەی واقعیەتەکانی کۆمەڵگایەکەی هیچ پەیوەندی یەکیان بە یەکترەوە نی یە، وە بەتایبەتی ڕۆشنبیرە ڕۆژهەڵاتی یەکان بەرامبەر ڕۆژئاوا کەمێك دۆخی مێشکگەرایان هەیە. چونکە ئەو پرسە بەرچاوانە لەوانەیە لە شوێنێکی تر ببن بە پرسی مێشکی.

پرسی وا هەیە لە جێگایەك دروستە وە هەمان پرس لە جێگایەکی تر نادروستە: چونکە ڕۆشنبیرە ڕۆژئاوایی یەکان لەسەر بنەمای دیدگاو ئەنجامگیری یە واقعیەکانی مێژووی خۆیان گەیشتوون بە چەندین ئایدۆلۆجیاو بڕیاردان، وە چونکە ئەوان بۆ ڕۆشنبیرانی ناڕۆژئاوایی نمونە، ئەو ڕۆشنبیرە ناڕۆژئاوایی یانە هەمان بڕیاردانەکان و ئەنجامگیری یەکان و ئایدۆلۆجیایەکانی

ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوایی دووبارەدەکەنەوە و شی دەکەنەوە، وە لەسەر بنەمای هەمان ڕێژە لەبارەی کۆمەڵگاو مێژوو و ئاینەکەیان بڕیار دەدەن.
لەکاتێکدا کە بڕیاردانەکانی ڕۆشنبیرە ڕۆژئاوایی یەکان نادروستن و بڕیاردانەکانی ڕۆشنبیرە ناڕۆژئاوایی یەکان هەڵەن. وە دەبینین کە ڕۆژئاوایی یەکان وادەبینن کە مێژووەکەیان پێش سەدەکانی ناوەڕاست (نیزیکەی ٤٠٠ ز- ١٢٠٠ ن)، ڕۆم و یۆنانی شارستانی و پێشکەوتوویان هەبووە، وە کاتێك مەسیحی یەت هاتۆتە ئەوروپا، ئەو شوێنانە تاریك و لاواز بوون و بوونە ژێردەستە وە دواتر کە ئاین وەلانراوە ڕێنێسانس پەیدابووەو شارستانیەت گەڕاوەتەوە، وە دەڵێن بەپشت بەستن بەوە مێژووی ئێمە ئەوەی نیشان دا کە: سەرەتا ئاینمان نەبوو، پێشکەوتوو بووین، دواتر بووینە ئایندار، توشی هەرەسهێنان بووین، دواتریش کە ئاین ڕۆیشت، دوبارە بووینەوە شارستانی.
ڕۆشنبیری ڕۆژهەڵاتییش دێت هەمان بڕیاردانی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی دووبارە دەکاتەوە. هەتا بەرامبەر بە ئاینەکەشی. وە دواتر وایلێدێت کە دەبینێت کە ئاینەکەی یان مێژووەکەی یان پەیوەندی ئاین لەگەڵ شارستانیەتەکەی خۆی کە لە بنەڕەت دا پێچەوانەی ئەو پەیوەندی یەی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی یە، بە هۆکاری هەرەسهێنان دەبینێت وە دواتر شێوەیەك پەیدادەکات کە دەبینێت ئێستا، لەکاتێکدا لە هەمان ناوچە ئاین بوونی هەبوو، کتێبخانەکان و شارستانیەتەکان و ڕژێمە کۆمەڵایەتی یەکان و بگرە سیستەمی یاسایی پێشکەوتوشی لێ بوو کە ئێستا لێ ی نین: ئەو کتێبخانانەی کە لە سەدەی چوارەم (ی کۆچی) هەبوون، ئێستا لە جیهاندا بوونیان نی یە. کتێبخانە ناوی ماڵی قوتابخانە (دارالمکتب) بوو. بەڵام ٥٠ تا ٦٠ زانا تێیدا نیشتەجێ بوون.
لە هەموو لایەکانی دنیاوە قوتابیان دەهاتن لەوێ ماڵیان بۆ هەبوو و دەژیان و وە هەتا زەمالەیان هەبوو. وە هەرکاتێك هاتبان بۆ ئەوێ ژیانیان دابین بوو و لەژێر سەرپەرشتی ئەو مامۆستایانەی کە لە کتێبخانە نیشتەجێ بوون، کاریان دەکرد. بەڵام ئێستا تەنهاو تەنها بوینە ئادەمیزادی نمونە وەرگرو پێڵاو

بۆیاغکەر و ناچاریی وە بێجگە لەوەی کەلوپەلی ڕۆژئاوایی بەکاربێنین، هیچ بەکارهێنانێکی ترمان نی یە. نە بەرهەمی مێشکیمان هەیە، نە بەرهەمهێنانی بەرچاو و بەرجەستە، وە لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین کە دووبارەکردنەوەی پرسە بەرچاوەکانی ڕۆژئاوا بۆ ئێمە بوو-ون بەپرسی مێشکی.

بۆیە ئەو کەسانەی کە خولیای خوێندنەوەو بیرکردنەوەی ڕەهان، هەموو کات پێویستە پەیوەندی یان لەگەڵ واقعیەتی زیندووی ژیانی کۆمەڵایەتی بپارێزن تاوەکو بە یارمەتی زانست واقعیەتی کۆمەڵایەتی ڕوون بکەنەوە، وە بە یارمەتی واقعیەتی کۆمەڵایەتی زانست لە لادان بەرەو مێشك-تەوەرەیی بپارێزن دەنا دووچاری لادانی مێشکی دەبن. جۆرە مێشك-تەوەرەبوونێك کە بەناوی زانست، بەناوی فەلسەفە، بەناوی ئایدۆلۆجیا، بەناوی هونەر، کە لە بنەڕەتدا ڕەتکەرەوەی ئەو واقعیەتەیە کە هەیە: ئەمەش پرسێکە کە لە کۆمەڵناسی زانستی سەدەی نۆزدەم دا لەژێر ناوی لەخۆنامۆبوونی فەرهەنگی، لەخۆنامۆبوونی ڕۆشنبیری لەگۆڕێ بوو، وە ئێستاش بە توندی لەگۆڕێ یە.

ڕژێمی چینایەتی:

یەکێکی تر لە دوژمنەکانی مرۆڤ ڕژێمی چینایەتی یە. ڕژێمی چینایەتی دوایین و گەورەترین و بەهێزترین هۆکاری دژە مرۆڤی یە وە ئەمەش دەبێتە ژێرخانێك کە فەرهەنگ و ئەندێشەو ئاین و تاکەکان و بەکورتی هەموو شتێك گەندەڵ دەکات. چونکە مرۆڤ لە وێنەی مرۆڤبوونی لە هەموو ڕوویەکەوە ڕەش دەکاتەوە. کاتێك سەیری مێژوو دەکەین، دەبینین بۆ یەکەمین جار کە کۆمەڵی ئادەمیزاد کە حەقیقەتێکی ناوەڕۆکی جێگیرە، دابەش دەبێت بۆ دوو جەمسەری دوژمنی یەکتر، وە لە ئەنجامدا گەورەو بەندە، هەبوو و خاوەن هەموو شتێك و بەشخوراو پەیدا دەبن وە بتهەوێت یان نەتهەوێت دوو جۆر مرۆڤ پەیدا دەبن: مرۆڤێك کە خاوەنی چەند ڕێزێکە لەکاتێکدا نینی (خانەدان) وە مرۆڤێك کە چەند ڕێزێکی نی یە لەکاتێکدا هەنی (خەڵك). خەڵك بە جۆرێکی لێدێت کە لەو بەهایانەی کە هەر مرۆڤێك هەیەتی بێ بەش دەبێت وە خانەدانی بەجۆرێکی

لێدێت کە دەبێتە خاوەنی چەند بەهایەك کە لەبنچینەدا بەهای مرۆڤی نین. لێرەدایە کە مرۆڤ بەتەواوی ڕەتدەکرێتەوە.

کام مرۆڤە؟ من ئەو قسەیەی داستایوسکی لێرەدا دووبارە دەکەمەوە کە کاتێك کەسێك مرۆڤێك دەکوژێت، هەموو بەداخەوەن بۆ کوژراوەکە چونکە پێشتر زیندوو بوو وە ئێستا کوژراوە. لەکاتێکدا کە دەبێت بۆ ئەو کەسەش بەداخەوە بین کە ئەوی کوشتووە. چونکە ئەو مرۆڤ بوو وە ئێستا بووە بە بکوژ. وە ئالبرمەی لە کتێبێکی بچوکدا، بەڵام زۆر بیرمەندانەدا، کە یەکێکە لە باشترین ئەو کتێبانەی لەبارەی پەیوەندی زانستی داگیرکاری لە جیهاندا نوسرەوە، لەژێر ناوی "وێنەی وڵاتە داگیرکەرو داگیرکراوەکان"، دەڵێت کە پەیوەندی نێوان ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات نامرۆڤانە نی یە، پەیوەندی داگیرکارانەیە. هەموو هەوڵیان داوە تا لێکوڵینەوە بکەن لەوەی کە مرۆڤی ئەفریقایی و ئاسیایی و ئەمریکای لاتینی داگیرکراو چ کەموکورتی و لادانێکی هەیە وە هیچ کەسێك نەهاتووە بڵێت کە دوو کەس بوو–ون بە قوربانی ڕژێمی داگیرکەر. یەکێکیان مرۆڤی ئاسیایی و ئەفریقایین، کە مرۆڤی ئازاد بوو و ئێستا بۆتە مرۆڤێکی داگیرکراو: یەکێکی تریشیان مرۆڤی ئەوروپایی بوو کە داگیرکاری ئەوی کردە داگیرکەر.

بەرهەمی ناسراوی 'ئوجن یونسکۆ' بەناوی "کەرگەدەن"یش دەیهەوێت بڵێت کە لەم ڕژێمەدا، مرۆڤ دەبینین کە بۆئەوەی بمێنێتەوە، دەبێت قۆچێکی وەکو کەرگەدەنی لەسەر ناوچاوانی هەبێت بۆئەوەی پێ ی تێهەڵدات و بشکێنێت و غاربدات و بڕوات، دەنا لەناودەچێت. ئەگەر ئەو کارە نەکات دەبێتە چی؟ قارەمانی کافکا، 'شێوەگۆڕاو'، (ئەو کتێبەی کە سادقی هیدایەت وەریگێڕاوە).

بەکورتی لەم ڕژێمەدا، مرۆڤ لەناودەچێت. واتا دەگۆڕدرێت بۆ دوو دیاردەی نامرۆڤی: یەکێك بکوژ و یەکێك کوژراو. یەکێك داگیرکەرو یەکێك داگیرکراو. یەکێك بەرهەمهەڵگر کە گەنەیە، یەکێك بەرهەملێگیراو کە نەخۆشە. وە ئەم ڕژێمە چینایەتی یە لە درێژایی مێژوودا لە شێوەی جۆراوجۆر و ڕژێمی جۆراوجۆر و قۆناغی مێژوویی جۆراوجۆر دا خۆی دەنوێنێت. بەڵام نەك تەنیا بەو جۆرەی کە

ئوجن یونسکۆ دەڵێت مرۆڤ دەکات بە کەرگەدەن، وە نەك تەنیا بەو شێوەیەی کە کافکا دەڵێت کە مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ شێوەگۆڕاو، بەڵکو من لیستە تەواوەکەی دەخەمە ڕوو: ڕژێمی چینایەتی، مرۆڤ کە یەك حەقیقەتی یەکگرتوویە و هەموو تاکەکانی لە یەك ڕەگەزن، دەگۆڕێت بۆ چوار تیپی، چوار ئاژەڵی دژە مرۆڤی:

یەکێك گورگ، یەکێك ڕێوی، یەکێك مشك، وە ئەوانی ماون هەموو مشك. ئەمەیە کە دەبینم کە

مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ ماددی گەرایی، دەبێتە دیاردەیەکی ماددی:

دەگەڕێتەوە بۆ ئاین (بەو شێوەیەی ئاین لە مێژوودا بوونی هەبوو-وەو فەرمانڕەوایی کردووە)، دەبێتە ڕەتکەرەوەی ڕەها لەبەرامبەر غەیب metaphysic دا:

دەگەڕێتەوە بۆ زانست، زانایان دەکاتە قوربانی چەمکە نازانستی و ئاراستە نازانستی یەکان و هێنانەدی ئامانجە نازانستی یەکان:

دەگەڕێتەوە بۆ پیشەسازی، پیشەسازی لەو جێگایانەی کە دەبێت لە خزمەتی مرۆڤ و بەرهەمهێنانی پێداویستی یەکانی مرۆڤ بێت، مرۆڤ وەکو پارچەیەك لەناو خۆیدا سەرقاڵ و گێژ دەکات و کاری لێ دەردەکێشێت.

ڕوو لە تایبەتکاری دەکات و زۆر بەرهەم دێنێت و بەرەوپێش دەچێت وە بۆخۆی دەبێتە گەورەترین قوربانی ئەو زیاتر بەرهەمهێنان و زیاتر پێشکەوتنە.

بەکورتی: ڕوو لە هەر ئاین و ڕژێم و ئایدۆلۆجیایەك دەکات، دەبێتە دیلی ئەم دژیەکی یە چینایەتی یە. چونکە ڕژێمی کۆمەڵایەتی ئەوی گۆڕیوە بۆ دوو جەمسەری نامرۆڤی، وەکو مەتەڵێکی گەورە لەسەر ناوچاوانی سەدەی ئێمە، وە وەکو پرسیارێکی مەزن لەسەر پەردەی بیرو ئەندێشەکانی ئەم ڕۆژگارە کاریگەری دروستکردووە، کە ئەمە چی یە؟! کە کێ یە؟!

وە هەموو فەلسەفەکان و زانست و ڕۆشنبیرەکان دەبێت جۆرێك بڕوای ڕوون و ناسینی وردیان لەبارەی چۆن بوونی مرۆڤ هەبێت چونکە هەر ئایدۆلۆجیایەك، هەر شارستانیەتێك، وە هەر فەلسەفەی مێژوویەك، وە هەر

سیستەمی پەروەردەو فێرکردنێك، وە هەر شێوە ژیانێك کە هەبێت پێویستە بۆ ڕزگاری بێت. بەپێچەوانەی ڕابردوو کە مرۆڤ دەکردە قوربانی یان ڕەتیدەکردەوە و لەبەرچاوی نەدەگرت.

ڕزگاری مرۆڤ واتا چی؟

ڕزگاری مرۆڤ واتا دانانی مرۆڤ لە دۆخێکدا کە بتوانێت لەوپەڕی تەواویی گونجاودا ئازادو هۆشیار و داهێنەر بێت. ئەڵبەتە ئێستاش داهێنەرە، بەڵام ئازاد نی یە. بۆیە دەبێتە ئامێری دەست بۆ بەرهەمهێنانی یەکێکی تر. هۆشیارە، بەڵام ئازاد نی یە. بۆیە هەڵگری هۆشیاری یەکە وەکو کۆیلە بۆ گەورەکەی دەفرۆشرێت. هۆشیار و ئازاد و داهێنەر، هەر ئەوەی کە خوا لە بانگەوازەکەی خۆیدا ئەوی وەکو جێنشینی خۆی لە سروشتدا ناساندووە: وە خوا کێ یە؟ ئاگاو ئازاد و داهێنەرە. ئەمەیە کە لە سەدەی بیستەم دا، وە لە سەدەی نۆزدەدا کە هەموو شتێك وەڵامی بۆ دۆزرابۆوە، مرۆڤ دەبێتە قەیران و مەتەڵ و هەموو ڕۆشنبیران بەدوای دروستکردنی بڕوایەك و ڕێگایەکی ڕزگاری دا بۆ ئەو مرۆڤە دەگەڕێن تاوەکو ئازادی و هۆشیاری و داهێنەریەکەی لە هەموو ڕژێمەکانی پیسی و زانست و دەسەڵات و دژیەکی ڕزگاری بکەن. بەتایبەتی ڕێزی بەرزتر لە سروشت بەو بدەنەوە. -کە ماددی یەت ژیان و ئازادی لێ ستاندووە.- لەبەر ئەوەیە کە لەم ڕۆژگارەدا ویژدانی نەوەی نوێ بەدوای ئاینێکدا دەگەڕێت کە باڵاتربێت لەو ئاینەی کە بەسەر مێژوودا فەرمانڕەوا بووە، وە بەدوای دۆزینەوەی وێنەیەکی ڕوحانی یە لە بوون. دەگەڕێت بەدوای ئەوینێکی ژیربێری مرۆڤی بۆ ژیان بەسەربردن و ئایدیاڵێکی گەورەتر لە چوارچێوەی ڕژێمە نزمەکانی ئەقڵی پیشەسازی تەکنیکی کە بەسەر ئێمەدا سەپێندراون: وە هەر لەم جۆرە هەوڵانەیە کە ئێمەش لە گەڕان بەدوای ئیسلام و شیکردنەوەی کەلتور و ئاینی ئیسلام و کەلتوری ڕۆژهەڵاتی خۆماندا بەدوای بەهایەکانەوەین تاوەکو وەڵامێك بدەیینەوە بە نیازەکانی ئەم ڕۆژگارەی ویژدانی مرۆیی.

## ئه و وتانەی دەبێت بەزێڕ بنوسرێت

♣ ئەگەر بە پێـیانیش بێت سەفەر بکە! لە مانەوەدا دەگەنێ ی. کۆچکردن وشەیەکی مەزنە لە مێژووی دروستبوونی مرۆڤ و شارستانیەتەکاندا.

♣ چاوەڕوانی واتا وتنی 'نا' بەوەی کە هەیە...

♣ ئەگەر نەتواندرێت هەرەس بە ناڕەوا بهێندرێت دەتواندرێت ڕیسوا بکرێت، ئەگەر نەتواندرێت ڕاستی بچەسپێندرێت دەتواندرێت بسەلمێندرێت و باس بکرێت و بە سەردەم بناسێندرێت و بە زیندوویی بهێڵدرێتەوە.

♣ گریان، تەنیا کاری بێ توانایەکە وە من زۆر بێ توانام!

♣ هێنانە ناوەوەی زانست و پیشەسازی بۆ ناو کۆمەڵگایەکی بێ بڕواو بێ ئایدۆلۆژیایەکی ڕوون وەکو چاندنی درەختی گەورەو میوەدارە لە سەر خاکێکی نەگونجاو و لە وەرزێکی نەگونجاودا.

♣ نەخوێندەواری و بێ هەستی کاتێک لەگەڵ بێ ڕێزی دا تێکەڵ بوو مەعجونێکی لێ دروست دەبێت کە لەم ڕۆژگارەدا دەبینین زۆر دەرخواردی خەڵکی دڵ ساف و بێ خەبەری ئێمەی دەدەن!

♣ چەند زۆرن ئەو کەسانەی کە هەمیشە قسەدەکەن بەبێ ئەوەی هیچ بڵێن. وە چەند کەمن ئەو کەسانەی کە قسە ناکەن، بەڵام زۆر دەڵێن.
♣ هەژاری بەسەربردنی شەو نیە بە برسیەتی، هەژاری بەسەربردنی رۆژە بێ بیرکردنەوە.

♣ لە تەنیایی دا بۆناو خەڵك هەڵدێم وە لەناو خەڵك دا پەنا بۆ تەنیایی دەبەم!
♣ مەگەر غرورەکان بۆ ئەوە پەروەردە ناکەین تاوەکو لەسەر ڕێ ی ئەو گەشتیارەی چاوەڕوانی هاتنی بیانکەینە قوربانی.....

♣ ئەی خزمی ڕاستەقینەی من کە هەرگیز لەگەڵ تۆ نەبووم، ئەی دوێنراوی من کە هیچ کاتێك لەگەڵ تۆ قسەم نەکردووە، بەبێ تۆ لەگەڵ بێگانەیی و بێدەنگی دا دەمرم.

♣ گەورەترین ڕەنج ناتوانێت کە بێدەنگی و بەرگەگرتن لە من بستێنێت، بەڵام بچوکترین ناسازگاری تا ئاگرێك لە مندا دروست نەکات وازم لێناهێنێت.

♣ بەو ئەندازەیەی کە لەڕووی بیرەوە تەواوتر دەبین، سنورەکانی ئەو جیهانەی تێیدا دەژین فراوانتر دەبن.

♣ ئارەزووم ئەوەیە کە شمشێری قەیسەر لە دەستی عیسادا ببینم، گیانی ڕۆژهەڵات لە ئەندامەکانی شارستانیەتی ڕۆژئاوادا، وە مێشکی دیکارت لەگەڵ دڵی پاسکاڵ، وە دانایی ئیبن سینا لەگەڵ بینینی ئەبو سعید ئەبی خەیر، وە ئەوین و ژیری وەکو دوو باڵ بە دوو لای مرۆڤەوە.

♣ لەناو شتەکانی جیهاندا چوار شت خاوەندارێتیان لەسەر نیە: ... کتێب، پەرستگا، جوانی ...وە دڵ. ...

♣ قەڵەم تەوتەمی هۆزی منە، گیانی "ئێمە" لەودا بۆتە یەك، "ئێمە" لەودا تێکەڵ بووین، پێکەوە دەژیەین و بەیەکتر دەگەین، سەرەڕای ژیان -کە وردو خاش دەکات- وە کات -کە جیابوونەوە دروست دەکات- وە خۆپەرەستی - کە بێگانەیی دێنێت- وە ترس -کە وادەکات هەر کەسێك بەرەو خۆی هەڵبێت- وە ژیری - کە تاڵەکان لێك جیادەکاتەوە- وە تەنها یان دەکات.

♣ ...قەڵەم تەوتەمی منە، ئەو ناهێڵێت کە من بیرم بچێتەوە، کە لەبیر بچمەوە، کە لەگەڵ شەو ڕابێم، کە باسی خۆر نەکەم، کە دوێنێم لەبیر بچێتەوە، کە سپەینێم بەبیردا نەیەت، کە چاو لە "چاوەڕوانی" بپۆشم، کە خۆم بەدەستەوە بدەم، نائومێد بم، ڕوو لە خۆشبەختی بکەم، خوو بە خۆبەدەستەوە دانەوە بگرم، کە ...!

♣ وە ئەوانەی مل بۆ هەموو سەرشۆڕی یەك کەچ دەکەن تا بە زیندوویی بمێننەوە، خەڵکی بێدەنگ و پیسی مێژوون. شەهید مرۆڤێکە کە لە سەردەمی نەتوانین و سەرنەکەوتن دا، بە مەرگی خۆی بەسەر دوژمندا سەردەکەوێت، وە ئەگەر دوژمن تێکنەشکێنێت، ڕیسوای دەکات.
شەهید دڵی مێژوویە، هەروەکو چۆن دڵ بە دەمارە وشکەکانی ئەندامەکان، خوێن و ژیان دەبەخشێت.

♣ هەر کاتێك بەناڕەوا خوێنێك لە هەر گۆشەیەکی زەوی بڕژێت، تەواوی ئەو کەسانەی کە لە بەرامبەری دا بێدەنگن پەنجەکانیان ڕەنگینە (سورە).

♣ ئاگایی و ئەوین، دەتوانن زیندانی کۆمەڵگاو شەمەندنەفەری مێژوو بشکێنن.

♣ وە ئێوە ئەی ئەو گوێیانەی کە تەنها ووتنی وشەدار دەبیستن لەمەولا بێجگە لە بێدەنگی هیچ قسەیەك ناکەم، وە ئێوە ئەو چاوانەی کە تەنها لاپەڕە ڕەشەکان دەخوێننەوە لەمەولا بێجگە لە دێڕی سپی نانوسم، وە ئێوە ئەو کەسانەی کە هەرکاتێك لەناوتانم زیاترم لەوەی لەناوتان نیم، لەمەولا من کەمتر دەبینن...

♣ مرۆڤ ناچار نیە کە هەموو ڕاستی یەکان بڵێت، بەڵام ناچارە ئەوەی دەیڵێت ڕاست بێت.

♣ژیان چی یە؟
نان، ئازادی، فەرهەنگ، بڕوا و خۆشەویستی!

♣ ژن لە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی دا، بە کۆمەڵگای وێچوو بە ئیسلامی ئێستاشەوە، بەناوی ئاین و داب و نەریت لە هەمووان زیاتر ڕەنج دەکێشێت وە هەتا بەناوی ئیسلامەوە، ئەو ماف و هۆکارانەی کە خودی ئیسلام بە ژنی داوە، لێیان ستاندوتەوە وە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی ژنیان هێناوەتە ئاستی "ئامێرێکی فەرش شوشتن" وە بەهای مرۆڤی ئەویان بە شێوەی "دایکی منداڵەکان" هێناوەتە خوار، لە هێنانە سەر زمانی ناوی ئەو شەرم دەکەن، ئەو بە ناوی منداڵەکەیەوە بانگدەکەن هەرچەندە منداڵەکەی کوڕیش بێت!

♣ دەردێکی خراپە، لەناو کۆمەڵی خەڵکدا تەنیا بوون، لە نیشتیمانی خۆتدا ڕەنجی غوربەت کێشان.

♣ بەرپرسیاریەتی مرۆڤی-ئازادیخواز بوون واتا چی؟
دەبێت بزانێت کە لە جەنگدا هەمیشە مێژوو وە هەمیشە کات وە هەموو شوێنێکی سەرزەوی وە هەموو گۆڕەپانەکان کەربەلان، وە هەموو مانگەکان موحەرەمن وە هەموو ڕۆژەکان عاشوران

هەڵببژێرێت: یان خوێن یان پەیام، یان حوسێن بوون یان زەینەب بوون، یان بەو شێوەیە مردن یان بەم شێوەیە مانەوە

♣ عەلی فەرمانڕەوایەك بوو كە فەمانی بەسەر بەشێكی گەورەی ئەفریقادا هەبوو، بەڵام زیندانی سیاسی نەبوو. هەتا یەك زیندانی سیاسی و كوشتنی سیاسیش. وە تەڵحەو زوبێر كە بەهێزترین كەسایەتی كاریگەر و مەترسیدار بوون كە لە ڕژێمەكەی ئەودا پیلانگێڕییان كردبوو، كاتێك هاتن وە داوای ڕووخسەتیان كرد بۆئەوەی لەژێر قەڵەمڕەوی ئەو بڕۆنە دەرەوە، وە دەشیزانی كە بۆ پیلانگێڕی یەكی مەترسیدار دەڕۆن، بەڵام ڕووخسەتی پێ دان، چونكە نەیدەویست ئەو نەریتە بۆ شمشێر بەدەستان چەتە سیاسی یەكان بەجێبهێڵێت كە لەبەر سیاسەت ئازادی مرۆڤ پێشێل بكەن.

♣ من كە لە تەواوی ژیانمدا بینەری قوربانی بوون و چەوسانەوەی ڕاستی یەكان بوو وم، بەهۆی مرۆڤە بەرژەوەندی پەرستەكانەوە، گرێ ی دەرونیم بۆ دروست بووە لەبارەی بەرژەوەندی یەوە وە ئەو بڕوایەم هەیە كە:

"هیچ شتێك بێجگە لە خودی ڕاستی، بەرژەوەندی نیە."

♣ مرۆڤ لە برسیەتی دا ناتەواوە، مرۆڤ لە كەڵك لێوەرگیراندا ناتەواوە، مرۆڤ لە بێبەش بوون لە خوێندەواریدا ناتەواوە، مرۆڤ لە بێ بەشبوون لەو بەخششانەی خوا داویەتی ناتەواوە، بەڵام "مرۆڤە"

بەڵام ئەو مرۆڤەی لە "ئازادی" بێ بەشكراوە "مرۆڤ" نیە.

♣ ویستم بڵێم: فاتیمە كچی خەدیجەی مەزنە، بینیم فاتیمە نیە

ویستم بڵێم: فاتیمە كچی محمدە، بینیم فاتیمە نیە

ویستم بڵێم: فاتیمە هاوسەری علی یە، بینیم فاتیمە نیە

ویستم بڵێم: فاتیمە دایكی حەسەن و حسێن-ە، بینیم فاتیمە نیە

ویستم بڵێم: فاتیمە دایکی زەینەب-ـە، دوبارە بینیم فاتیمە نیە
نا هەموو ئەوانەیە، وە نە هەموو ئەوانە فاتیمەن
فاتیمە، فاتیمەیە.

♣ نەورۆز کە تەمەنی چەندین سەدەیە و شانازی دەکات بەسەر هەموو جەژنەکانی جیهاندا، هۆیەکەی ئەوەیە کە پەیماننامەیەکی دروستکراوی کۆمەڵایەتی یان جەژنێکی سەپێندراو نییە، جەژنی جیهانە وە ڕۆژی شادی زەوی و ئاسمان و خۆر و جۆشی پشکوتن و لەدایکبوونی خوێنگەرمی و لێواولێوە لە جۆش و خرۆشی هەموو سەرەتایەك.

♣ وە تۆ ئەی ڕۆڵەی من، ئەگەر ناتهەوێت گرفتاری دەستی هیچ دیکتاتۆرێك بی تەنها یەك کار بکە: بخوێنەوە و بخوێنەوە و بخوێنەوە!!

♣ لە وڵاتێکدا کە تەنها حکومەت ماڤ قسەکردنی هەیە، بڕوا بە هیچ قسەیەك مەکەن.

♣ کەس منی دروست نەکرد، خوا دروستی کردم، نەك بەو شێوەیەی کە "کەسێك دەیهەویست"، چونکە من کەسم نەبوو، کەسم خوا بوو، کەسی بێ کەسان.

♣ بۆ ڕۆژئاوا، ئیپارتاکوسی نەخوێندەوار کارا ترە لە ئەکادیمی یەکی وەکو سوکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ، وە بۆ ڕۆژهەڵات، ئەبو زەری عەرەبی بیابانی لە سەدان ئیبن سیناو ئیبن ڕوشد و مەلا سەدرا کاریگەرترە.

♣ ڕاسترین قسە ئەو قسەیەیە کە هیچ بەرژەوەندی یەك نییە بۆ وتنی.

♣ ئەگەر ناتوانی خزمەت بە خەڵك بکەی، بڕۆ تاوەکو خیانەت نەکەی.

♣ نابێت زەلکاوەکە وشك بکەین، ناکرێت و نابێت!
بەڵکو پێویستە سەرچاوەکە بدۆزینەوەو نیشانی بدەین.

♣ گەورەترین نەخۆشی لە بیــر دا، بەگشتی بوونی یەتی (تێکەڵ بوونی لەگەڵ دابو نەریتی کۆمەڵگا)، وە دەمارگیری توند نیشانەی بەگشتی بوونە، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە هۆکار ببێتە ئامانج، وە ئامانج لەناوبچێت!

♣ خۆ گەیاندنە بەهەشت، لە کاتێکدا ئەوانی تر لە جەهەندەمی ژیان و زەوی دا بەجێدێڵی جۆرێکە لە هەڵاتننی ڕیاکارانە و پەست کە لە شێوەی بیرکردنەوەی بازرگانانەوە سەرهەڵدەدات.

♣ خۆ-ویستی زۆر گران و بێ بەزەیی یە، بەتایبەتی ئەگەر بەبەرژەوەندی پرچەك بێت، وە بتوانێت بەهۆی بڕواوە خۆی ئاراستە بکەت.

♣ ئاه! تەنیایی، بێدەنگی، فرمێسك، مەرگ...چەندە وشەی جوانن!

♣ لەو ساتەدا کە حسێن حەجی بە نیوەکراوی بەجێهێشت و بەرەو کەربەلا هات، ئەو کەسانەی کە بەردەوام بوون لە تەوافکردن (سوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا) کاتێك حسێن ڕۆیشت، یەکسانن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەهەمان کاتدا، بەدەوری کۆشکی سەوزی معاویەدا تەوافیان دەکرد!

♣ تەمەنم "وەکو کەرکەدەن تەنها سەفەر دەکەم" وە تەنهایی فەلسەفەی منە وە جودایی ئاینی منە وە بێ کەسی جیهانبینی منە.

♣ پیاوی ئاینی سەفەری زۆر بەسادەیی ڕێگای خۆی شارەزایە، ئەو تایبەتکاری "کوڵاو لەسەرنانی شەرعی یە". ئەو "پۆشاکی پارێزکاری دەکاتە

باڵای ستەمکاری"، وە کوڵاوی شەرعی دەکاتە سەر بێ بڕوایی! پیاوی ئایینی سەفەوی کاری بەڕەوا نیشاندانی دامودەزگای سەفەوی یە، وە ناچارە بۆ هاوکاریکردنی "بڕواداران بە شەرع" لەگەڵ "حکومەتی ناشەرعی" ڕێگایەك بدۆزێتەوە، وە بۆ ئەو کارەش دەبێت تەکنیکێك دابهێنێت کە بتوانێت پارەی حەرام حەڵاڵ بکات!

♣ ئەی ئەوەی کە مەرگی سورت هەڵبژارد تا ئەویندارانت لە مەرگی ڕەش ئازاد بکەی، تا بە هەر دڵۆپەیەکی خوێنت نەتەوەیەك ڕزگار بکەی، وە مێژوو بخەیە گەڕ، وە جەستەی مردوو و گەنیووی چەرخێك گەرم بکەیەوە، وە جۆش و خرۆشی ژیان و ئەوین و ئومێدی بدەیەی! بڕوای ئێمە، نەتەوەی ئێمە، مێژووی ئایندەی ئێمە، جەستەی چەرخی ئێمە، "پێویستی بە تۆ و خوێنی تۆیە."

♣ سەرمایەداری "پارە" دەکاتە جێنشینی "خوا"
وە "بەرهەمهێنان" دەکاتە جێنشینی "یەکتاپەرستی"
وە "ئابووری" دەکاتە جێنشینی "ئەوین"
وە "هێز" لە جێگای "ڕاستی" دادەنێ
وە "چێژ" لە جێگای "تەواوی" دادەنێ
"دەسەڵات بەسەر سروشتدا" لەجێگای "خۆ-کۆنترۆڵ-کردن" دادەنێ.

♣ ژن ئەوین دەچێنێت و کینە دروەدەکات
میراتی نیوەی میراتی تۆیەوە سزای لە تۆ زیاترە
تەنها دەتوانێت یەك هاوسەری هەبێت، وە تۆیان ئازاد کردووە چوار هاوسەرت هەبێت
بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوبەشی لە هەر تەمەنێکدا بێت گەورەی پێویستە،
وە تۆ هەرکاتێك بتهەوێت بە پێ ی یاسا ژیانی هاوبەش پێکدێنی

لە زیندانێکدا بەناوی کچێنی دا زیندانە وە تۆ...
ئەو لێی دەدرێت وە تۆ دادگایی ناکرێ ی
ئەو مندالْ دێنێتە دنیاوە وە تۆ ناوی مندالّەکە هەلّدەبژێری
ئەو ژانی هەیە وە تۆ نیگەرانی ئەوەی کە کچ نەبێت
ئەو شەونخونی دەکێشێت وە تۆ خەو بە پەریەکانی بەهەشتەوە دەبینی
ئەو دەبێتە دایك، وە لە هەموو شوێنێك دەپرسن: ناوی باوکت چیە
وە هەموو ڕۆژێك ئەو لەدایك دەبێت: عاشق دەبێت، دەبێتە دایك، پیر دەبێت و دەمرێت
وە چەندین سەدەیە کە ئەو عیشق دەچێنێت و کینە درەو دەکات
وە ئەوە ڕەنجە..

♣ کەسێك دەتوانێت بۆ نان و ئاسایش و چێژ و هەبوونی ماددی خەلّك کۆشش بکات کە بۆخۆی بیر لە نان و ئاسایش و چێژ و ژیانی ماددی نەکاتەوە.

♣ مرۆڤ بوونێکی بێ سیفەتی ویچوو بە گیاندارە،چونکە پێویستی بە خۆراك و چاودێری هەیە لەکاتی هاتنە دنیاوە، کە ئامادەباشی بوون بە مرۆڤـی تێدایە، وە لە درێژایی کاتدا، کە مێژوویە، وەڕاستگەڕانی مرۆیی دەدۆزێتەوە...مرۆڤ بە ئەندازەی ئەو نیازانەی هەیەتی مرۆڤـە...تا نیازەکانی گەورەتر بن مرۆڤـترە...

♣ بریـا بەلایەنی کەمەوە لە دەریادا مردباین، بریـــا لـەجیْ ی تـابوت و کفن و دفن (پۆشاککردن و بەخاك سپاردن) و گۆڕ و بەردی سەر سینگمان، هـەر کاتێك مەرگ بەدوامانـدا دەهـات، نیزیکەکانمان، نـا، هاوڕێ یەکانمان ئێمەیان لەسەر بەلەمێك دادەناو دەیانخستینە نـاو دەریاو بەدەستی شەپۆلەکانیان دەسپاردین تـاوەکو بەپەلـە ئێمـە لـە کـەنارەوە، لـە وشکانی و مرۆڤـە وشـکەکانی وشـکانی دووربخاتەوە و بە خلیسکە لەسەر سینگی شەپۆلەکان تا ناوەڕاستی دەریا بمان

بات، تا لەوێ، ئەو شوێنەی کە ئاسمان لە هەموو لایەکەوە بەسەر دەریادا دەڕژێت و جیهانێکی تر دروست دەکات، بە تاقی تەنیا دیدارمان لەگەڵ مەرگ کردبا، بێدەنگ و جوان و ئارام، بێ شیوەن و گریان و قسەو قسەلۆکی ڕاست و درۆی تازیەباران و نێژەران و بێ ڕێوڕەسمی شردن و کفن و دفن و سەر قەبران و تازیەداری و شەوی حەوتەم و جل و بەرگی ڕەش و ڕیش هێشتنەوەو ...تاد کە هەموویان دەستیان خستۆتە ناو دەستی یەکتر تاوەکو مردن ناشیرین بکەن، وە تاکە ڕووداوی گیانی بە گیانی و ڕاست و جدی و پاك و مەزنی ژیانی ئێمە لەسەر ئەم زەویە ئاڵودە بکەن.

♣ گیاندار جموجوڵی هەیە، بەڵام "سەری لە زەوی"دایە! وە درەخت لە زەویەوە سەری بەرزکردۆتەوە بەڵام "پێ ی لە خاکدایە" وە ئادەمیزاد گیاندارێکە کە وەکو درەخت ڕوو لە ئاسمان دەڕوات.

♣ ئێستا تۆ بە مەرگ ڕۆیشتووی وە من لێرە تەنیا بەو ئومێدەوە هەناسە دەدەم کە بەهەر هەناسەیەکم هەنگاوێك لە تۆ نیزیکتر ببمەوە، وە ئەوە ژیانی منە...

♣ بۆ ئەوانەی کە خویان بە ژیانی ڕۆژانەوە گرتووە و لەگەڵ خۆیاندا دەمێننەوە، مەرگ کارەساتێکی ترسناك و شوم و ڕوخێنەرە، بزربوونە لە نەبووندا.

♣ هەمیشە درەنگە، هەمیشە دەبێت وا دابنێین کە دەرفەت نیە وە هەرگیز قسەیەك کە دەکرێت ئەوڕۆ بیکەی، کارێك کە دەکرێت ئەوڕۆ بیکەی نابێت بیخەیە سبەینێ، چونکە هەمیشە درەنگە. بەپێچەوانەی ئەوانەی بەرژەوەندی-یانە بیردەکەنەوەو دەڵێن ئێستا زوویە، من دەڵێم هەمیشە درەنگە، هەر کارێك کە ئێستا دەمانەوێت بیکەین پێویست بوو سەدان ساڵ پێشتر کردبامان.

♣ چەند ناشیرنە باسی قوربانی-دانەکانی خۆت لە پێناوی بڕوایەکەتدا بکەی! چەند ناشیرنە!

♣ چ کەسانێك مەزنترین تابلۆ هونەریەکان دەکڕن؟ ئایا هونەرمەندان دەیانکڕن؟ مشتەری یەکانی مەزنترین تابلۆ هونەریەکان لە زیادکردنەکاندا کێن؟ سەرمایەدارانن. ئەوە گەورەترین خەمی هونەرە وە گەورەترین کۆیلایەتی هونەرەو ئەوپەڕی هەرەسهێنانی هونەرە.

♣ ئەفریقا– وەکو دلۆپێك فرمێسکە، دلۆپە فرمێسکێکی گەرم! بەڵێ، ئەفریقا فرمێسکی زەوی یە، دڵی تواوەی زەوی یە.

♣ ئایەتێك لە ئینجیلدا هەیە کە من زۆر خۆشم دەوێت، دەڵێت: 'ئەی مرۆڤەکان! بەو ڕێگایانەدا مەڕۆن کە ڕێبوارەکانی زۆرن: بەو ڕێگایانەدا بڕۆن کە ڕێبوارەکانی کەمن.' پیاوە ئاینی یەکانی قوستەنتینیە بۆئەوەی پەیڕەوی لە ناوەڕۆکی ئایەتەکە بکەن هیچ کاتێك بە شەقامە سەرەکی و فەرمیەکاندا نەدەڕۆیشتن، بەڵکو بە کۆڵانە چۆڵەکاندا دەڕۆیشتن. ئەوە نیشان دەدات کە: جاری وایە جوانی یەکی سەرسامکەری بیرێکی باڵا وە قسەیەکی قوڵ لەو مێشکانەدا کە شایستەیی تێگەیشتنی ئەویان نییە، ئەو بیرە یان قسەیە بە چ شێوەیەکی پێکەنیناوی دەردێنن و نامێنێت.

♣ بەرژەوەندی!

ئەو چەقووە بێ بەزەیی یەی کە هەمیشە ڕاستی بەو بەپێ ی شەرع دەکوژرێتەوە!

♣ هەرگیز لەبەر ستەم نەمناڵاندووە؛ وە لە دوژمن نەترساوم، وە لە شکست نائومێد نەبوو–وم، بەڵام ئەو وشەی شومەی "بەرژەوەندی" دڵم بەسەختی ئازار دەدات.

♣ هەراس لە بەزیندوویی–مانەوە، ژیان لەبیر دەباتەوە.

♣ بانگی شێوان!
مەگەر بانگی شێوان بۆخۆی زمزمەیەك نیە بۆ مەرگی خۆر!

♣ لێگەڕێن با سەعاتەکان بنوون... بێ هودە ژیان بەسەربردن پێویستی بە ژماردن نیە...
♣ ئەو کەسانەی وەکو عوسمان دەژین و ئەبو زەڕ یان خۆش دەوێت کەم نین، وە ئەوانەش کە دەستیان لەناو دەستی معاویە دایەو بۆ حوسێن دەگرییەن، وە ئەوانەش کەم نین کە هەوڵدەدەن وەکو فاتیمە بدوێن بەڵام شێوازی ژیانیان لاساییکردنەوەیەکی بێزهێنەری شازادە خاتوونە.
لە حەج دەگەڕێنەوە –ئەو شوێنەی کە بەلایەنی کەمەوە یەکسانی دەبێت تێدا جێبەجێ بکرێت هەتا ئەگەر تەنیا وەکو شانۆیەکیش بێت– لاف لێ دەدەن کە بارو دۆخی ئێمە، کاروانی ئێمە، هۆتێلی ئێمە و خواردنی ئێمە لە هی هەموان باشتر بوو، وە یان نقومی چێژ دەبن کە لەو سەفەرەدا پێش هەموان کەوتوونەتەوەو وە بۆخۆیان بە هۆشیاری و شایستەیی یان بە جادووی پارە هەموو کێشەکانیان چارەسەر کردووەو وە پێش کەوتوون(بە چوونە حەج).
ئەوانە وەکو ئەو مارکسیانەن کە بە 'بی. ئێم. دەبل یوو'یەوەن کە لە ئایندا، بەدوای ئاراستەکردنێکی بێهۆشکەر بۆ پڕکردنەوەی لاوازیەکانی بوونی خۆیان دەگەڕێن.

♣ ئەو ڕێگایەی کە لە گڵـ'ـەوە تا خوا کێشراوە ناوی "ئاین"ە.
"ئاین" ئامانج نیە، "ڕێگا"یـە.
تـەواوی ئـەو بەدبـەختی یانـەی کـە لـە کۆمـەڵگا ئـاینی یەکانـدا دەبینـدرێت، هۆکارەکـەی ئەوەیە کە ئایـن گیـان و ئاراسـتەکەی گۆڕاوە وە لـە ئەنجامـدا ئـەو ئەرکەی هەیەتی گۆڕاوە وە ئەوەش هۆکارەکەی ئەوەیە کە "ئاین"ـیان کردوّتـە ئامانج.

♣ سوێند بە قەڵەم، بەو خوێنە ڕەشەی کە لە گەرووی دەتکێت سوێند، بەو ڕیزە خوێنـەی کـە لـە زمـانی دێـت سوێند، بـەو هـاوارە دەرددارانـەی کـە لـە سـینگی دێتەدەر سوێند...کە تەوتەمی پیرۆز نافرۆشم، نایشکێنم، گۆشت و خوێنەکەی نـاخۆم، نایدەمـە دەسـت زۆری (دەسـەڵات)، بـە تورەکـەی زێـڕی (سـەرمایە) نابەخشم، وە پەنجەکانی تەزوویری (مەلاو پیاوی ئاینی) نـادەم، دەستم دەکەمـە قەڵـەم وە قەڵـەمم لەدەسـتم بـەرنادەم، چاوەکانم کوێر دەکـەم، گـویّ یـەکانم کـەڕ دەکەم، پیّ یەکانم دەشکێنم، پەنجەکانم ئەڵقە ئەڵقە دەبڕم، سینگم دەدڕم، دڵـم دەکوژم، هەتا زمانم دەبڕم، وە لێوەکانم دەدرووم...
بەڵام قەڵەمەکەم نادەمە بێگانە.

♣ کۆمـەڵگای دواکـەوتوو ئەگـەر هۆشـیار نـەبێت، کە ئایینێکی پێشکەوتووشی هەبێت، پێش ناکەوێت، بەڵکو ئاینە پێشکەوتووەکەش تا ئاستی خۆی دێنێتـە خوارەوە.

♣ ئایا حوسێن-یش دەیتوانی وەکو خوا-پەرستان بڕواتە گۆشەیەك و پەرستن ئـەنجام بـدات، وە بـەو نـاوەی کـوڕی عـەلی و فاتیمەیـەو نـەوەی خۆشەویـستی پێغەمبەرە کەواتە بەهەشتی بۆ گەرەنتی کراوە، بیّ دەنگ بێت؟ ئەو (حسێن) ئەو دڵنیایی یەی نیە کە موسوڵمانانی ئێمە هەیانە، ئەو بەرپرسیارە.

♣ بڕوا بە ئاین لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەیە، بەڵام هۆشیاری ئاینی و ناسینی ئاین بوونی نیە.

♣ گوتیان پەیمان ببەستە! نەمبەست، گوتیان بمێنەوە! نەمامەوە، گوتیان داوا بکە! داوام نەکرد ئەزیەتیان دام، دیلیان کردم، بێ ناویان کردم، برینداریان کردم تاوەکو خۆم بدەم بەدەستەوە وە خۆم نەدا بەدەستەوە، تا ڕامم بکەن، وە ڕام نەبووم، تا ببیستم، نەمبیست، تا لە غەریبیدا بمێنمەوە، نەمامەوە، تا بە شەوەوە خوو بگرم، هەمان نەناسراو کە وامدەبینی دڵم لەگەڵی ئاشنایە نەیهێشت کە لەگەڵ ئەو ئاشنایانە کە دڵم بێگانەیی دەکرد لەگەڵیان بمێنمەوە.

♣ کەسی کۆچەر هەرێمێکی سەربەخۆیە،
مرۆڤێکی ڕەهایە!
♣ ئالبێرت کامۆ دەڵێت: "من هەڵدەگەڕێمەوە، بۆچی هەڵدەگەڕێمەوە؟ چونکە جیهان دژی مرۆڤ-بوونی منە، چونکە ئەو جیهانە لەسەر بنەمای ناداد و ستەم و دەستدرێژیکردن دژی مرۆڤ دروست بووە، ناچار من هەڵدەگەڕێمەوە دژی خواوەند، بەڵام خواوەند بوونی نیە!"
ئافەرین. مست لە هەوادانە! ئەوە پاڵەوانیەتی نیە، من دژی کەسێك هەڵدەگەڕێمەوە کە بوونی نیە! ئایا ئەوە چ جۆرە هەڵگەڕانەوەو نارەزایی دەربڕینێکە؟ هەڵگەڕانەوە لە دژی هیچ کەس، هەڵگەڕانەوە لە دژی کەسێك کە بۆخۆت دەڵێ ی نیـــە؟

♣ بەشێك لە کتێبی ژیانم تەواو بووە، وە ئەگەر خوا بیهەوێت بەشێکی تر دەست پێدەکات کە ئومێدەوارم، لەو بەشە لاوازتر نەبێت. هەرچۆنێك بێت کتێبی ژیانم پەڕێکی لێ هەڵدرایەوە، وە خۆشحاڵم کە لەسەر یەك لاپەڕە

نەماومەوە و لە جوڵە دابووم کە گەیشتوٓتە ئێرە. چونکە زۆر کەسم بینیوە کە کەسایەتی دانپێدانراو و دیارو هەتا زانان و بە ئەهلی کتێب و خوێندنەوە ناسراون، بەڵام لە سەرەتاوە تا کۆتایی تەمەنیان لە یەك لاپەڕەی کتێبی ژیانیاندا ماونەوە، وە من نازانم چی دەکەن کە ئەو لاپەڕەیە هەرگیز ناگاتە کۆتایی؟

♣ هەروەکو چۆن بڕوام بە سنووری نێوان وڵاتان نی یە، بڕواشم بە سنووری نێوان مرۆڤەکان نی یە، نەتەوە لە دیدگای مندا کۆمەڵە خەڵکێکن کە تەنها دەردی هاوبەشیان هەیە.

♣ مرۆڤەکان زۆربەیان پێش مەرگیان دەمرن، وە ئەوانە کەمن کە هەردووک مەرگەکەیان بەیەکەوە بێت.

♣ ناوبانگ ویستی بۆ فەرامۆشکردنی 'خود'ە لەوانی تردا، یان بۆ دۆزینەوەی 'خودی-درۆیینـ'ە لەوانی تردا.

♣ خەڵك بەزۆری بێ ویژدانن، بێ ژیر-بیری و بیر-لەخۆ-کەرەوەن بەڵام تۆ بیان بەخشە. ئەگەر تۆ میهرەبان بی، ئەوا تاوانبارت دەکەن بە هەبوونی مەبەستی شاردراوە، بەڵام میهرەبان بە. ئەگەر سەرکەوتوو بی هاوڕێ ی ناڕاست و دوژمنی ڕاستەقینەت بۆ پەیدا دەبن، بەڵام سەرکەوتوو بە. ئەگەر چاك و دروست-كار بی فریوت دەدەن، بەڵام چاك و دروست-كار بە. ئەوەی کە بەدرێژایی چەندین ساڵ دروستت کردووە لەوانەیە بە یەك شەو وێرانی بکەن، بەڵام دروستکەر بە. ئەگەر شاد و ئارام بی ڕوژد دەبن بەرامبەرت، بەڵام شاد و ئارام بە. چاکی یەکانی ناو دەروونت لەبیر دەکەن بەڵام چاکەکار بە.

چاکترین شتەکانی خۆت بە جیهان ببەخشە هەتا ئەگەر تەواویش نەبێت، وە لە کۆتایی دا دەبینی: کە ئەوەی هەیە لەنێوان تۆ و خوادایە، نەك تۆو خەڵك.

♣ هونەر منی فریو دا
چ فریوێکی گەرم و لاوێنەرەوە بوو
من خۆم دەردەبڕی
و ئەوانی تر لێم تێدەگەیشتن
لەگەڵ ئەوان قسەم دەکرد
قسەی ئەوانم دەبیست
هەرچی دەمهەویست و نەبوو، دروستم دەکرد
کەسێك کە جیهانەکەی بیناسێت غەریب نی یە
کەسێك کە وەڵامی خۆی ببیستێت ئارامە
بەڵام مەگەر دەکرێت تا کەی دڵ فریو بدرێت؟

♣ من ئیسلامم دۆزیوەتەوە، ئیسلامی کەلتوری نا کە زانست دروست دەکات! ئیسلامی ئایدۆلۆژیایی کە تێکۆشەر پەروەردە دەکات. نە لە قوتابخانەی زانایان دا وە نە لە داب و نەریتی کۆمەڵگادا، بەڵکو لە 'رەبەزەی' ئەبو زەڕ دا.

-'رەبەزە' ئەو شوێنە بوو کە 'ئەبو زەڕی غەففاری بۆ دورخرایەوە لەلایەن خەلیفە عوسمانی کوری عەففانەوە.

♣ حکومەتی ئاینی ڕژێمێکە کە تێیدا لەجیاتی خەڵکی سیاسی، خەڵکی ئاینی (مەلایەکان) پلەو پۆستە سیاسی و حکومی یەکان داگیر دەکەن، وە بە دەربڕینێکی تر، حکومەتی ئاینی واتا حکومەتی پیاوانی ئاینی (مەلایەکان) بەسەر خەڵکدا.

حکومەتێکی لەو جۆرە بەشێوەیەکی سروشتی دەسەڵاتی ڕەها دەستدەخات، چونکە پیاوی ئاینی خۆی بە جێنشینی خوا و جێبەجێکاری فەرمانەکانی ئەو دەزانێت، وە لەو دۆخەدا خەڵك مافی بیروڕا دەربڕین و ڕەخنەگرتن و ناکۆك بوون لەگەڵ ئەویان نیە.

پیاوی ئاینی خۆی لەخۆیدا بە کەسێك دەزانێت کە ناکرێت دوژمنایەتی بکرێت، بەو پێ یەی کە پیاوی ئاینی یەو زانای ئاینی یە: نەك بەپێ ی دەنگدان و دیدگاو دانانی لەلایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە: کەواتە فەرمانڕەوایەکی نابەرپرس دەبێت وە ئەوەش بنچینەی دەسەڵاتی ڕەهاو دیکتاتۆری تاکڕەوی یە، وە چونکە خۆی بە سێبەر و نوێنەری خوا دەزانێت، دەست دەگرێت بەسەر گیان و ماڵ و ئابڕووی هەمواندا، وە لە ئەنجامدانی هیچ ستەم و دەستدرێژی یەك سڵ ناکاتەوە، بەڵکو ڕازیبوونی خوا لەو کارانەدا دەبینێتەوە..

لەوەش زیاتر، بۆ دژەکانی، بۆ پەیڕەوانی ئاینەکانی تر، ماڤی ژیانیش بە ڕەوا نازانێت، ئەوان بە نەفرینلێکراو لەلایەن خواوە، وە گومڕا، و پیس و دوژمنی ڕێگای ئاین و ڕاستی دادەنێت، وە ئەنجامدانی هەر ستەمێك لەبەرامبەر ئەواندا بە دادگەری خوایی دادەنێت.

♣ لەو گێتی یە مەزنەدا، شەهید تاکە بوونێکە کە لەدایکبوونی هەیە بەڵام مردنی نیە.

♣ بت پەرستی واتا ئاراستەکردنی (بە باش نیشاندانی) بارودۆخی کۆمەڵایەتی بەهۆی خوایەکان و بەهۆی ئاینەوە.

♣ مەعنەویەت چی یە؟ شتێکی مێشکی و خەیاڵ پەرستانە نیە، مەعنەویەتیش وەك شارستانیەت و زانست، پێویستی بە کارکردن و شارستانیەت و هێز و تەواوبوون و شایستەیی و ئاگایی هەیە.

ئەو کۆمەڵگایەی کە نەزانی و هەژاری تێدایە، هەروەکو ئەوەی ژیانی ماددی نیە، بەهەمان شێوە ژیانی مەعنەویشی نیە.

♣ دیموکراسی دەڵێت: هاوڕێ، تۆ بۆخۆت قسەی خۆت بکە، من نانەکەی تۆ دەخۆم
مارکسیزم دەڵێت: هاوڕێ، تۆ بۆخۆت نانەکەت بخۆ، من لەجیاتی تۆ قسە دەکەم
فاشیزم دەڵێت: هاوڕێ، من نانەکەی تۆ دەخۆم، لەجیاتی تۆش قسە دەکەم، وە تۆ تەنها چەپڵەم بۆ لێبدە
ئیسلامی ڕاست دەڵێت: تۆ بۆخۆت نانەکەت بخۆ، بۆخۆشت قسە بکە، وە من تەنها بۆ ئەوە هەم کە تۆ بەو مافانە بگەی
ئیسلامی درۆین دەڵێت: تۆ نانەکەت بهێنە بیدە بە ئێمە، وە ئێمەش بەشێکی هەڵدەدەینە پێش تۆ، بەڵام ئەو قسەیە بکە کە ئێمە دەیکەین!

♣ درەوشاوەترین ڕووخساری کارزانی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، بەبێ هیچ وتووێژێک "سوکرات"ە. ئەو کەسەی کە یەکەم جار تا لوتکەی بڵندی 'نازانم' سەرکەوت.

♣ "ئێمە دامانبەزاندووە لە شەوی قەدر دا
تۆ چوزانی شەوی قەدر چیە؟
شەوی قەدر لە هەزار مانگ باشترە
فریشتەکان و ئەو گیانە دادەبەزن بە ڕووخسەتی پەروەردگاریان لە هەر لایەکەوە
ئاشتی لەسەر ئەو شەوە تا دەرکەوتنی بەیان"
مێژوو گۆڕستانێکی دوورو درێژو تاریک و بێ دەنگ و غەمناکە، چەندین سەدەی بەدوایەکدا هەم ماندوو و هەم سارد و مەرگبارو ڕەش، وە ئەوە لەدوای ئەوە، هەموو دووبارەبوونەوەو هەموو لاسایی کردنەوە، وە ژیانەکان و بیرەکان و ئامانجەکان هەموویان دابوونەریتی و بە میراتگیراو، کەلتورو شارستانیەت و هونەر و بڕوا هەموو مردوو و خۆڵاوی!

لەناکاو لە تاریکای پەست و وەستاوی شەوێك لە شەوە بەردەوامەکان، شڵەژانێك، لەرزەیەك، جوڵەو ترپەیەك کە هەموو شتێك پێدەگات و هەموو خەوەکان دەشڵەژێنێت، وە نیوە-بنمیچەکان دەڕوخێنێت. شۆڕشێك لە قوڵایی گیانەکاندا و جۆش و خرۆشێك لە دڵی ویژدانە دەستەمۆ و ئارامەکاندا، دەرد و ڕەنج و ژیان و جوڵەو تۆقین و هەوڵ و ڕووبەڕووبوونەوەو کۆشش و ئەوین و سەرپێچی و وێرانکاری و ئامانج و مەبەست و پەیمان و بڕواو لەخۆبووردن! نیشانەی "لەدایك بونێکی مەزن"، شەوێك کە عیسا یەك بەرهەمدێنێت، دیلی یەك کە ڕزگاربوونی لێوە لەدایك دەبێت! لە هەموو شوێنێك لەناکاو، "ژیان و جوڵە"، سەرەتای ژیانێکی تر، دیارە کە فریشتەکانی خوا لەگەڵ ئەو "گیانە" لەو شەوەدا هاتوونە خوار بۆ زەوی، بۆ سەر زەوی، بۆ ئەو گۆڕستانە تاریك و گەنیوە، کە تێیدا مرۆڤەکان هەموویان بوونەتە پەیکەر.

ئەمە شەوی قەدرە.

شەوی چارەنووس، شەوی بەها، شەوی ڕێزگرتن و توانا بەخشین بە مرۆڤێکی نوێ، دەستپێکردنی بەیانی یەك کە مێژووی ڕووناکی درووست دەکات. ئەو شەوە لە هەزار مانگ باشترە، شەوی بەهۆش هاتنەوەیە کە بەرەبەیانی جەژنێکی قوربانی بەدواوەیە، وە بەردبارانکردنی پرشکۆی ئەو سێ بتکە شەیتانیانە ﴿زێڕ-سەرمایەدار، زۆر-دەسەڵاتدار، تەزویر-پیاوی ئاینی/مەلاو شێخ﴾! شەوێکی ڕەش کە لە تەنیشت دەروازەی 'منــێکە'، سەرزەوی ئەوین و لەخۆبوردن و قوربانی و سەرکەوتن!

وە مێژوو هەموو ئەو مانگە دووبارەبووەوانەن، کۆمەڵە مانگێك کە هەموویان دووبارەی یەکترن، ساڵانێك پوچ و نەزۆك، کۆمەڵە سەدەیەك کە هیچ شتێك دروست ناکەن، هیچ پەیامێکیان لەسەر لێو نیە، تەنها تێدەپەڕن و پیر دەکەن و هەر ئەوەندە: وە لەو ڕیزە درێژ و بێدەنگەدا، هەر ماوەی جارێك شەوێك دەردەکەوێت کە مێژوو دروست دەکات، کە مرۆڤی نوێ دروست دەکات، وە

شەوێك كە بارانی فریشتەكانی خوا دەبارێت، شەوێك كە ئەو گیانە دەچێتە ناو جەستەی كاتەوە، شەوی قەدر!

شەوێك كە لە هەزار مانگ باشترە، هەروەكو ئەوەی بیست و چەند ساڵی هاتنی محمد، لە بیست و چەند سەدەی مێژووی ئێمە باشتر بوو. ئەو ساڵانەی كە ئەو "گیانە" دادەبەزێتە سەر گەلێك یان نەوەیەك، لە هەزار ساڵی مێژووی ئەو باشترە.

وە ئێستا، بۆ سەر ئەندامەكانی ئەم ئیسلامە بە پەیكەر بووە، بۆ سەر گۆڕی ئەم نەوە بەخاكسپێردراوە و بۆسەر گۆڕستانی بێدەنگی ئێمە، نەك تەنها ئەو گیانە دانەبەزیوە، بەڵكو ڕەشی و تاریكی و تۆقین لە شەو هەیە، بەڵام شەوی قەدر؟

شەوێك كە باران دەبارێت، هەر دڵۆپێكی فریشتەیەكە كە دێتە خوار بۆسەر ئەو بیابانە وشك و ئاڵۆزە، بۆسەر بەختی دەنكێك، لقێكی وشك و درەختێكی سوتاو و گیانی تینووی كێڵگەیەك، وە ڕووانێكی بەخوڕ و باغ و گوڵی سوری نوێ دەدات. چەندە نەفامی یەكی ناشیرینە لەو شەوە قەدرەدا ببی، وە لەژێر ئەو بارانە بی، وە هەست بە دڵۆپێك لەسەر پێستی جەستە و ناوچاوان و لێو و چاوەكانی خۆت نەكەی: بە وشكی و تەپوتۆزاوی یەوە ژیان و مردن!

هەر مرۆڤێك مێژوو یەكە. تەمەن، مێژووی هەر مرۆڤێكە، وە لە مێژووی كورتی تاكە كەسی دا، كە مانگەكان هەموو دووبارەو ساردو بێ مانا تێدەپەڕن، جاری وایە شەوی قەدر دێت، وە تێیدا لە هەموو ئاسۆیەكانی بوونی مرۆڤەوە فریشتە دەبارن وە ئەو گیانە، گیانی پیرۆز، جوبرائیلی پەیامهێنەری خوایی دادەبەزێتە سەر تۆ، وە ئەو كاتە ناردنێك، نامەیەك، وە بۆ ڕاگەیاندن، لە گۆشەگیری ژیان و ......بیركردنەوەو پەرستن و تەنهایی و كات بەتاڵی و بڵندی كێوی تاكایەتی خۆت هاتنەخوار بۆلای خەڵك وە ئەو كاتە، ڕووبەڕووبونەوەو كردار و ڕەنج و هەوڵدان و كۆچكردن و تێكۆشان و لەخۆبوردن بۆ پەیامەكە!

خۆ دوای پێغەمبەری كۆتایی هیچ پێغەمبەرێك نایەت، بەڵام جار جار میراتگری پێغەمبەران هەیە! ئەو "گیانە" ئێستا دابەزیووە، ئێمە لە شەوی قەدردا دەژین.

ساڵەکان، ساڵی شەوی قەدرن، لەم شەوەدا کە جیهان ئێمە لەناوخۆیدا بزرکردووە، وە ئاسمان ئێمەی ڕەش کردووە، بارانی غەیبی دەستی بە بارین کردووە، گوێ بگرن، زمزمەی نەرم و خۆشئاوازەکەی دەبیستن، هەتا دەکرێت گوێمان لە ڕوانی گیایەکان بێت لەم شەوەی بیاباندا.

ئاشتی بۆ ئەو شەوە، شەوی قەدرێك کە لە هەزار مانگ، هەزار ساڵ و هەزار سەدە باشترە، سەلام، سەلام، سەلام،...تا ئەو ساتەی کە ڕۆژ دڵی ئەو بەستە تاریکە ڕووناك دەکاتەوە، گوڵی سور بپشکوێت لەسەر لێوی خەمباری ئەم ئاسۆیە وە ڕووباری خۆر بڕژێت بەسەر زەوی تاریکی ئێمەدا......وە بەسەر ویژدانی خەراپی مردووی بڕژێت. تا بەیانی سەلام لەم شەوە.

♣ ئەی کە تۆ ئەو منەکەی ترمی، ئەی تۆ کە ئەو تۆیەی تری تۆم، ئەی هاونیشتیمانی من، هاوشاری من، هاو کوڵانی من، هاو ماڵی من! ناسیاوی من، خزمی من، مەگەر تۆ خۆت بە ڕێبوار نازانی؟ مەگەر نازانی کە ڕێبواریی؟ ئەی هاوسەفەری من! ئەی هاوسەفەری من، هەستە لەخەو! ڕێگای سەفەر بگرەو بکەوە ڕێ، کە من لە کۆتایی ڕێگا، بێ ئارامانە چاوەڕێ ی گەیشتنی تۆم.

♣ لە هیچ شوێنێك مەوەستە وە هەمیشە لە دەرەوە وە لە دەروونتدا کۆچ بکە.

♣ وە خوا مریەمی هەڵبژارد وە ئەوی کردە ڕازگری خۆی وە چاوەکانی خوا کە هەرگیز هەڵە ناکات ئەوی باش کرد، لەناو هەموو ژن و کچانی ئورشەلیم دا...
بەڕاستی کە چاوەکانی خوا هەرگیز هەڵە ناکا.

♣ سێ هەرەمەکانی میسر- کە لەبەر چاوی من هەمان سێ-تا-پەرستی شومی دەسەڵاتدار و بەرهەملێگرتن و بەکەر-کردنن وە وەکو نیشانەیەك بۆ ڕابردووی

پڕ ستەمی مرۆڤ، ئەو کارەساتەیان دروستکردووە وە وەکو نوێنەری چارەنوسی فەرمانڕەوا بەسەر مرۆڤدا- هەر وەستاون لە شوێنی خۆیان!

♣ باوکێك دەستی کچەکەی ماچ دەکات، دەستی کچە بچوکەکەی. ئەو ڕەفتارە لەو ژینگەیەدا لێدانێکی شۆڕشگێڕانە بووە بۆ بنەماڵەکان و پەیوەندی یە نامرۆیی یەکان. پێغەمبەری ئیسلام دەستی فاتیمە ماچ دەکات. ئەو ڕەفتارە چاوە کەم بینەکانی ئەوانەی دەوری پێغەمبەر لە گەورەکان و سیاسەتمەداران و خەڵکی موسڵمان بەگشتی بەرامبەر مەزنی فاتیمە دەکاتەوە: وە ڕەفتارێکی لەو جۆرە لەلایەن پێغەمبەرەوە هەموو مرۆڤەکان و مرۆڤەکانی هەموو سەردەمێك فێردەکات کە لە خوو و خەیاڵ و وەهمی مێژوویی و دابونەریتی ڕزگاریان بێت، خەڵك فێر دەکەن کە لەسەر تەختی دەسەڵات و ستەم لەبەرامبەر ژنـدا بێنە خوار، وە ئاماژە بۆ ژن دەکات کە لە پەستی و خۆبەکەمزانینی کۆن و نوێ کە تەنها کردوویەتە یاری لە ژیاندا، بۆ لوتکەی شکۆ و شانازی مرۆیی بەرز ببێتەوە!

♣ ڕۆشنبیر مەرج نیە فەیلەسوف، زانا، هونەرمەند، کۆمەڵناس، سیاسەتمەدار، یان دەرس خوێندوو بێت، بەڵکو مرۆڤێکی بەئاگایە کە خاوەنی ئاراستەی کۆمەڵایەتی و هەستکردن و وابەستەیی دەستەیی و پەیمانی مرۆڤانەی هەیە لەبەرامبەر ئەو دەستەیەدا.

وا گومان دەکەن کە ڕۆشنبیر ئەو زانا، فەیلەسوف، هونەرمەند یان وتاربێژەیە کە بە دیدگای نوێ ی زانست و شارستانیەتی ئەوروی ڕۆژئاوایی سەیری ئیسلام بکات، لەکاتێکدا ڕۆشنبیر مرۆڤێکی بەئاگای بەرپرسە جا کرێکار یان جوتیار یان خوێندکار یان نوسەر یان هونەرمەند یان زانا نەخوێندەوار...بێت ، کە لە داگیرکاری و دیکتاتۆری و جیاوازی چینایەتی یان هەر ڕەنجێکی تری

مرۆڤ و خەڵك، ڕەنج دەكێشێت وە خۆی بە بەرپرسی ئەو ڕەنجانە دەزانێت وە بەدوای ئایدۆلۆژیا و هۆشیاری و ئاینێكدا دەگەڕێت.

♣ خوا فەرمان بە ئیبراهیم دەكات كە مەزنترین پەرستگای مرۆڤ - ماڵی من - لە تەنیش ماڵی ئەو ژنـە دروست بكـە، وە مـرۆڤـایەتی هەمیـشە دەبێـت بەدەوری ماڵی هاجـەردا بسوڕێنەوە.

♣ ئەی ئازادی، باڵندەی باڵ-شكاوی جوانی من! بریا قەفەسەكەتم دەشكاند و لە هەوای پاك و بێ هەور و بێ تەم دەمفڕاندی...

♣ وە بەڵام تۆ ئەی حوسێن، چ بە تۆ بڵێم؟
شەوێكی تاریك و ترسناك و گێژاوی ئاوا بێ شومار وە تۆ چرای ڕێگا، ئەی كەشتی ئازادی، ئەی ئەو خوێنەی كە لەو خاڵەی بیابانەوە، بە نەمری دەنگ دێت وە دەكوڵی، وە لە شوێنی كاتدا بەردەوامی، وە بەسەر هەموو وەچەكاندا تێدەپەڕی، وە هەر زەوی یەكی بەپیت تێـر-ئـاو دەكـەی بـە خـوێن، وە هـەر تـۆوێكی شایـستەی ژێـر خـاك دەپـشكوێنی و گەشـە پـێ دەدەی، وە بـە هـەر نەمامێكی تینوو گەڵاو بەر و ژیان و تەڕی دەبەخشی.
ئەی مامۆستای مەزنی شەهیدبوون!
تیـشكێك لـەو ڕونـاكی یـە بخـە سـەر ئـەو شـەوگارە ڕەش و نائومێـدەی ئێمـە! دڵۆپێك لەو خوێنە لە جەستەی نیوە-وشك و نیوە-مردووی ئێمە بەگەڕ بخە! وە بڵێسەیەك لە ئاگری ئەو دەشتە پڕ ئاگرە بەو زستانە سارد و غەمگینـەی ئێمـە ببەخشە! ئەی ئەوەی كە "مەرگی سور"ـت هەڵبژارد تاوەكو ئەویندارانت لـە "مەرگی ڕەش" ڕزگار بكەی تاوەكو بە هەر دڵۆپێكی خوێنت ژیان بە نەتەوەیەك ببەخشی وە مێژوویـەك بخەیـە جوڵـە وە پەیكـەری مـردوو و لەكـەڵك كـەوتووی چەرخێك گەرم بكەیەوە وە جۆش و خرۆش و ژیـان و ئـەوین و ئومێد ببەخشی!

**بڕوای ئێمە، نەتەوەی ئێمە، مێژووی داهاتووی ئێمە، پەیکەری کاتی ئێمە، "پێویستی بە تۆ و خوێنی تۆیە"**

**♣ ئادەمیزاد هیچ کات بێ ئاین نەبووە. پێغەمبەران لەگەڵ ڕەتکەرەوانی خـوا دا ململانێ یان نەبووە، جەنگێك کە بەسەر پێغەمبەراندا سەپێندراوە، لەگەڵ مەلا (ملا) و زیادەڕۆیەکانی سەردەم بووە، واتا لەگەڵ خاوەنەکانی زێڕ (سەرمایەدار) و زۆر (دەسەڵات) و تەزویر (مەلاو پیاوی ئاینی) بووە، کە ئایەتەکانی قورئان ڕاشکاوانە دەڵێن: "هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە مەگەر مەلا (پیاوی ئاینی خاوەن دەسەڵات) و زێدەڕۆیەکان پێچەوانەی جوڵاونەوە".**
**پێغەمبەران بۆ ئازادی هاتوون، بەڵام مەلا (پیاوی ئاینی خاوەن دەسەڵات) و زێدەڕۆیەکان دوای ماوەیەك دووبارە بە هەمان ئاین، خەڵکیان کردەوە دیل و کۆیلە. کەواتە ئاین لەدژی ئاین بووە.**

**♣ ئەوان تەنها لە "تێگەیشتن" ی تۆ دەترسن. لە "جەستە"ی تۆ هەرچەندە بەهێز بێت ناترسن، خۆ لە مانگا گەورەتر نابیت، دەتدۆشن، خۆ لە گوێدرێژ بەهێزتر نابیت، بارت دەکەن، خۆ لە ئەسپ تیژڕەوتر نابیت، سوارت دەبن: ئەوان تەنیا لە "تێگەیشتن"ی تۆ دەترسن!**

**♣ قەڵەم زمانی خوایە، قەڵەم سپاردەی مرۆڤە، قەڵەم متمانەی ئەوینە، هەر کەسێك تەوتەمێکی هەیە قەڵەم تەوتەمی منە. وە قەڵەم تەوتەمی ئێمەیە.**

**♣ چەندە سەخت و غەمهێنەرە چارەنوسی ئەو کەسەی کە سروشت ناتوانێت کوڵاوی لەسەر بنێت. چەندە تاڵە میوەی بینین (ئاگایی).**

**♣ بۆ خراپکردنی ڕاستی: بەباشی هێرشی مەکە سەر: بەخراپی بەرگری لێ بکە.**

♣ بەڵام من شکست ناهێنم. ئەگەر تەنیاترینی تەنیایەکان بم، دووبارە خوا هەیە، ئەو جێگرەوەی هەموو نەبوونەکانە. نەفرین و ئافەرینەکان بێ بەرهەمن. ئەگەر تەواوی دروستکراوەکان ببنە گورگی هار، وە لە ئاسمانەوە تاسان و کینە بەسەرمدا ببارێت، تـــۆ میهرەبانی نەمری زیانپێنەکەوتووی منی. ئەی پەنای ئەبەدی! تـــۆ دەتوانی ببیە جێگرەوەی هەموو بێ-پەنایی یەکان.

♣ مرۆڤـی ئەو ڕۆژگارە هەموو لەهەوڵی بە کیمیایی کردنی خاك دان و بەدوای دەرمانێکدا دەگەڕێن کە خـــاك بکاتە زێـــڕ، بەڵام مرۆڤـــی دوێنێ لە ئارەزووی دەستکەوتنی "هەوێنێك" دابوو کە گیانی خـــاکی و دڵـــی مســـینی ئەو بکاتە "کیمیا"، بیگۆڕێت بۆ زێڕ.....

♣ دەبێت هەمیشە فیداکاری بشاردرێتەوە، نەك تەنیا لە ئەوانی تر، بەڵکو لە خۆشت، تاوەکو بۆخۆشت بەبیرت نەیەتەوە، بیری لێ نەکەیەوە.

♣ کاتێك لەگەڵ کەسێکدا جەنگ دەکەی، هێرش دەکات، چەك بەکاردێنێت، بەردان داوێت، هێرشت دەکاتە سەرو بە زەویتدا دەدات.
بەڵام کاتێك کە جەرگی هێرشکردنی نیەو هیچ چەکێکی نیە، دەست دەکات بە قسەی ناشیرنکردن لەبارەتەوە وە هەرچی بێتە سەر زمانی دەیڵێت- وە قسەی ناشـیرن واتـا، هەرچـی بێتـە سـەر زمـان- وە بـەو شـێوەیە شکـستی خـۆی و سەرکەوتنی ئەو کەسەی کە تۆمەتباری دەکات ڕوو دەدات و ڕایدەگەیەنێت.

♣ هـەژاری لـە هـەموو جێگایـەك سـەرهەڵدەدات...هـەژاری، برسیەتی نیـە، بێ بەرگی نیە... هەژاری، هەتا جارجار لەژێر قالبە زێڕەکان خۆی دەشارێتەوە.. هەژاری "نەبوونی" شتێکە: بەڵام ئەو شتە پـارە نیە: زێـڕ و خۆراکیش نیە... هەژاری توشی بیرەکان دەبێت... هەژاری دڕندەیەکە کە هەتا بەرمیلە نەوتەکانی

عەرەبستانیش بەتاڵ دەکات... هەژاری، هەمان ئەو تەپ و تۆزەیە کە لەسەر کتێبە نەفرۆشراوەکانی کتێبخانەیەك دەنیشێت... هەژاری، تیخەکانی سەیارەی زبڵە کە ڕۆژنامە نەخوێندراوە و گەڕاوەکان ورد دەکات... هەژاری، تاتێکی سێ هەزار ساڵەیە کە یادگاریان لەسەر نوسیوە... هەژاری، تونێکلی ئەو موزەیە کە لەپەنجەرەی سەیارەیەکەوە هەڵدەدرێتە سەر جادە... هەژاری لە هەموو شوێنێك دەردەکەوێت...

♣ پەرستن هەر کارێکە وە هەتا هەر هەستێکە کە مرۆڤ نەك بۆ سودی تاکەکەسی خۆی دەیکات، بەڵکو بۆ سودی خەڵك ئەنجامی دەدات، وە هەر لەبەر ئەوەیە "لەپێناوی خەڵك" دا وەکو "لەپێناوی خوادایە" لە ئیسلامدا.

♣ لەپشت ڕووخساری هەر شارستانیەتێکدا کۆچکردنێك شاردراوەتەوە، وە کاتێك گوێ لە قسەی هەر کۆمەڵگایەکی مەزن دەگرین، بە زمانی مێژوو یان ئەفسانەکانی باسی کۆچکردنێکمان بۆ دەکات.

♣ ژێرخانی کۆمەڵگای داگیرکراو، داگیرکەر دیاری دەکات نەك ئابووری.

♣ ستەمکار و ستەملێکراو، هەموو شەهیدان و هەموو جەلادانی مێژوو، لەناکاو یەکسەر لەم ساڵەدا، وە لەو ڕۆژ و شەوەدا، هەموویان دووبارە، لە ڕۆژێکی پەسڵانی نوێ دا، زیندووبونەوە، وە لە گۆڕستانی بێدەنگی کاتدا، پەیکەری شیبووەوەیان دەڵێ ی گیانی بەبەرداکراوەتەوە، وە لە دوو ڕیزدا بەرامبەر یەك لەکەنار فورات ڕاوەستاون، دوو ڕیز کە ئەمڕۆ لەکەناری یەکترن، وە هەر ڕیزێك میراتگری ئەو جوڵانەوە بەردەوامەیە کە لە درێژایی مێژوودا، لە سەرەتاوە تا ئەوان، وە لەوانەوە تا ئێمە، وە تا ئاینده بەردەوامە، مەیدانێك کە مێشکی مرۆڤ لەڕووی مێژووی و جوگرافی لێ ی تێدەگات کاتێك بیر لە حوسێن و داستانی ئە

دەکاتەوە، بين النهرين (عێراق)ــە، بۆئەوەی ئەو نوسینە ڕوون ببێتەوە، دەبێت ڕوونی بکەمەوە کە مەبەست لە بين النهرين چیە، چونکە هەم بە مانایەکی واقعی بەکارهاتووە، وە هەم بە مانایەکی ڕەمزی و نیشانەیی: کەربەلا لە بين النهرين-ە، نێوان دوو ڕووباری فورات و دیجلە.

کاتێك دەڵێین نێوان دوو ڕووبارەکە، لەناکاو حەوت هەزار ساڵ مێژوو دێتە مێشکی مرۆڤــەوە، کاتێك جەنگی نێوان دوو سوپایەکە لە کەربەلا دەبینین، لەناکاو بەبیرمان دێتەوە کە لەو حەوت هەزار ساڵەی مێژوودا لە نێوان دوو ڕووبارەکە گۆڕەپانی گەورەی جەنگی نێوان ڕاستی و پوچی: جەللاد بوون و مرۆڤ بوون: لەسەرەتاوە لە هەمان نێوان ئەو دوو ڕووبارە ڕوویداوە، وە لەناکاو بیرکردنەوە لە نێوان دوو ڕووباری حوسێن، مێشك دەبات بەرەو بیرکردنەوە لە نێوان دوو ڕووباری مێژوو، لەناکاو لەو بنەمایە، کە بەدرێژایی مێژوو، لە ئادەمەوە تا حوسێن، وە لە حوسێنەوە تا کۆتایی کاتی ستەم، دوو ڕووباری بەردەوام بەرامبەر یەکتر، لە یەك سەرچاوەوە کە مرۆڤــە، سەرچاوەیان گرتووە، وە لەگــەڵ یــەکتر جــەنگیان کــردووە، وە بەدرێــژایی مێــژوو، لــە جــەنگ لەگــەڵ یەکتردا، پێکەوە لە پێخەڤ کاتدا، بەردەوام بوو ـون، وە بە نەوەکان و چەرخەکان و شارستانیەتەکاندا تێدەپەڕین.

وە ئــەو دوو ڕووبــارە، ئــەو دوو جوڵانەوەیــە، ڕەشــی و ســپیەتی، تــاوان و شەهیدبوون، جارجار دوور وە جارجار نزیکتر لەیەوە دەهاتن، تاوەکو گەیشتنە بەغدا،

هەم لەڕووی جوگرافیایی یەوە بەغدا شوێنێکە کە دوو ڕووباری فورات و دیجلە لەیەکتر نیزیك دەبنەوە،

وە هەم لەڕووی مێژوویی یەوە بەغدا مەڵبەندی شارستانیەتی ئیسلامی یە: کە تێیدا درۆ و فریودان و تاوان و جەللادبوون لە پۆشاکی پێغەمبەرایەتی دا، وە جێنشینی پێغەمبەرایەتی دا، لەسەر چاوچنۆکی ستەم و کوشتن دادەنیشێت، وە گەورەترین درۆی مێژوو لە بەغــدادا ڕوو دەدات، وە ئەویش کاتێکە کە ئەم

دوو جوڵانـەوە ئاشـكرا بەردەوامــە جیـاوازە لەیــەكتر لـە درێــژایی مێــژوودا، بەجۆرێك تێكەڵی یـەكتر دەبن، كـە ناسینـەوە بۆ كۆمـەڵانی خەڵك كە لەدێژایی مێژوودا قوربانی ستەم بوو ـون، دژوارە.

♣ هـەموو ڕۆژێـك كـە لـە ئـاوێنەدا خـۆم دەبیـنم، ڕاسـت دەبیـنم كـە بەلایـەنی كەمەوە، ساڵێك لەمن تێپەڕیوە. دوێنێ شـەوێ و پێرێ شـەوێ، هەمیشە بـۆ مـن پار ساڵ و پێرار ـن. بۆئەوەی ڕۆژەكانم لە تەمەنم بدزم دەنووم وە شـەوەكان! شـەوەكان لەگـەڵ تـەنیایی و ڕەشـی و بێـدەنگی دا، لـەژێر بـارانی ڕەنجـەكان كـە بەردەوام دەبارن، سەرم دەخەمە سەر ئەژنۆیـەكانم و، بە خامۆشـی دادەنیشم وە كۆمـەڵێك بـیرەوەری مـردوو و ئـارەزووی برینـدار لـە بەرامبەرمـدا، تـا خـۆر كـە دەردەكـەوێت و هـەوا ڕوونـاك دەبێتـەوەو دەنگـی پـێ ی ڕۆژ، كەروێـشكەكان و سەیارەكان و دەستپێكردنی جوڵەو كار! لەترسان دەڕۆم و دەڕۆمە ناو خەوەوە! بێگومـان بێكـار نـەبووم: گـەورەترین كار كە كردوومە ئەوەیـە كە ئێستاش بە زینـدوویی ماومـەوە وە ئـەوەش دژوارتـرین كـار بـووە كـە مـن ئـەنجامم داوە وە ئەگەر ویژدانیان هەبێت، زۆر كار هـەبوون كە من نەمكردوون، وە مەگەر ئەوانە بۆخۆیان كار نین؟

♣ هەندێك قسە هەیە بۆ وتن، كە ئەگەر گوێ نەبوو نایانڵێم.
هەندێك قسە هەن بۆ نەوتن، ئەو قسانەی كە هەرگیز سەر بۆ وتن نەوی ناكەن.
وە بـەهایی ئەودیویانـەی هەركەسێك بـە ئەنـدازەی ئـەو قسانەیە كـە بـۆ نـەوتن هەنی.

♣ دەردی عــەلی دوو جـۆرە: دەردێـك، دەردێكـە كـە لـە برینـی شمـشێری ئـیبن مەلجەم لە ناوەڕاستی سەریدا هەستی پێدەكات: وە دەردێكی تـر، دەردێكە كـە ئەو بە تـەنیایی لـە نیوە شـەوە بێدەنگەكانـدا بـۆ نـاو باغە خورمایـەكانی دە بەرەری مەدینـە ڕادەكێشێت...وە خستویەتە ناڵەوە، ئێمە تـەنها بـۆ ئـە

دەگریەین کە بەهۆی شمشێری ئیبن مەلجەمەوە هەستی پێدەکات. بەڵام ئەوە دەردی عـەلی نیە: دەردێك کە گیانێکی ئەوا مەزنی هێناوەتە ناڵە، "تەنیایـــی" یە، کە ئێمە ئەمە ناناسین! پێویستە ئەم دەردە بناسین، نەك ئەو دەردەی پێشوو کە عەلی بە شمشێرەکە هەستی پێدەکات، وە ...ئێمە هەست بە دەردی عەلی ناکەین.

♣ پوچ (=نارەوا) دەتوانێت داگیربکات، بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، بکوژێت: بەڵام ناتوانێت سەرکەوێت!

♣ وە ئێوە ئەو دووەتان، ئەی خوشکیّ! ئەی برا!

ئەی ئێوە کە واتاتان بە مرۆڤ-بوون بەخشی وە گیانتان بە ئازادی بەخشی! وە بە بڕواو ئومێد بڕواو ئومێد! وە بە مەرگی شکۆمەندی خۆتان، زیندوێتیتان بە ژیان بەخشی.

بەڵێ ئەی ئەو دوو کەسە!

لەو ڕۆژە دەردناکەوە کە خەیاڵیش لە وێناکردنی هەراسی هەیە وە دڵ لە دەردی ئەو پارچەپارچە دەبێت، چاوەکانی ئەو نەتەوەیە لە فرمێسك وشك نەبۆتەوە.

خەڵکی ئێمە چەندین سەدەیە لە غەمی ئێوەدا وە لە ئەوین بۆ ئێوەدا دەگریەت. مەگەر ئەوین تەنها بە فرمێسك قسەناکات.

ئەی زەینەب! ئەی زەینەب! ئەی زمانی عەلی لە مەبەست دا! لەگەڵ نەتەوەی خۆتدا قسە بکە.

ئەی ژن! ئەی کە مرۆڤبوون لەلای تۆ فێری جوانەمەردی بوو! ژنانی نەتەوەی ئێمـە، ئەوانـەی کـە نـاوی تـۆ ئـاگری ئـەوین و دەرد لـە گیانیـان بـەردەدات، پێویستیان بە تۆیە. زیاتر لە هەموو کاتێك.

نەزانی لەلایەکەوە دوچاری دیلی و سەرشۆڕی کردوون وە ڕۆژئاوا لەلایەکی ترەوە دەیانخاتە ناو دیلی شاردراوەو سەرشۆڕی نویّ وە. وە لە خۆیان و لە تۆ بێگانەیان دەکات. ئەوان لە دژی بەکەرکردنی کۆن و نویّ، لەدژی کۆیلایەتی

دابونەریتە کەنیوەکان و بانگهێشتنە کراوەکان، لەدژی بە-یاری-کەرە کانی ڕەگەزپەرەستی کۆن و بە-هونەر-کردنی نویٚ، بە هێزی ئەو هاوارانەی کە بەسەر شارێکدا دەتکردن، شاری دڵرەقی و دڕندەیی، وە پایەکانی کۆشکێکت، کۆشکی تاوان و دەسەڵاتت دەلەرزاند، ڕاپەڕێنە!

تا لەناو خۆیاندا ڕاپەڕن وە تاروپۆی ئەو پەردە جاڵجاڵوکەییانەی فریو بدڕن، وە تاوەکو لەبەرامبەر ئەو تۆفانە بەباکەرەی کە دەستی بە هاتن کردووە، پیٚ چەسپاوی فێر بن. وە ئەو ئامێرە ترسناکەی کە لەو ئامرازێکی-یاری نویٚ دروست دەکات، دیسان بۆ بەکەرکردنی نویٚ، بۆ بیٚ ئاگاکردنی نویٚ، بۆ پڕکردنەوەی ڕۆژە بیٚ ئیشەکان، وە بۆ هەڵلوشینی برسیانەی ئەوەی کە سەرمایەداری دەیهێنێتە بازاڕەوە، وە بۆ چێژ بەخشین بە هەوەسە پیسەکانی بورژوازی، بۆ جۆش و خرۆش بەخشین بە کۆشکەکان و تەنهایی یە بیٚ سۆزو بیٚ گیانەکانی خانەدانی نویٚ وە بۆ سەرگەرمی ژیانی پوچ و بیٚ ئامانج و ساردی کۆمەڵگای خۆش گوزەران، لەناو بەرێت!

وە خۆی لە چوارچێوەکانی ڕەسەنایەتی کۆن و بازاڕە بیٚ ڕێزەکانی نویٚ بە پێشەوایەتی تۆ ئەی زەینەب! ڕزگار بکات!

ئەی زەینەب! ئەی زمانی عەلی لە مەبەست دا! ئەی پەیامی حوسێن لەسەر شان!

ئەی ئەوەی کە لە کەربەلاوە دیٚ ی وە پەیامی شەهیدان لەناو هاتوهۆریای هەمیشەیی شمشێرو خەنجەر هەڵگران و جەللادان ئێستاش هەر بەگویٚ ی مێژوو دەگەیەنی.

ئەی زەینەب! قسە لەگەڵ ئێمە بکە.

مەڵیٚ چی بەسەر ئێوە هات؟ مەڵیٚ لەو بیابانە سورە چیت دیت؟ مەڵیٚ کە تاوان لەوێدا گەیشتە کویٚ؟ مەڵیٚ کە خــوا لەو ڕۆژەدا ئازیزترین و پڕشکۆترین بەهایەکان و مەزنی یەکان کە دروستی کردوون پێکەوە لە کەنار فوڕات و لەسەر

ڕێگایەکانی بیابان چۆن پێشان دا وە خستیە بەردەمی فریشتەکان تاوەکو بزانن کە بۆچی پێویست بوو سوجدە بۆ ئادەم بەرن.

بەڵێ زەینەب! مەڵێ لەوێ چی بەسەر ئێوە هات؟ مەڵێ کە دوژمنان چیان کرد؟ وە دۆستان چیان کرد؟

بەڵێ ئەی پەیامبەری شۆڕشی حوسێن! ئێمە دەزانین. ئێمە هەموومان بیستووە. تۆ پەیامی کەربەلا، پەیامی شەهیدانت بە دروستی گەیاندووە.

تۆ بۆخۆت شەهیدێکی کە لە خوێنی خۆت وشەت دروستکرد، وەکو برایەکەت کە بە دڵۆپە دڵۆپەی خوێنەکەی خۆی دەدوێت.

بەڵام بڵێ ئەی خوشکێ! بڵێ ئێمە چی بکەین؟

ساتێك تەماشا بکە کە ئێمە چ دەکێشین؟ کەمێك گوێ لە ئێمە بگرە تاوەکو کارەساتەکانی خۆمانت بۆ باس بکەین.

وە تۆ ئەی خوشکی میهرەبانم!

ئەوە تۆی کە دەبێت بۆ ئێمە بگریەی. ئەی پەیامهەڵگری دەستپاکی برا! کە لە کەربەلاوە دێ ی وە بە درێژایی مێژوو بەسەر هەموو وەچەکانی مێژوودا تێدەپەڕی وە پەیامی شەهیدان دەگەیەنی.

ئەی ئەوەی کە لە باغە سورەکانی شەهیدبوونـ-ەوە دێ ی وە بۆنی گوڵە تازە پشکوتووەکانی ئەو نیشتیمانەت هەر دەدەی! ئەی کچی عەلی! ئەی خوشکێ! ئەی ئەوەی کە سەرقافڵەی کاروانی دیلەکانی! ئێمەش لەو کاروانەتدا لەگەڵ خۆت ببە.

## ♣ نزا

ئیلاهی! بڕوایەکەم لەدەستی گرێ یەکانم بپارێزە.

ئیلاهی! توانای بەرگەگرتنی بڕوای پێچەوانەکەم بە من ببەخشە.

ئیلاهی! گەشەی ئەقڵی و زانستی من لە باشی یەکانی دەمارگیری و هەست و
درەوشانەوە
بێبەش مەکە.

ئیلاهی! هەمیشە من بەئاگاو هۆشیار بکە، تاوەکو پێش ناسینی دروست و
تەواوی کەسێك یان بیرێك –بە ئەرێ یان نەرێ– بڕیار نەدەم.

ئیلاهی! نەفامی تێکەڵ لەگەڵ خۆپەرستی و ئیرەیی، من خۆبەخشانە نەکاتە
ئامرازی کوشندەی دوژمن بۆ هێرش کردنە سەر دۆست.

ئیلاهی! ناوبانگ، ئەو 'من'ەی کە من بۆخۆم دەمهەوێت ببم، نەکاتە قوربانی ئەو
'من'ەی ئەوان دەیانهەوێت ببم.

ئیلاهی! لە گیانی منـــدا، ناکۆکی لە مرۆڤـایەتی دا، لەگەڵ ناکۆکی لە بیر و ناکۆکی لـە پەیوەندی دا، لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ مەکە، بەجۆرێك کە نەتوانم ئەو سێ دیاردانە لەیەکترجیابکەمەوەو لەیەکتر بناسمەوە.

ئیلاهی! من لەبەر ئیرەیی، کینە و مەبەست، مەکە بە کارکەری نەکاملی ستەم.

ئیلاهی! خۆپەرستی بەشێوەیەك لەناو مندا بکوژە، یان تاڕادەیەك دەرکێشە، کە هەست بە خۆپەرستی ئەوانی تر نەکەم وە بەهۆیەوە نەکەومە ڕەنجەوە.

ئیلاهی! گوێڕایەڵی ڕەها لە بڕوادا بە من ببەخشە، تاوەکو لە جیهاندا سەرپێچی ڕەها بم.

ئیلاهـی! پارێزکـــاری پێـشبڕکێ فێـری مـن بکـە تـاوەکـو لـەژێـر بـاری بـەرپرسیـاریەتی دا نەخلیسکێم، وە لە پارێزکاری خۆلادان بمپارێزە تاوکو لە تەنیایی گۆشەگیریدا نەڕزم.

ئیلاهـی! مـن مەهێنـەخـوار تـا ئاسـتی ئـارامی و خۆشـبەختی، نیگـەرانی یـە مەزنەکان، غەمە خۆشەویستەکان و سەرسامی یە مەزنەکان بە گیانم ببەخشە. چێژەکان بە بەندە پەستەکانت ببەخشە وە دەردە مەزنەکان بەسەر گیانی مندا ببارێنە.

ئیلاهی! ئەندێشەو هەستی من تا ئاستێك مەهێنەخـــوار کە زرنگی یە کەم و پەستی یە نەگبەتبارو پیسەکانی نیمچە مرۆڤە بچوکەکـان هەست پێ نەکەم: چـەندە پێـم خۆشترە کە مەزنێکی گوڵ تێکراو بم، نەك وەکو ئەوان بچوکێکی گوڵ کەر.

ئیلاهی! من لە چوار زیندانی گەورەی ئادەمیزاد: سروشت، مێژوو، کۆمەڵگا و خۆم ئازاد بکە، تا بەو شێوەیەی کە تۆ، ئەی دروستکەری من، منت دروست کردووە من خۆم دروستکەری خۆم بم، نەك -وەکو ئاژەڵ- خۆم لەگەڵ ژینگە بگونجێنم، بەڵکو ژینگە وەك خۆم لێ بکەم.

ئیلاهی! لەبەرامبەر هەر شتێك کە مرۆڤـ-بوون بەرەو لەناوچون دەبات، من بە
"نەبوون" و "نەویستن" بپارێزە.

ئیلاهی! توانای هەوڵدان لە شکستدا، ئارامی لە نائومێدی دا، ڕۆیشتنی بێ هاوڕێ، تێکۆشانی بێ چەك، کاری بێ پاداشت، فیداکاری لە بێدەنگیدا، دینی بێ دنیا، باشی بێ خۆدەرخستن، مەزنی بێ ناوبانگ، خزمەتی بێ نان، بڕوای بێ ڕیاکاری، سەرکەشی بێ ساویلکەیی، ڕێزی بێ لەخۆبایی بوون، ئەوینی بێ هەوەس، تەنیایی لەناو کۆمەڵی خەڵك، وە خۆشویستن بەبێ ئەوەی خۆشەویست بزانێت بە من ببەخشە.
ئیلاهی! من لە هەژاری تەرجومەو زەبوونی لاساییکردنەوە ڕزگار بکە تاوەکو قالبە بەمیراتگیراوەکان بشکێنم، تاوەکو لەبەرامبەر قالب دروستکردنی ڕۆژئاوادا
بوەستم، وە تاوەکو -وەکو ئەم و ئەو- ئەوانی تر قسە نەکەن و من تەنها لێوەکانم
بجوڵێنم!

ئیلاهی! تۆ کە هەموو فریشتەکانت لەبەردەم ئادەم خستە کڕنوشەوە، ئێستا نابینی کە ڕۆڵەی ئادەم ـیان لەبەردەم دەسەڵاتدا خستۆتە کڕنوشەوە؟ ئەوان

**لە کـوّتی پـەرستنی بتەکـانی ئـەم سەردەمە کە بەدەستی خوّمـان دروستمـان کردوون بوّ بەندایەتی ئازادی بەخشی پەرستنی خوّت ئازاد بکە!**

**ئیلاهی! مـن لەو کارەساتە پیسەی "بەرژەوەندی-پەرستی" کە چونکە هەموو کەسێکی گـرتوّتەوە وە ناشیرنی-یەکەی لەبیـرکراوە وە بـوّتە نەخوّشی یەك کە بـەهوّی فراوانـی گـشتگیـربوونەکەی، هـەر کەسـێك لێـی سـاغ دەرچـووبێت نـەخوّش دەردەکەوێـت، بپـارێزە، تا "لەبەر پاراستنی بەرژەوەنـدی، ڕاستی بەشێوەی یاسایی (شەرعی) نەکوژمەوە"!**

**ئیلاهـی! کـوّمەڵگایەکەم لـە نەخوّشـی تەسـەوف و بـە-مـەعنەوی-بـوون چاکبکەوە، تـا بگەڕێـتەوە بوّ سەر ژیان و واقیعییەت، وە من لە ناچاری ژیان و نەخوّشی بە-واقیعییەت-بوون ڕزگار بکە، تاوەکـو بگەمە ئازادی عیرفـانی و تـەواوی مەعنەوی.**

**ئیلاهی! بە زانایەکانی ئێمە بەرپرسیاریەتی، وە بە گشت خـەڵکی ئێمە زانست، وە بـە دینداراني ئێمە دین، وە بە بڕواداراني ئێمە ڕوّشنایی، وە بە ڕوّشنبیرانی ئێمـە بـڕوا، وە بـە دەمارگیـرانی ئێمـە تێگـەیشتن، وە بـە تێگەیشتوەکانـی ئێمـە دەمارگیـری، وە بە ژنانـی ئێمـە هەسـت و تێگەیشتـن، وە بـە پیـاوانی ئێمە ئابـڕوو، وە بە پیـرەکانی ئێمە ئاگایی، وە بە گەنجـانی ئێمە ڕەسـەنی، وە بە ماموّستایەکـانی ئێمە بـڕوا، وە بە خوێندکـارانی زانکـوّی ئێمەش بڕوا، وە بـە نوسـتووەکانی ئێمـە بەخەبـەری، وە بـە بەخەبـەرانی ئێمـە ئـیرادە، وە بـە دانیشتوانی ئێمـە هەستان، وە بە بێدەنگـەکانی ئێمـە هاوار، وە بە نوسـەرانی ئێمـە پـەیمان، وە هونەرمەنـدانی ئێمـە دەرد، وە بـە شاعیرانـی ئێمـە هەسـت و تێگەیشتـن، وە بە لێکوّڵـەرەوانی ئێمە ئامانـج، وە بە ڕاگەیانـدن-کـارانی ئێمـە ڕاسـتی، وە بـە حەسـودانی ئێمە شیـفا، وە بـە خوّبینـانی ئێمـە ویژدان، وە بـە**

**زمان–پیسانی ئێمە ئەدەب، وە بە دەستەکانی ئێمە یەکیەتی، وە بە خەڵکی ئێمە خۆئاگایی، وە بە هەموو گەلی ئێمە هەوڵی بڕیاردان وە ئامادەباشی فیداکاری وە شایستەیی**

**ڕزگاری و سەربەرزی ببەخشە.**

**ئیلاهی! ژیانێك بە من ببەخشە، کە لە ساتی مەرگدا لەبەر بێ بەرهەمی ئەو ساتانەی بۆ ژیان بەسەربردن بەسەر چووە حەسرەت نەخۆم. وە مردنێکم پێ ببەخشە کە لەبەر بێ هودەیەکەی تازیەبار نەبم. لەبەرئەوەی هەرکەسێك بە هەمان شێوە دەمرێت کە ژیان بەسەردەبات. خوایە ڕوخسەتم پێ بدە تا ئەو، واتا مردن، من بۆخۆم هەڵبژێرم بەڵام بەو شێوەیەی کە تۆ پێتخۆشە. خوایە ئەتۆ فێری چۆن ژیانم بکە، بۆخۆم فێری چۆن مردن دەبم. خوایە ئێمە لەو کارەساتە پیسەی بەرژەوەندی پەرستی، کە ئێستا بۆمان بۆتە دین، وە بۆتە نەخۆشیەك کە لەبەر گشتگربوونی ئەوەی بە ساغی مابێتەوە نەخۆش دەردەکەوێت، بپارێزە.**

**تا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی راستی وەك دژە یاسا نیشان نەدەم. تا ئازادیی یەکەم نەبێتەتە ئەسیری پەسندکردنی گشتی، تا دینەکەم لەپشت رووخساری ئاینیم دا نەشاردرێتەوە، وە دواکەوتنم من نەکاتە لاسایی کەرەوەی لاساکەرەوانم. تا ئەوەی بەراستی دەزانم، لەبەرئەوەی بە خراپی دەزانن، نەشارمەوە.**

**ئیلاهی! بەخششێکم پێبدە تا بڕوا ناو و نانم بۆ نەهێنێت، هێزم پێ ببەخشە تا نانەکەم وە هەتا ناویشم بخەمە مەترسی بڕوامەوە.**

**ئیلاهی! کافر کێ یە؟ موسڵمان کێ یە؟ شیعە کێ یە؟ سوننی کێ یە؟**

سنورە دروستەکانی هەر یەکەیان، کوێ یە؟ مـن ئارەزووم ئەوەیە کە ڕۆژێك ئاستی هەستکردن و ناسینی ئاینی، لەو وڵاتەدا، بگاتە جێگایەك کە وتەبێژە ڕسمـی یـەکانی ئـاینی ئێمـە، بـەو شـێوەیە کـە سـلێمان کتـانی (پزیـشکێکی مەسـیحی یـە) "فاتیمـە"ی ناسـاندووە، وە بـەو شـێوەیە کـە د. جـورج جـرداق (پزیـشکێکی مەسـیحی یـە) باسـی"عـەلی" کـردووە، وە بـەو شـێوەیەی کـە ماسنیونی کاسۆلیك لێکۆڵینەوەی لێ کردووە "ئەهل و بەیت"، وە ئەبو زەڕی غـەففاری بـەو شـێوەیە کـە جـودە الـسحار نوسـیویەتی لـەبارەی، وە هـەتا "قورئـانیش" بەو شێوەیەی کە بلاشر (کەشیـشی ڕسمـی کلێـسا) تەرجومـەی کردووە، وە پێغەمبەر بەو جۆرەی کە ردنسن (توێژەرێکی جولەکەیە) دەیبینێت، لێ ی تێبگەن.

ئیلاهی! من بێ بەش بکە لە هەموو ئەو باشیانەی کە بەکەڵك خەڵك نایەن! وە توشی نەفامی دڕندانەی ئەو زانستە باشانەم مەکە کە لەبەر ڕاکێشانی هەستە بڵندەکان، وە لوتکەی میعراجە ناڕاستەکان، درەوشانەوەی برسیەتی لە قوڵاوی چاوێك دا، وە خەتی شینی قامچی یەك لەسەر پشتێك نەبینم!

## ♣ بەشێك لە میوەكانی زەوی

*لە فەرەنسی یەوە وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی لەلایەن دۆرۆسی بەسی*

فریو مەخۆ، ناتانیاڵ، بەو 'ناو نیشانە ناسازگارەی كە من پێموابوو گونجاوە بیدەمە ئەو كتێبە. لەوانەبوو ناوم لێنابا میناڵكاس، بەڵام میناڵكاس هەرگیز، زیاتر لە خودی خۆم، بوونی نەبووە. تاكە مرۆڤێك كە لەوانەبوو ناوەكەیم پێوە بەستبایەوە هی خۆمە: بەڵام ئەو كاتە چۆن وێرابام ئیمزای بكەم؟
من خۆمم خستۆتە ناو ئەو كتێبەوە بەبێ سۆز یان شەرم: وە ئەگەر هەندێكجار تێیدا باسی هەندێك سەرزەوی دەكەم كە من هەرگیز سەردانم نەكردوون، یان هەندێك بۆن كە من هەرگیز هەڵم نەمژیون، هەندێك كردار كە من هەرگیز ئەنجامم نەداون –یان باسی تۆ، ناتانیاڵی من، كە هێشتا نەمدیتوی– ئەمە دوو ڕوویی نیە، وە ئەو شتانە زیاتر هەڵە نین لەو ناوەی كە من تۆی پێ بانگ دەكەم، نازانم ناوی تۆ چی دەبێت–هی تۆ، ناتانیاڵ، كە تۆ ڕۆژێك دەمخوێنیەوە.
وە كاتێك تۆ منت خوێندەوە، ئەم كتێبە فڕێ بدە –وە بڕۆ دەرەوە. لەوانەیە ئارەزووی ئەوەی پێ بەخشیبی كە بڕۆیە دەرەوە– كە بڕۆیە دەرەوە لە هەر شوێنێك كە لەوانەیە ئێستا لەوێ بیت، لە شارەكەت، لە خێزانەكەت، لە ژوورەكەت، لە بیرەكانت. كتێبەكەی من لەگەڵ خۆت مەبە. ئەگەر من میناڵكاس بام، دەبوو ئەو دەستەی تۆم بەرهەڵدابا كە گرتبووم وە پێم گوتبای كە من لەبیر بكەی.

خۆزگە کتێبەکەی من فێرت بکات کە گرنگی زیاتر بە خۆت بدەی نەك بەو (کتێبەکە) —وە پاشان گرنگی زیاتر بە هەموو ئەوانی تر بدەی نەك بە خۆت.

"خۆشبەختی یە تەمبەڵەکەم کە زۆر نوست

ئێستا خەریکە بەخەبەر دێت."

هیوا مەخوازە، ناتانیاڵ، کە خوا لێرەو لەوێ بدۆزیەوە —بەڵکو لە هەموو شوێنێك.

هەموو بونەوەرێك ئاماژە بۆ خوا دەکات و هیچیان ئەو دەرناخەن.

هەر بونەوەرێك کە رێگای پێدەدەین چاوەکانمان بوڵای خۆی ڕاکێشێت بیرمان لە خوا دوور دەخاتەوە.

لە کاتێکدا خەڵکی تر کتێبیان دەردەکرد یان کاریان دەکرد، من، بەپێچەوانەوە، سێ ساڵ لە گەشتکردنم تەرخان کرد بۆ لەبیربردنەوەی هەموو ئەوەی کە بە مێشکم فێری بووبووم. هەڵوەشاندنەوەی ئەو فێربوونە هێواش و گران بوو: زیاتر کەڵکی هەبوو بۆ من لە هەموو ئەو فێربوونەی لەلایەن مرۆڤــەوە دەسەپێندرێت، وە بەڕاستی سەرەتای پەروەردەیەك بوو.

تۆ هەرگیز ئەو هەوڵانە ناناسی کە پێویستن بۆئەوەی ژیانت بەدڵ بێت: بەڵام ئێستا کە ژیان ئێمەی بە دڵە، وەکو هەموو شتێکی تر دەبێت —هەست بزوێن بێت.

من گۆشتی خۆم تەمبێ کرد، چێژی زیاترم لە تەمبێکردنەکە وەردەگرت لەوەی لە هەڵەکەم —بۆیە مەست بوون ئەو شانازیە بوو کە من فریوم دا لە تاوان نەکردن.

لەناو خۆتدا بیرۆکەی شایستەیی دامرکێنەوە —یەکێکە لە خشتە لەرزۆکە گەورەکانی مێشك.

...بەدرێژایی ژیانمان ئێمە ئەشکەنجە دراوین بەهۆی نادڵنیایی ڕێگایەکانمان.

چۆن باسی بکەم؟ هەموو هەڵبژاردنێك، کە مرۆڤ بیری لێدەکاتەوە، تۆقێنەرە: ئازادی کاتێك هیچ ئەرکێك نیە ڕێنومایی بکات، تۆقێنەرە. ئەو ڕێگایەی کە

پێویستە هەڵببژێردرێت بە وڵاتێکی تەواو نەدۆزراوەدا درێژ دەبێتەوە، کە تێیدا هەر کەسێك دۆزینەوەکانی خۆی ئەنجام دەدات، وە -سەرنجی ئەوە بدە- تەنیا بۆ خودی خۆی: کەواتە ئاڵۆزترین ڕێڕەو لە تاریکترین بەشی ئەفریقا زۆر بە ئاسانتری جیادەکرێتەوە....دارستانە خاوەن سێبەرەکان چاوچنۆکمان دەکەن، لەگەڵ تراویلکەی کانیاوە هەمیشەیی یەکان. یان زیاتر، کانیاوەکان بۆ ئەو شوێنە دەڕۆن کە ئارەزووەکانی ئێمە فەرمانیان پێ دەکەن: چونکە وڵاتەکە تەنیا کاتێك دێتە بوون کە نزیکبوونەوەی ئێمە شێوەی پێ دەبەخشێت، وە دیمەنی دەوروبەرمان وردەوردە شێوەدەگرێت لەهەمان کاتدا کە ئێمە بەرەوپێشەوە دەچین: ئێمە ناتوانین بە دووری ئاسۆ ببینین: وە هەتا دیمەنی پێش چاویشمان هیچ شتێك نیە جگە لە ڕوویەکی جێگرەوەی گۆڕاو.

بەڵام بۆچی بەراوردکاری بکەین کاتێك مەسەلەکە ئەوەندە جددی یە؟ ئێمە بڕوامان وایە کە پێویستە سەرەنجام خوا بدۆزینەوە. بۆ ئێستا، بەداخەوە، ئێمە لە کوێین تاوەکو نوێژەکانمان ئاراستە بکەین؟ لە کۆتاییدا، بەوە کۆتایی پێدێنین کە دەڵێین 'ئەو -کە ناتواندرێت بدۆزرێتەوە- لە هەموو شوێنێکە، لە هەر شوێنێکە، وە بەڕێکەوت دەکەوینە سەر ئەژنۆ.

وە کەواتە، ناتانیاڵ، تۆ وەکو ئەو مرۆڤەی کە پێویستە شوێن بکەوی وەکو ئەو ڕێنیشاندەرەی کە ڕووناکی یەکەی لە دەستی خۆیدایە.

بۆ هەرشوێنێك بڕۆی، تۆ توشی هیچ نابی بێجگە لە خوا، "خوا،" مێنالکاس وایگوت، "ئەوەیە کە لەبەردەمی ئێمەیە."

ناتانیاڵ، تەماشای هەموو شتێك بکە کاتێك بە ڕێگای خۆتدا دەڕۆی، بەڵام لە هیچ جێگایەك مەمێنەوە. لەبیرت بێت کە تەنیا خوا زوو گوزەر نیە.

با گرنگی لە تێڕوانینی تۆدا بێت، نەك لەو شتەی کە سەیری دەکەی.

هەموو زانیاری کۆکراوەت لەبارەی ئەوەی لەدەرەوەی خۆتە لەدەرەوەی تۆ دەمێنێتەوە بۆ هەتا هەتایە. بۆچی ئەوەندە گرنگی پێ دەبەخشی؟

کەڵك لە خواستەکاندا هەیە، وە کەڵك لە ڕازیبوونی خواستەکان -چونکە بەو شێوەیە زیاد دەبن. وە لە ڕاستیدا، ناتانیاڵ، هەر یەکێك لە خواستەکانی من منی بەهێزتر کردووە زیاتر لە خاوەندارێتی هەمیشە-فریودەری تەنی (شتی) خواستەکەم.

زۆریان شتی بەتامن، ناتانیاڵ، چونکە من بەهۆی ئەوینەوە توامەوە. درەوشانەوەی ئەوان لە سوتانی بەردەوامی من بۆ ئەوانەوە هات. من هەرگیز ماندوو نەبووم. هەموو خوێنگەرمی یەك منی بە ئەوینەوە تواندەوە -بە تامەوە تواندمیەوە.

هەڵگەڕاوەیەك لەناو هەڵگەڕاوەکان، من بەبەردەوامی ڕاکێشراوم بۆ لای دژیەکترین بیروڕایەکان، گومڕاترین بیرەکان، ئەوپەڕی لێکدورکەوتنەوەکان. هیچ شتێك سەرنجی ڕانەکێشام لە هیچ مێشکێك دا تەنیا ئەوە نەبێت کە ئەوی لەوانی تر جیاواز نیشان دەدا. من هێندە دوور ڕۆیشتم بۆئەوەی بەزەیی لە خۆم قەدەغە بکەم، کە بۆ من تەنیا وەکو ناسینێکی پەتی هەستێکی ئاسایی دەچوو.

نەخێر، بەزەیی نا، ناتانیاڵ- خۆشەویستی.

هەنگاو بنێ بەبێ بڕیاردان لەبارەی ئەوەی کە هەنگاوەکەت ڕاستە یان هەڵەیە. خۆشەویستی پێشان بدە بەبێ گرنگیدان بەوەی کە ئەوەی خۆشتدەوێت باشە یان خراپە.

ناتانیاڵ، من وانەی خوێنگەریت فێردەکەم.

ژیانێکی پەرێشانکەر، ناتانیاڵ، نەك ژیانێکی ئارام. با هیچ پشوویەکم نەبێت بێجگە لە خەوی مردن. من بەداخەوەم کە هەموو ئارەزوویەك، هەموو وزەیەك کە منیان ڕازی نەکردووە لە ماوەی ژیانمدا لەوانەیە بمێننەوە بۆئەوەی ئەشکەنجەم بدەن. هیوام وایە کە دوای ئەوەی کە من لەسەر ئەم زەویە هەموو ئەوەم دەربڕی کە لە ناومدا بوو وە چاوەڕوانی دەربڕین بوو- هیوام وایە کە من بمرم بە ڕازیبوونەوەو ئەوپەڕی بێ هیوایی یەوە.

نەخێر، بەزەیی نا، ناتانیاڵ، خۆشەویستی. بەدڵنیاییی یەوە تۆ تێدەگەی کە ئەو دووە وەکو یەك نین. ئەوە ترسی لەدەستدانی خۆشەویستی بوو کە وایلێکردم هەندێکجار بەزەیی دەربڕم لەبەرامبەر خەمەکان، گرفتەکان، و ئازارچەشتنەکان کە بە پێچەوانەوە من بە ئەستەم دەمتوانی بەرگەیان بگرم. بۆ هەرکەسێك گرنیگیدان بە ژیانی خۆی بۆخۆی جێبهێڵە.

من ناتوانم بنوسم ئەمڕۆ چونکە بەرداشێك لە تەویلەکەدا دەخولێتەوە. دوێنێ من بینیم: بە کلۆزا کەوت. کا و پوشەکە تۆزی لێ هەستا: دانەوێڵەکە ڕژایە سەر زەوی. تەپوتۆزەکەی خنکێنەر بوو. ژنێك بەرداشەکەی دەچەرخاند. دوو کوڕی جوانی پێخواس دانەوێڵەکەیان کۆدەکردەوە.

من دەگریەم چونکە هیچ شتێکی ترم نیە بیڵێم.

من دەزانم کە مرۆڤ نابێت دەست بە نوسین بکات کاتێك هیچی تری نیە بێجگە لەوەی بڵێت...وە لەگەڵ ئەوەشدا نوسیومە و دەبێت زیاتر بنوسم دوبارە لەسەر هەمان بابەت.

ناتانیاڵ، من حەزدەکەم کە خۆشی یەکت پێ ببەخشم کە هیچ کەسی تر تا ئێستا پێی نەبەخشیوی. من نازانم چۆن بیڕێژم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خۆشی یە هی منە. من پێمخۆشە بە هۆگری زیاترەوە قسەت لەگەڵ بکەم بەبەراورد لەگەڵ هەر کەسێکی تر کە لەوەتای هەی قسەی لەگەڵ کردووی. من پێمخۆشە بێم بۆلای تۆ لەو کاتژمێرەی شەودا کە کتێب لەدوای کتێبت کردوّتەوە، وە پاشان زۆر کتێبی مەزنت داخستونەتەوە دوای سەیرکردنی هەریەکێکیان بۆ گەڕان بۆ شتێك کە زیاتر بێت لەوەی تا ئێستا پێ ی وتووی: کاتێك تۆ ئێستاش چاوەڕوانیت هەیە: کاتێك خوێنگەرمی یەکەت خەریکە دەگۆڕێت بۆ خەمباری بەهۆی ویستنی ڕۆژی یەوە. من تەنیا بۆ تۆ دەنوسم: من تەنیا بۆ تۆ دەنوسم لەو کاتژمێرانەدا. من پێمخۆشە کە کتێبێك بنوسم کە لێ یەوە هەموو بیرێك و، هەموو هەستێکی من بۆ تۆ غایب بن، کە تێیدا تۆ هیچ نەبینی تەنیا

بەرەوپێشچوونی خوێنگەرمی خۆت نەبێت. من پێمخۆشە کە بێم بۆلای تۆو وات لێبکەم خۆشت بوێم.

غەمگینی هیچ نیە جگە لە خوێنگەرمی دامرکاو.

هەموو بونەوەرێك توانای پەتی بوونی هەیە: هەموو هەستێك توانای چەندجارەبوونی هەیە.

هەستەکانم گوڵیان گرتووە لە مندا وەکو نیگایەکی خوایی.

دەتوانی لەمە تێبگەی- کە هەموو هەستێك بوونی هەیە و ئامادەیە، بە نەبڕاوەیی؟

ناتانیاڵ، من فێری خوێنگەرمیت دەکەم.

کردارەکانمان بە ئێمەوە لکاون وەکو ئەوەی تروسکایی بە فۆسفۆڕەوە لکاوە. ئەوان ئێمە دەتوێننەوە، ئەمە ڕاستە، بەڵام دەماندرەوشێننەوە.

وە ئەگەر گیانەکانمان هیچ شایستەیی یەکیان هەبێت، ئەمە لەبەر ئەوەیە کە گەرمتر سوتاون لە ئەوانی تر.

کێڵگە مەزنەکان شۆردرانەوە لە سپیایی بەرەبەیاندا، من ئێوەم بینیوە: دەریاچە شینەکان، من خۆم لە ئاوەکانی ئێوەدا شۆشتووە- وە من بۆ هەموو نازێکی شنەبای پێکەنیناوی زەردەخەنەم پێشان داوە وەکو وەڵام- من هەرگیز نابێت لە گێڕانەوەی ئەمە بۆ تۆ ماندوو ببم، ناتانیاڵ. من فێری خوێنگەرمیت دەکەم.

ئەگەر من شتی دڵگیرترم زانیبا لەوانە، ئەوا باسی ئەوانم بۆ دەکردی-بەڵێ، بەڵێ، باسی ئەوان و هیچ شتی تر نا.

تۆ فێری ژیریت نەکردووم، مێنالکاس. ژیری نا، بەڵکو ئەوین.

من هەستی زیاتر لە هاوڕێ یەتیم هەبوو بۆ مێناڵکاس، ناتانیاڵ، وە زۆر بەکەمی کەمتر لە ئەوین. من وەکو برایەکیش خۆشم ویست.

مێنالکاس مەترسیدارە: لێ ی وریا بە: مرۆڤە ژیرەکان ئیدانەی دەکەن، بەڵام منداڵەکان لێ ی ناترسێن. ئەو لە خۆشویستنی هەموو شتێکیان دادەبڕێت تەنیا خێزانەکانیان نەبێت وە فێریان دەکا کە بەهێواشی بەجێ ی بێڵن: ئەو

دڵەکانیان ماندووی پێخۆشبوونی ئەو میوەیە دەکات کە کێوی و ترشە، لەگەڵ خۆشەویستی بۆ زانینی ئەوینە سەیرەکان. ئەهە، مێنالکاس، من بەخۆشی یەوە گەشتم دەکرد لەگەڵ تۆ بە زۆر- ڕێگای تردا. بەڵام تۆ ڕقت لە لاوازی دەبوو‌ە، وە بانگەشەی تۆ بۆ ئەوە بوو کە فێرم بکەی کە تۆ بەجێبێڵم.

ئەگەری سەیر هەن لەناو هەموو مرۆڤێکدا. 'ئێستا' لەناو خۆیدا هەموو 'داهاتووەکانی' تێدادەبێت ئەگەر 'ڕابردوو' مێژووەکەی خۆی نەخزاندبێتە ناوی. بەڵام، بەداخەوە، تەنها شت وە تەنیا ئەوەی ڕابردوو دەتوانێت پێشکەشمان بکات هیچ زیاتر نیە لە تەنها یەك شت و یەك داهاتوو- کە لەبەردەمی ئێمە دەکرێتەوە وەکو پردێکی بێ کۆتا بەسەر بۆشایی دا.

ئێمە تەنها دەتوانین لەوە دڵنیا بین کە هیچ کارێك نەکەین کە توانای تێگەیشتن لەومان نییە. کە تێبگەی واتا هەست دەکەی توانای ئەنجامدانیت هەیە.

"ئەوەندەی دەگونجێت مرۆڤایەتی لەبەرچاوبگرە"- با ئەوە دروشمی تۆ بێت.

شێوە جۆراو جۆرەکانی ژیان: یەك بە یەکیان، بۆ من جوان دەرکەوتن. (ئەمەی من بەتۆی دەڵێم ئەوەیەی کە مێنالکاس بە منی وت.)

بەڕاستی من هیوام وایە کە هەموو ئارەزوو و هەموو خراپی یەکانم ناسیبێت: بەلایەنی کەمەوە پشتیوانیم لێ کردوون. هەموو بوونی من بە ئارەزووەوە ڕاکێشراوە بۆ هەموو ڕێبازەکان: وە لە هەندێك ئێوارەدا ئەوەندە شێت بووم کە نیزیك بوو بڕوا بە گیانی خۆم بکەم، هەستم کرد زۆر نیزیکە لەوەی لە جەستەم ڕابکات. مێنالکاس ئەمەشی وت.

وە ژیانمان خرابایە بەردەممان وەکو ئەو پەرداخە بەفراوە، ئەو پەرداخە تەڕەی کە کەسێکی نەخۆش بە دەستە تادارەکانی یەوە گرتوویەتی، کە پێ ی خۆشە بیخواتەوە، وە کە بەیەك قم دەیخواتەوە، دەزانێت کە پێویستە چاوەڕێ بێت، بەڵام توانای لێکردنەوەی ئەو پەرداخە بەتامەی لە لێوەکانی نیە، ئاوەکە زۆر ساردە، وە تایەکەش زۆر بەگەرمی داوای ئاوەکە دەکات.

ئەھ، چەندە بە قوڵی ھەوای ساردی شەوم ھەڵمژیوە، ئەھ، پەنجەرەکان! وە ئێوە، پڕیشکە ڕەنگ زەردھەڵگەڕاوەکان کە لە مانگەوە جوگەلە دەبەستن بەناو تەمی شەودا، زۆر وەکو ئاوی کانی یەك دەچن- کە پێدەچێت یەکێك بتانخواتەوە.

ئەھ، پەنجەرەکان! چەند جار من ناوچاوانی خۆم ساردکردۆتەوە بە شوشەکانتان، وە چەند جار، کاتێك دەردەپەڕم لە لەرزە بەرگەنەگرتووەکانی جێگایەکەم وە ڕادەکەم بۆ ھەیوانەکە، ئارەزووەکانم نامێنن وەکو تارمایی لەبەرچاوی ئاسمانە فراوان و ئارامەکاندا!

لەرزو تایەکانی ڕۆژە ڕۆیشتووەکان، ئێوە گۆشتی منتان تواندەوە بە سوتانێکی کوشندە: بەڵام چەندە مەزنە ماندوێتی گیان کاتێك ھیچ شتێك سەرنجی پەرت ناکات لە خوا!

چەسپاوی سوپاسگوزاری یەکەی من ترسناك بوو: من تێیدا ھەڵمژرام بۆ خۆ- لەناوبردن.

"تۆ زۆر دەگەڕێ ی،" مێنالکاس پێ ی وتم، "بەدوای خۆشبەختی مەحاڵی گیان دا."

دوای ڕۆژە سەرەتایی یەکانی خۆشی یە گوماناوی یەکە خراپی ڕۆیشتبوو - بەڵام پێشئەوەی من مێنالکاس ببینم- من، بە ماوەیەکی پەشۆکاوی دوودڵی دا تێپەڕیم: وەکو تێپەڕین بە زەلکاوێکدا وابوو. من نقوم بووم و تێکشکام بۆناو خەوە قورسەکان کە ھیچ بڕێك نوستن بەس نەبوو بۆ چاککردنەوەی من. من دوای ژەمەکان پاڵدەدایەوە: من دەنوستنم، من بەخەبەردەھاتم ماندووتر لە پێشتر بووم، بە مێشکێکی نوستووەوە، وەکو ئەوەی لە قۆناغەکانی سەرەتای شێوە-گۆڕان دابم.

چەرخانە ئاڵۆزەکانی ژیان: ڕەنجە شاردراوەکان، لەدایکبوونە نەناسراوەکان، لە دایکبوونە دژوارەکان، خەواڵوویی، بێ ئیرادەیی: من نوستم وەکو کۆرپەلە و قۆزاخەیەك: من ڕێگام دا، بەو بوونەوەرە جیاوازەی کە دەبووم بەو- لە ناو

خۆمەوە. هەموو ئەو ڕووناکی یەی کە بەمن گەیشت وەکو ئەوە بوو کە پاڵێورابێت بە قوڵایی لەسەر قوڵایی ئاوە سەوزەکان، بەناو گەڵاو لاخی درەختەکاندا: تێگەیشتنەکانم شێواو بوون، کپکرابوون، وەکو هی کەسێکی تاساو یان سەرخۆش. من نزام کرد، " با قەیرانەکە خۆی دەرخات ئێستا، دەست بەجێ، با نەخۆشی یەکە خۆی ڕابگەیەنێت، ئازارەکە بڕیمیەوە!" وە مێشکم هەستی دەکرد وەکو ئاسمانە زریاناوی یەکان، بارکرابوو بە هەورە نزمکەرەوەکان، لە ڕۆژگارێکدا کە هەناسەدان بە نیزیکەیی مەحاڵ بوو، وە هەموو سروشت بەپەرۆشەوە چاوەڕێ ی شریقەی هەورەبروسکە بوو کە کیسە ئاوی گران-بەگاڵتەجاڕی و تاریکەکان دەکاتەوە کە نیلیی ئاسمان دادەپۆشن.
ماوەی چەندە، چاوەڕوانی، تۆ بەردەوام دەبی؟ وە جارێکی تریش، چی بۆ ئێمە دەمێنێتەوە کە بژین لەپێناویدا؟ "چاوەڕوانی! چاوەڕوانکردن بۆ چی؟" من هاوارم کرد. "چی دەتوانێت بێت کە لەخودی خۆمانەوە پەیدانەبێت؟ وە چی دەتوانێت پەیدابێت لە ئێمە کە دەمێکە نایزانین؟"
لەدایکبوونی هابیل، دەزگیرانی من، مردنی ئێریک- هەموو ئەو گۆڕانە نەخوازراوەی ژیانم، دوور لەوەی کە کۆتایی بە بێ هەستی و خوێنساردی من بێنێت، واپێدەچوو زیاتر بەرمبداتەوە بۆ ئاستی قوڵتر، چونکە وادەپێدەچوو مەرگە درۆیینەکەم لە ئاڵۆزی بیرم و بێ-بڕیاری ئیرادەمەوە سەرچاوە بگرێت. من دەبوو پێم خۆشبا، وەکو سەوزەیەك، نوستبام تاوەکو بێ کۆتا لەناو شێ ی زەوی دا. هەندێکجار، من بە خۆمم دەگوت کە چێژە هەستەکی یەکان کۆتایی بە کێشەکەم دێنن، وە من هەوڵم دەدا کە مێشکم ئازاد بکەم بە زۆر ماندووکردنی جەستەم. پاشان دیسان دەنوستمەوە کاتژمێر لەدوای کاتژمێر، وەکو منداڵی بچوك کە هەست بە خەواڵوویی دەکەن بە گەرما وە نیوەڕۆیان دەخرێنە ناو جێگا لەکاتی جموجوڵی ماڵێکی پڕ چالاکی دا.
پاشان، خوا دەزانێ لە کوێ وە بانگدەکرامەوە، من بەخەبەر دەهاتم، بە دڵێکەوە کە لێیدەدا و مێشکێکەوە کە خەواڵوو بوو. ئەو ڕووناکایی یەی کە تروسکایی

یەکەی دەهاتە ناوەوە لە خوارەوەڕا لە درزەکانی پەردە داخراوەکانەوە، وە درەوشانەوەی سەوزی دەخستە سەر فریزووەکە لەسەر بنمیچە سپی یەکە- ڕووناکی ئەو ئێوارەیە تاکە دڵدانەوەم بوو، نەرم و دڵڕفێن بوو وەکو ئەو تروسکایی یەی کە پاڵێوراوە بەناو گەڵایەکان و ئاودا وە دەلەرزێت لە زالکی ئەشکەوتە تاریکەکاندا، بۆ ئەو چاوانەی کە لەمێژە ڕاهاتوون لەگەڵ تاریکیەکانیاندا.

ژاوەژاوەکانی ماڵەکە بە ناڕوونی دەگەیشتنە من. من بەهێواشی زیندووبومەوە. من خۆم لەناو ئاوی شیلەوتێن دا شرد وە بە سستی ڕۆیشتم بۆ دەشتەکە، تاوەکو کورسی ناو باخچەکە لە تەمبەڵی دابوو، من چاوەڕێم دەکرد کە ئێوارە دابێت. من بەبەردەوامی ئەوەندە ماندوو بووم کە نەمدەتوانی قسە بکەم، گوێ بگرم، یان بنوسم. من خوێندمەوە:

"....ئەو لەبەردەمی خۆی ڕێگا چۆلکراوەکانی دەبینی، واقەکانی دەبینی کاتێك ئەوان باڵەکانیان بڵاودەکرد و خۆیان دەشرد. لێرە ئەمەم بەدەستەوە دەمایەوە کە دەبوو من بژیەم.

من ناچارکراوم کە نیشتەجێ بم

لەژێر گەڵایەکانی جەنگەڵدا،

لەژێر دار بەڕووەکاندا،

لەم ئەشکەوتەی ژێر زەوی دا.

سارده ئەو خانووە زەمینی یە:

من لێ ی ماندووم.

دۆڵەکان خەمبارن

بەرزن گردەکان

شوێنی نیشتەجێبوونی خەمناك، دامەزرێندراون بەش بەش،

داپۆشرابوون بە چەقڵی-

پێگەیەکی غەمگینە."

ئەو هەستەی کە جۆرە تەواویەکی ژیان گونجاوە، هەرچەندە ئێستاش بەدەست نەهاتووە، هەندێك جار تروسکایەکەی دەهاتنە ناوەوە، پاشان زیاتر دەهاتن، پاشان زیاتر و زیاتر بە پێداگری، سەردانکردنی بەردەوام. "ئابل" من هاوارم کرد، "با دەلاقەیەك بکرێتەوە، با ڕووناکی ڕۆژ بە گورزە و لێشاو بێتە ژوورەوە، با لە کۆتایی دا بدرەوشێتەوە لەناو ئەو تاریکی یە پەستانەدا!"

تەواوی بوونم هەستی دەکرد، هەروەکو ئەوەی نایابێك بیهەوێت وزەی خۆی نویٚ بکاتەوە لە گەرماوی نوێی ی دا. من چاوەڕوانی پێگەیشتنێکی ترم کرد. ئەهـ، ئەگەر تەنها چاوەکانم دەیانتوانی بە بینینێکی نویٚ وە ببینن، ئەگەر تەنیا دەمتوانی پاکیان بکەمەوە لە تۆزی کتێبەکان، زیاتر وەکو ئاسمانەکانیان لیٚ بکەم کە ئێستا سەیریان دەکەن کە ئەمڕۆ شۆردراونەتەوە بە بارانە تازەکان وە گەش و پاکن... . من نەخۆش کەوتم، من گەشتم کرد، من مێنالکاسم بینی، وە ماوەی چاکبونەوە سەرسامکەرەکەم شێوەگۆڕین بوو. من دوبارە لە دایك بوومەوە بە خودێکی نویٚ وە، لە سەرزەمینێکی نویٚ وە لەناو ئەو شتانەی کە بەتەواوی نویٚ بوون.

ناتانیالٚ من باسی چاوەڕوانیت بۆ دەکەم. من دەشتەکانم بینیون کە لە هاویندا چاوەڕیٚ بوون، پەرۆشی کەمێك باران بوون. تۆزی سەر ڕێگایەکان ئەوەندە سوك بووبوو کە پشووە بایەکیش هەڵیدەستاند. ئەوە هەتا پەرۆشیش نەبوو- ئەوە دڵەڕاوکیٚ بوو. زەوی تیك و قڵشی گەورە گەورەی تێبوون بەهۆی وشکە ساڵی یەوە، هەچەندە باشتر وادەردەکەوت کە بەخێرهاتنی ئاوی ئایندە بکات. بۆنی خۆشی گوڵە کێویی یەکانی کەویەکان بەرگە نەدەگرا، جیهان بە هەناسەگراویی یەوە کەوت بوو لەژێر گەرمای خۆر.

هەموو پاش نیوەڕۆیەك دەڕۆیشتین بۆئەوەی پشوو بدەین لەژێر کەپرەکە، ئەو شوێنەی کەمێك نوا درابووین لە توندی یە زۆرەکەی ڕووناکی یەکە. ئەوە ئەو کاتەی ساڵ بوو کە قامیشە شەکرە گەیشتووەکان پڕبوون لە هەڵاڵەو بەنیانی لاخەکانیان دەوەشاندن بۆئەوەی تۆزە بەپیت-کەرەکان لە دەرەوە بڵاوبکەنەوە.

هەورە زریاناوی یەکان شۆڕ بووبونەوە لە ئاسمانی نزمکەرەوەدا وە هەموو سروشت چاوەڕوان بوو. ساتەکە زۆر سەرکوتکەرانە سەنگین بوو، چونکە هەموو باڵندەکان بێدەنگ بووبوون. هەناسەیەکی ئەوەندە گەرم لە زەوی دەردەچوو کە واپێدەچوو هەموو ژیان لە بێهۆشی دابێت: هەڵاڵەی درەختەکان لەسەر لاخەکان کەوتبوون وەکو دوڵێکی زێڕین. پاشان باران باری.

من ئاسمانم بینیوە هەڵدەلەرزی کاتێك چاوەڕوانی بەرە بەیان بوو. یەك یەك ئەستێرەکان کاڵ بوونەوە. چیمەنەکان لافاوی ئاونگ بەسەریاندا ڕژا: بایەکان هیچ لاواندنەوەیەکیان نەبوو تەنیا سەهۆڵی بوون. وادەردەکەوت بۆ من کە تەپەتەپی جیانەکراوەی ژیان لە هەموو لایەکمەوە دوادەکەوت، مەیلی بەخەبەرهاتنی نەبوو، وە سەرم زۆر گران بوو بەهۆی مەرگی دروێینەوە. من سەرکەوتم بۆ کەنارەکانی دارستانەکە: دانیشتم، بوونەوەران، کە متمانەیان بە گەڕانەوەی ڕۆژ هەبوو، دەستیان کردەوە بە کارو خۆشی یەکانیان. وە نهێنی ژیان جارێکی تر دەستی کرد بە خشەخش کردن بەهۆی وەلانانی گەڵایەکانەوە. پاشان بەرەبەیانی ڕۆژ داهات.

من ئێستاش بەرەبەیانی ترم بینیوون. من شەوم بینیووە بەچاوەڕوانکراوی، بە پەرۆشیی یەوە ویستراوە.

ناتانیاڵ، ڕێگا مەدە چاوەڕوانکردنەکەت هەتا ببێتە ویستن، بەڵکو بەسادەیی با بەخێرهێنەر بێت. پێشوازی لە هەموو شتێك بکە کە بۆلای تۆ دێت، بەڵام هیچی ترت پێویست نەبێت. بەپەرۆش بە بۆ ئەوەی هەتە. لەوە تێبگە کە هەر ساتێك لە ڕۆژەکەدا لەوانەیە خوا بە نەمری هی تۆ بێت. با پەرۆشی تۆ لەپێناوی خۆشەویستی دا بێت. وە خاوەنداریێتی تۆ وەکو هی خۆشەویستێك بێت. چونکە پەرۆشی چی یە ئەگەر کاریگەر نەبێت؟

دەزانی چی، ناتانیاڵ، تۆ خاوەنی خوای بەبێ ئەوەی کە ئاگات لێ بێت! خاوەنی خوا بیت واتا ئەو ببینی، بەڵام تۆ سەیر ناکەی. ئایا تۆ خوات نەبینی

کە لەسەر ڕێگات وەستا وە تۆش ڕووت لیٚ وەگێڕا؟ چونکە تۆ بەپێچەوانەوە ئەوت بەخەیاڵی خۆتدا هێنابوو.

ناتانیاڵ، خوا تەنیا دەبێت چاوەڕوان بکرێت. ئەوەی چاوەڕوانی خوا دەکات، ناتانیاڵ، ناتوانیٚ لەوە تێبگات کە خاوەنی خوایە. بڕوا بەوە بێنە کە خوا و بەختەوەری یەکێکن، وە هەموو بەختەوەری یەکەت بخە ئەم ساتەوە.

هەروەکو ئەوەی خانمان لە ڕۆژهەڵاتی ڕەنگ زەرد دا هەموو سامانەکەیان بەخۆیانەوە دەخەن، منیش هەمیشە لەگەڵ خۆمدا هەموو ئەوەی هەمە هەڵم گرتووە. لە هەموو بچوکترین ساتەکانی ژیانمدا وا هەستم کردووە لە ناخمدا هەموو سامانەکەم هەیە. سامانەکەم پێکنەهاتبوو لە کۆکردنەوەی زۆر کەلوپەلی تایبەتی مەزن، بەڵکو پێکهاتبوو لە هەر تاك ستایشێکی من بۆ ئەوان. من بەبەردەوامی هەموو سامانی خۆم لەژێر دەسەڵاتی تەواوی خۆمدا هەڵگرتووە.

سەیری ئێوارە بکە وەکو مردنی ڕۆژەکە: وە سەیری بەیانی بکە وەکو لەدایکبوونی هەموو شتەکان.

با هەموو ساتێك دیدگای تۆ نویٚ بکاتەوە.

مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە بەبەردەوامی سەرسامی نویٚ ی هەن.

هەموو ماندوێتی یەکەی مێشکت، ناتانیاڵ، لە جۆراوجۆری و فرەیی هەبوونەکانتەوە سەرچاوە دەگرێت. تۆ هەتا نازانی کامەیان لە هەموویان بەباشتر دەزانی وە لەوەش تێناگەی کە تاکە بوونێك کە بەهایەکی هەیە ژیانە. بچوکترین ساتی ژیان لە مردن بەهێزترە وە دوای دەخات. مردن هیچ نیە جگە لە ڕووخسەتێك کە بەخشراوە بە هەبوونی شێوەکانی تری ژیان، بۆئەوەی هەموو شتێك بەنەپچڕاوەیی نویٚ ببێتەوە، بۆئەوەی هیچ شێوەیەکی ژیان زیاتر لەو کاتەی پێویستیەتی بۆئەوەی خۆی دەرببڕێت نەخایەنێت. خۆش بەحاڵی ئەو ساتەی کە تێیدا وشەکانت دەنگ دەدەنەوە. هەموو کاتەکانی تر، گویٚ بگرە: بەڵام کاتێك قسەدەکەی، هیچی تر گویٚ مەگرە.

پێویستە ئاگرێکی گەورە بکەیەوە بە هەموو کتێبەکانت لە دڵتدا، ناتانیاڵ.

**ناشتنێك**

مرۆڤ هەندێك كتێب دەخوێنێتەوە كاتێك لەسەر كورسی یەكی باریك لەبەردەم مێزەیەكی قوتابخانە دانیشتووە.

هەندێك كتێب بە پیاسەكردن لە دەرەوە دەخوێندرێنەوە (كەمێك لەبەر قەبارەكەیان): هەندێكیان بۆ ناو دارستانەكانن، هەندێكیان بۆ ناوچە لادێ نشینەكانی تر دەبن، سیسێرۆ دەڵێت. هەندێكیانم خوێندۆتەوە لەناو گالیسكەدا: هەندێكی تریان لە كادێن دا. هەندێكیان وامان لێ دەكەن بڕوا بە هەبوونی گیان بكەین: هەندێكی تریان وامان لێ دەكەن لێ ی بێ هیوا بین. هەندێكیان دەیسەلمێنن كە خوایەك هەیە: هەندێكیان ناتوانن بیسەلمێنن.

هەندێكیان تەنیا لە كتێبخانەی تایبەتی دا ڕێگایان پێدەدرێت: هەندێكی تریان پێیاندا هەڵگوتراوە لەلایەن زۆر ڕەخنەگری بەرجەستەوە.

هەندێكیان هەن باسی هیچ ناكەن تەنیا پەروەردەكردنی مێش هەنگوینە نەبێت، وە لەوانەیە كەمێك بە تەكنیكی دابندرێن: هەندێكی تر كە زۆر باسی سروشتیان تێدایە، كە دوای خوێندنەوەیان هیچ پێویست ناكات بڕۆیە دەرێ بۆ پیاسەیەك. هەندێك هەن كە پیاوە ژیرەكان بە كەمیان دەزانن، بەڵام منداڵە بچوكەكان دەخەنە جۆش و خرۆشەوە.

هەندێكیان پێیان دەوترێت "گوڵچینی ئەدەبی" وە باشترین وتراویان تێدایە لەبارەی هەرشتێك كە لەژێر خۆر دایە. هەندێك هەن كە هەوڵ دەدەن وات لێبكەن ژیانت خۆش بوێت: هەندێكی تریان دوای نوسینیان نوسەرەكەیان توشی خۆكوشتن بووە. هەندێكیان هەن كە كینە دەدرونەوە وە بەرهەمی ئەوە هەڵدەگرنەوە كە درەویان كردووە. هەندێكیان، كاتێك دەیانخوێنیەوە، واپێدەچێت بدرەوشێنەوە، بارگاوی كراون بە نیگا، بە تامكردن بە بێ فیزی. هەندێك هەن مرۆڤ خۆشی دەوێن وەكو ئەو برایانەی كە زۆر پاكتر و باشتر ژیاون لە ئێمە. هەندێك هەن بە زمانی ئەوەندە سەیر نوسراون كە هەتا دوای لێكۆڵینەوەی قوڵ لەبارەیان، گونجاو نیە لێیان تێبگەی.

**ناتانیاڵ، کەی ئاگرێکی گەورە بکەینەوە بە هەموو کتێبەکانمان؟**
**هەندێکیان پەنجا فلس ناهێنن: هەندێکیان بێ ئەندازە بە بەهان.**
**هەندێکیان باسی پاشا و شاژنەکان دەکەن، وە هەندێکیان باسی زۆر هەژارەکان دەکەن.**
**هەندێك هەن کە وشەکانیان شیرینترن لە خشەخشی گەڵایەکان لە نیوەڕۆ دا.**
**کتێبێك هەبوو کە 'جۆن ڕۆنەکەرەی دەخوارد، وەك جرجان (بەلای منەوە، دڕوو خۆشتر بوون): گەدەی دەترشاند وە دواتر هەندێك شتی دەهاتە پێش چاوان.'**
**ئاگرێك، ناتانیاڵ، لە هەموو کتێبەکانمان!!**
**ئەوەندە بەس نی یە بۆ من کە لمی کەنار دەریا نەرمە: پێ یە پێخواسەکانم دەبێت هەستی پێ بکەن. من ئەو زانستە بەکەڵکم نایەت کە پێشتر بە قۆناغی هەستپێکردن دا نەڕۆیشتبێت.**
**من هیچ شتێکم بە شیرینی جوان نەبینیوە لەو جیهانەدا مەگەر حەزم کردبێت هەستی پێ بکەم بە هەموو هۆگریمەوە. خۆشویستنی جوانی زەوی، گوڵگرتنی ڕووکاری خۆت سەرسوڕهێنەرە. ئەو دیمەنانەی کە حەزی من دەکەوێتە ناویان، دەنیشێتەوە بەکراوەیی لەبەر دەمم کە بەسترانەوەی من دەیان دۆزێتەوە!**
**کۆڵانی پاپیروس، بەسەر ئاوەکەدا دەڕوانێت، قامیشەکان شۆڕدەبنەوە ناو ڕوبارەکە: گیایەکان ڕادەخرێن لە جەنگەڵەکەدا: دیمەنەکانی دەشتەکە بەهۆی لەباوەشگرتنی لخەکانەوە، بینینەکانی بەڵێنی بێ بەندوبار! من بە ڕێڕەوە تەنگەبەرەکاندا ڕۆیشتووم بەناو تاشە بەردو درەختەکاندا. من بەهارەکانی ژیانم بینیوە کە پشکوتوون.**
**باخچەیەك لەسەر گردێکی فلۆرەنتاین (ڕووبەڕووی فێیسۆل)- شوێنی یەکتر بینینمان ئەو ئێوارەیە.**
**بەڵام ئێوە نازانن، ناتوانن بزانن، ئانگاری، یدییەر، تیتیروس، "مێنالکاس وایگوت (وە من ئێستا قسەکانی ئەوتان بۆ دوبارە دەکەمەوە: ناتانیاڵ، بە ناوی خودی خۆم)، ئەوە جۆش و خرۆشە بوو کە گەنجیەتی منی هەڵلوشی. فڕینی**

کات منی شێت کرد. پێویستی هەڵبژاردن هەمیشە پشووبڕ بوو، هەڵبژاردن وادەردەکەوت بۆ من کە ئەوەندە هەڵبژاردن و دیاریکردن نەبێت بەئەندازەی ئەوەی ڕەتکردنەوەی ئەوە بوو کە هەڵمنەدەبژارد. من بە تاسانەوە بۆمدەرکەوت کە چەندە سنوردارن ئەو کاتژمێرانەی تێدەپەڕن، وە کات تەنیا هێڵێکی یەك ڕەهەندی هەیە، لەکاتێکدا من دەمهەویست قوڵ و پان بێت (سێ دووری بێت): چونکە ئارەزووەکانم بێ ئارامانە بەپەلە لەگەڵی دەڕۆیشتن، بەشێوەیەکی خۆ-لێ-لانەدراو تێکەڵی یەکتر دەبوون و هەڵدەدرانە سەر یەکتر. من قەت هیچم نەدەکرد تەنیا ئەمەو ئەوە نەبێت. ئەگەر ئەمەم کردبا، دەستبەجێ پەشیمان دەبووم بۆ ئەوەی تر، وە زۆر جار من بێ جوڵە مامەوە، نەمدەوێرا هیچ شتێك بکەم، تەنها دەستەکانم تەواو کراوەبوون بە هەواس پەرتی یەوە، دەترسام بیانخەمە سەر یەکتر نەوەکو تەنیا یەك شت بگرنە خۆیان.

هەڵەی ژیانم لەو ڕۆژانەدا ئەوە بوو کە توانام نەبوو بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بم لە هیچ لێکۆڵینەوەیەك چونکە نەمدەتوانی بڕیار بدەم کە دەست لە کۆمەڵێکی زۆر لێکۆڵینەوەی تر هەڵبگرم، هەموو شتێك زۆر خۆشەویست بوو لەلام بەو بەهایەوە، وە هیچ بەڵگەهێنانەوەیەکی ژیرانە نەیدەتوانی پەرێشانی من هێوربکاتەوە. چونە ناو بازاڕی بەخششەکان بە بڕە پارەیەکی هێندە کەمەوە (بەهۆی کێ وە؟) لەبەر دەستم دابوون. ئەگەر خەرجی بکەی، یان هەڵبژێری، واتا بۆ هەتا هەتایە دەستهەڵگرتن لە هەر دەرفەتێك بۆ ئەوانی تر، وە بێ شوماری ئەو بڕەی ئەوانی تر هەمیشە بە باشتر دادەنرا لە هەر یەکێکی تر جا هەرچی یەك بێت.

ئەوە هۆکاری هەندێك لەو بێزاریەم بوو کە بەرامبەر هەبوونی (خاوەنیەتی) هەر شتێك لە سەر زەوی هەم بوو- ترسی ئەوەی لەناکاو هیچ شتێکم نەبێت جگە لەو.

کەلوپەلەکان! خەزێنەکانی سامان! کۆمەڵەی گەنجینە دۆزراوەکان! بۆچی ئێوە ناکرێت بە ئێمە ببەخشرێن بەبێ هەڵاوێردن؟ من دەزانم، بەڕاستی، کە بەرهەمی

زەوی لەبن-نەهاتوو نی یە (هەرچەندە بە لەبن-نەهاتوویی نویٚ دەبێتەوە) وە ئەوەش کە ئەو فنجانەی من بەتاڵم کردووە بە بەتاڵی دەمێنێتەوە بۆ تۆ ئەی برایەکەم (هەرچەندە سەرچاوەکەی نیزیکە و لەبەر دەست دایە).

بەڵام ئێوە ئەی بیرۆکە نامادەی یەکان! شێوازە نەگونجێندراوەکانی ژیان، زانستەکانی سروشت، وە زانستی خوا، فنجانەکانی ڕاستی، ئەو فنجانانەی کە قەت بەتاڵ نابن، بۆچی ئێوە بەغیلن بەرامبەر ئێمە سەرەڕای زۆری خۆتان، کاتێك هەموو تینوێتی ئێمە ناتوانێت وشکتان بکات، وە ئێوە بەنەمری لافاوی ئاوی سازگارتان لێوە پەیدادەبێت بۆ لێوە کراوەکانی هەموو تازە هاتووەکان؟ من ئێستا فێربووم کە هەموو دڵۆپەکانی ئەو سەرچاوە سەرەکی یە خوایی یە وەکو یەکن: کە بچوکترینیان بەسە بۆئەوەی بمانگوازێتەوە وە تەواویی و هەمەکی خوا دەردەخات.

بەڵام لەو کاتەدا من ئارەزووی چیم نەکرد لە شێتی یەکەمدا؟ من بەغیل بووم بەرامبەر هەموو شێوازێکی ژیان: هەرشتێك بینیم کە کەسێکی تر ئەنجامی دەدا، من ویستم کە 'بۆخۆم ئەنجامی بدەم-نەك بۆم ئەنجام بدرێت، بەڵام ئاگاداربە، کە شتێك بۆ ئەوانی تر ئەنجام بدەم، زۆر کەم لە ماندوێتی و ئازارەکەی دەترسام، وە بڕوام وابوو کە پڕن لە ڕێنومایی. من لە کۆتایی دا بۆ ماوەی سێ هەفتە ئیرەیی بە پارمێندیس دەبرد چونکە خەریکی فێربوونی تورکی بوو: دوو مانگ دواتر ئیرەییم بە پێۆدۆسیوس دەبرد، کە لە گەردوونزانی تێگەیشتبوو. بۆیە ئەو وێنەیەی لە خۆم دروستم کردبوو ناشاوی ترین و ناڵنیاترین بوو چونکە توانام نەبوو ڕازی بم سنوری بۆ دابنێم."

چیرۆکی ژیانی خۆتمان بۆ بگێڕەوە، مێنالکاس، "ئالسیدیس گوتی. وە مێنالکاس بەردەوام بوو:

"لە تەمەنی هەژدە ساڵی دا، کاتێك یەکەمین قۆناغی خوێندنم تەواو کردبوو، بە مێشکێکی ماندوو لە کارەوە، دڵێکی داگیرنەکراوەوە کە نەخۆش بوو لە بەتاڵی

یەکەی خۆی، جەستەیەکی داهێزاو و تورت بوو بەهۆی سنور و ناچاری فشارەوە، من ڕێگایەکەم گرتەبەر، هیچ کۆتایی یەکم لەبەر چاو نەبوو بەڵام ئەوە بەسادەیی بۆ ساردکردنەوەی تای دەربەدەری و سوڕانەوەی بێ هۆو وێڵیی-م بوو. من هەموو شتەکانم ئەزموون کرد کە تۆ زۆر بەباشی دەیانناسی- کاتی بەهار، بۆنی زەوی، پشکوتنی کێڵگەکان، تەمومژی بەیانیانی سەر ڕووبارەکان، هەڵمی ئێواران لەسەر مێرگەکان. من بە شارۆچکەکاندا ڕۆیشتم، بەڵام لە هیچ شوێنێك ڕانەوەستام. دڵخۆش بووم، هەرچەندە من، ئەو کەسەی کە نەلکاوم بە هیچەوە لەسەر زەوی وە ئەو کەسەی کە خوێن گەرمی یەکەی بەبەردەوامی لەگەڵ خۆی بە هەموو بزاوتە نەبڕاوەکانی ژیاندا هەڵدەگرێت. من ڕقم لە ماڵ و خێزانەکان بۆوە وە لە هەموو ئەو شوێنانەی کە مرۆڤ پێ ی وایە دەتوانێت پشوویان تێدا بدۆزێتەوە: وە هوگری یە درێژخایەنەکان، وە وەفاداریەکانی خۆشەویستی، وە لکان بە بیرۆکەکانەوە-هەموو ئەوانەی کە دادپەروەری دەخەنە مەترسی یەوە: من بەتوندی بڕوام وابوو کە هەموو شتێکی نوێ پێویستە هەمیشە بۆی دەربکەوێت کە تەواوی ئێمە بەتەواویی ئامادەین.

"کتێبەکان فێریان کردووم کە هەموو ئازادی یەك کورتخایەنە وە هیچ کاتێك هیچ نی یە تەنیا دەسەڵاتی هەڵبژاردنی کۆیلایەتی تاك نەبێت، یان بە هەر نرخێك بێت خۆتەرخانکردنی تاکە- وەکو دنکە تۆوێك کە با دەیباتە ئەملاو ئەولا، بەدوای خاکێکی بەپیت دا دەگەڕێت تاوەکو ڕەگەکانی تێدا دابوکتێت و- وە تەنها کاتێك دەتوانێت گوڵ دەربکات کە بێ جوڵەیە.

بەڵام هەروەکو لە قوتابخانە فێربووبووم کە مرۆڤەکان ڕێنوماکراونین بەهۆی بەڵگەهێنانەوەی ژیرانەوە وە ئەوەش کە هەموو بەڵگەیەك دەکرێت بەرپەرچ بدرێتەوە بە یەکێکی پێچەوانە کە تەنها پێویستە بدۆزرێتەوە، من ڕۆیشتمە دەرەوە بۆ گەڕان بەدوایدا، هەندێکجار، لەماوی گەشتکردنە دوورو درێژەکانمدا. من ژیام لە چاوەڕوانی یە بەردەوام و بەتامەکانی داهاتوودا، گرنگ نەبوو هەرچی با. من ئەوەم فێری خۆم کرد، وەکو پرسیارە چاوەڕوانەکان لە

ڕووخساری وەڵامەکانیاندا، ئەو تینوێتی یەی کە سەرهەڵدەدات لە ڕووخساری هەموو چێژێکدا پێویستە خێرا بڕوات بۆئەوەی پێش خۆشی یەکەی بکەوێت.
دڵخۆشی یەکەی من لەم-و-لەو وە هات، هەر کانی یەك تینوێتی یەکی منی ئاشکرا کرد، وە لە بیابانی بێ ئاودا، ئەو شوێنەی کە ناکرێت تینوێتی بشکێندرێت، من توندی تایەکەم و خۆشی خۆرم بەباشتر دەزانی لەو. لە ئێوارانـدا، گەیشتمە کاریزی زۆر خـۆش، هەموویان زۆر سارد بوون چونکە لەماوەی ڕۆژەکەدا زۆر بیرم لەلایان بووبوو و پێویستم بوون.
لەسەر دەشتە لمینی یەکە کە ڕاست لەژێر خۆرەکە بوو، وەکو ئەوەی بەزەوی-دادرابم بەهۆی خەوێکی زۆرو داگیرکەرەوە، ئێستاش هەستم دەکرد، گەرمی یەکە ئەوەندە گەرم بوو وە هەتا لە لەرەلەری هەوایەکەوە من هەستم بە ترپەی ژیان دەکرد کە نەیدەتوانی بخەوێت- من هەستم دەکرد کە دەلەرزی وە لاواز دەبوو لە چەماوەی ئاسۆدا، وە لە پێ یەکانم دا گەورە دەبوو بە ئەوینەوە.
هەموو ڕۆژێك، وە لە کاتژمێرێکەوە بۆ کاتژمێرێکی تر، من هیچی ترم نەدەویست تەنیا ئەوە نەبێت کە سادەتر و سادەتر هەڵبمژرێم بۆناو سروشت.
من خاوەنی ئەو بەخششە بەبەهایە بووم کە زۆر زۆر هۆکاری زەحمەت نەبووم بۆخۆم. بەبیرهاتنەوەی ڕابردوو تەنها ئەوەندە دەسەڵاتی هەبوو بەسەر مندا کە یەکیەتی پێویست ببەخشێت بە ژیانم: وەکو ڕیسێکی هێمادار دەچوو کە پێسیۆسی دەبەستەوە بە ئەوینەکەی ڕابردووی بەڵام ڕێگای پاڵپێوەنانی بۆ چاوەڕوانی نوێتری داهاتووی لێ نەدەگرت. هەرچەندە، ئەو ڕیسە پچڕابوو، ئەهـ، شێوە-گۆڕانی سەرسامکەر!
زۆر جار لە قسە بێ مانایەکانی بەیانی زوانم دا، ئەو هەستە بەتامەم هەبوو کە خودێکی نوێم هەیە، تامێکی نوێ و سازگاری تێکەیشتن. 'بەخششی شاعیر،' من هاوارم کرد، 'بریتی یە لە بەخششی دۆزینەوەی بەردەوام،' وە من بەخێرهاتنی هەر شتێکم کرد کە دەهات. گیانم میوانخانەیەکی بەردەوام کراوە بوو لە چوار ڕیانەکاندا: هەرچی ویستبای دەچوٚ ناوی.

من خۆم کردە هێمن و ئاشتی کەر، لەبەر دەستی هەر یەك لە هەستەکانم دا، وریا بووم، گوێگرێك بووم بەبێ یەك بیر لەبارەی خۆیەوە، بە دیل-گری هەموو ئەو هەستانەی تێدەپەڕین، بۆیە زۆر کەم توانای کاردانەوەی هەبوو بۆ ئەمە، بەڵکو زیاتر بەهێزەوە هەموو شتێکی ڕەتدەکردەوە، وام بەباشتر دەزانی کە بە خراپ بیر لە هیچ شتێك نەکەمەوە. لە ڕاستیدا، زوو تێبینیم کرد کە چەند کەم خۆشەویستی من بۆ جوانی لەسەر بنەمای کینە بەرامبەر ناشیرنی دامەزراوە.

ڕقم لە تەمبەڵی بوو، چونکە دەمزانی کە لە یەك ئاوازی پێکهاتووە، وە بەتوندی بڕوام وابوو کە تاك دەبێت بە متمانەوە گریمان بخاتە سەر جۆراوجۆری بێ کۆتای جیهان. من پشووم دەدا گرنگ نەبوو لە کوێ. من لەناو کێڵگەکاندا نوستووم. من لەناو دارستانەکاندا نوستووم. من بەرەبەیانم بینیوە لەرزیوە لەنێوان چڵە درێـژەکانی دانەوێڵەو قاژووەکان کە لەسەر درەختەکانی بەلوت بەخەبەر دەهاتن.

بەیانی بوو کاتێك خۆم شرد لەناو گیایەکە وە خۆری هەڵهاتوو جلوبەگە تەڕەکانمی وشککردەوە. ئایا گوندەکان قەت جوانتر بوو-ون لەو ڕۆژەی من بینیم بەرهەمێکی باش بردرایەوە ماڵێ بە دەنگی گۆرانی وتنەوە، وە گاجووتەکانیش عەرەبانە گەورەو گرانەکانیان ڕادەکێشا.

لەوێ کاتێك داهات کە خۆشی یەکەم ئەوەندە مەزن بوو کە پێم خۆش بوو باسی بکەم، بۆئەوەی کەسێکی تر فێر بکەم کە چۆن ئەو خۆشی یەم بە زیندوێتی هێشتەوە.

هەندێکجار لە گوندە سەیرەکان، ڕاهاتبووم سەیری ماڵەکان بکەم کە بە هەموو لایەکدا بڵاودەبوونەوە لە ڕۆژدا وە لە ئێوارانداکۆدەبوونەوە لای یەك: باوکەکە بە ماندوێتی دەگەڕایەوە لەسەر کارەکەیەوە، منداڵەکان لە قوتابخانەکەیانەوە. بۆ ساتێك دەرگای خانووەکە دەکرایەوە بەئەندازەی تروسکایی یەك ڕووناکی و گەرمی و قاقای بەخێرهاتنەوە، وە پاشان دادەخرایەوە بۆ شەوێ. نە هیچ جۆرە گەڕۆکێك دەیتوانی بچێتە ژووری ئێستا، وە نە فووی با لەرزێنەرەکەی دەرەوە.

-خێزانەکان، من گروّتان لەگەڵ دەکەم! بازنەی داخراوی دەوری ئاگرەکەن: دەرگایەکانیان خێرا دادەخرێت: خاوەنداراني ئیرەیی بەری خوّشبەختین.- هەندێکجار، لە شەودا نادیارن، من ڕادەوەستام و خوّم خواردەکردەوەو سەیری شوشەی پەنجەرەکەم کرد بوّ ماوەیەکی دوورو درێژ چاودێری خووەکانی ماڵەکەم دەکرد. باوکەکە لە نیزیك چرایەکە بوو: دایکەکە دانیشتبوو درومانی دەکرد: کورسی باپیرە چوّل بوو: کوڕێك خەریکی وانەکانی بوو لەتەنیشت باوکی- وە دڵم هەڵدەئاوسا بەو ئارەزووەی کە لەگەڵ خوّم بیبەم بوّئەوەی ژیانێکی پڕ لە سەرسامی بژیەت لەسەر شەقامەکان.

ڕوّژی دواتر بینیم کوڕەکە لە قوتابخانە هاتە دەرەوە: ڕوّژێك دوای ئەوە، من قسەم لەگەڵ کرد: چوار ڕوّژ دواتر ئەو هەموو شتێکی بەجێهێشت بوّئەوەی شوێن من بکەوێت. من چاوەکانیم کردەوە بەڕووی جوانی دەشتەکاندا: ئەو تێگەیشت کە جوانی ئەوان بوّ ئەو کراوەو ڕاخراوە. من گیانی ئەوم فێرکرد کە زیاتر گەڕوّك بێت، کە دڵخوّش بێت کە خوّی ئازاد بکات هەتا لە کوّتاییدا لە منیش، کە خوّی ئاشنا بکات لەگەڵ تەنیایی یەکەیدا.

بەتەنیایی، من چێژم وەرگرت لە خوّشی دڕندەی شانازی بەخوّوەکردن. من پێمخوّش بوو کە دەرکەوێت پێش بەرەبەیان: من بانگی خوّرم کرد تاوەکو هەڵبێت بەسەر کێڵگە درواوەکاندا: چوێلەکە سەربەکوڵاوەکان خەیاڵەکانی منیان کردە گوّرانی: شەونم مەڵهەمی بەیانیانی من بوو. من چێژم وەردەگرت لە زوّری کەم-خەرجی یەکەم وە ئەوەندە کەمم دەخوارد کە سەرم سووك دەبوو وە بچوکترین هەستکردن جوّرێك لە سەرخوّشی پێدەبەخشیم.

من لەو کاتەوە زوّر شەڕابم خواردنەوە، بەڵام نەمزانی هیچیان ئەو مەستی یە ببەخشن کە پەیدادەبێت لە ڕوّژووگرتن کە دەشتەکان لە بەیانی زووان دا مەلەدەکەن لەبەرچاوان. کاتێك ڕوّژ هەڵهات، من خەوم لێکەوت لەناو گیای وشك دا.

من هەندێکجار ئەو نانەم هەڵگرت کە لەگەڵ خۆم بردبووم تاوەکو خەریك دەبوو ببورێمەوە: پاشان سروشت کەمتر ناسازگار دەردەکەوت بۆ من، زیاتر هۆگرانە ڕۆدەچوو- کاریگەری یەك بوو لە دەرەوەڕا، ئامادەبوونێك کە پێشوازی لێدەکرا لەلایەن هەموو هەستە بەپەرۆشەکانمەوە، جەژنێك بوو کە هەموو ناوەرۆکمی بۆ بانگهێشت کرابوو.

گیانم لە دۆخی خۆشی یەکی شاعیرانە دابوو، کە تەنیایی من بەدەستی هێنابوو وە کە ماندووکەر دەردەکەوت لەدەمی بەرەو ئێوارەدا. من هێشترامەوە بەهۆی شانازی بەخۆکردنەوە، بەڵام لەو کاتانەدا داخم بۆ هیلەری هەڵدەکێشا، کە ساڵێك پێشتر بوو بە هاوبەشی بارودۆخە مێشکی یە سەروو-کێویی یەکان و ئاسایی کردنەوە.

بەرەو ئێواران، من ڕاهاتبووم قسەی لەگەڵ بکەم: ئەو بۆخۆی شاعیرێك بوو: ئەو گوێ ی بۆ ئاوازەکان هەبوو. لە هەر وێنەیەکی سروشتی دا، دەمانتوانی پرسەکەی بخوێنینەوە وەکو ئەوەی لە کتێبێکی کراوەدا: فێربووین کە مێروولەکان بە فڕینەکەیان بناسینەوە، باڵندەکان بە ئاوازەکەیان. ئەویش هەڵلوشرابوو بە تینوێتی بۆ سەرکەشی: هێزەکەی ئازای کردبوو.

ئەهە، هیچ شکۆیەکی دواتر قەت یەکسان نابێت بە نەوجەوانی دڵەکانمان! بە جەزبەوە هەموو هەناسەیەکی هەڵدەمژی کە دەهات، ئێمە بێ سود هەوڵماندا کە ئارەزووەکانی خۆمان لەناوبەرین، هەموو بیرێك خوێنگەرمی یەك بوو، هەموو هەستێك لە هۆش-تیژی یەکی تاکەوە بوو.

ئێمە گەنجێتی پڕشکۆی خۆمان بەکاربرد لە چاوەڕوانی داهاتوویەکی باشتر، وە ئەو ڕێگایەش کە بەرەو ئەو دەڕۆیشت قەت تەواو بێ کۆتا دەرنەدەکەوت، لەوێ کە ئێمە هەنگاومان هەڵدێنان، ئەو پەرژینە بەدرکانەی گوڵەکان کە لە دەمدا تامی هەنگوین و تاڵی یەکی دڵگیر بەجێدێڵن بە لێوەکانماندا دەدا.

هەندێك جار، من بە پاریس دا تێدەپەڕیم، من بۆ چەند ڕۆژێك یان چەند کاتژمێرێك سەردانی ئەو شوقەیەم دەکرد کە سەردەمی منداڵیم بە

زەحمەتکێشی لێ بەسەر بردبوو: تەواو بێ دەنگ بوو: خانمێکی چاودێریکەر کە لەوێ نەمابوو چەند پارچەیەکی بەسەر کەلوپەلەکاندا دابوو. چرا بەدەستەوە، لە ژوورێکەوە دەڕۆیشتم بۆ ژوورێکی تر بەبێ کردنەوەی پەردەی پەنجەرەکان کە چەند سالێك پێشتر داخرابوون، یان بەبێ لادانی پەردەکان کە گران بوون بە بۆنی کافوور.

هەوایەکەی داخراو و کپکەر بوو. ژووری نوستەکەنم تەنیا بۆ من پارێزرابوو. لە کتێبخانەکە- کە تاریکترین و بێدەنگترین ی ژوورەکان بوو- کتێبەکان لەسەر ڕەفتەو مێزەکان ڕێکخرابوون بەو جۆرەی کە بەجێمهێشتبوون: هەندێك جار یەکێکیانم دەکردەوە، وە لەتەنیشت چرایەکی داگیرساو دادەنیشتم هەرچەندە ڕۆژیش بوو، بەخۆشیی یەوە تێپەڕینی کاتم لەبیر دەکرد: هەندێکجاریش پیانۆ گەورەکەم دەکردەوەو لە یادگەمدا دەگەڕام بۆ ئاوزێکی ڕۆژەکانی ڕۆیشتوو: بەڵام ئەوەندە بە بەشی کەم کەم بەبیرم دەهاتەوە کە زیاتر لێمدەگەڕا غەمگینم بکات، دەستم لە لێدانی پیانۆیەکە هەڵدەگرت. ڕۆژی دواتر دووبارە پاریسم زۆر بەجێهێشتبوو.

دڵم، کە بەشێوەیەکی سروشتی شلەی-دڵگیر بوو، هەروەکو ئەوەی لافاوی لێ هەستابێت بە هەموو ئاراستەکان: هیچ خۆشی یەك بۆ من وادەرنەدەکەوت کە بەتایبەتی هی خۆم بێت. من هەر ڕێبوارێکی کاتی کە هەبا بانگهێشتم دەکرد کە هاوبەشی پێ بکەم لەگەڵم، وە کاتێك بە تەنیا دەبووم بۆ چێژوەرگرتن لە خۆشی یەکەم، من تەنیا بە یارمەتی شانازی-بەخۆ-کردنەکەمەوە دەمتوانی ئەوە بکەم. هەندێك خەڵك تۆمەتی خۆ-ویستی یان بۆ هەڵبەستم: منیش بە بێ مێشکی تۆمەتبارم کردن. بانگەوازی من ئەوە بوو کە هیچ کەسم بەتایبەتی خۆش نەوێت- پیاو یان ئافرەت- بەڵکو تەنیا هاوڕێ یەتی یان میهرەبانی یان ئەوینم خۆش بوێت. من ئەوەم ڕەتکردەوە کە کەسێك بێ بەش بکەم لەوەی دەیدەم بە کەسێکی تر، وە تەنیا خۆم بەقەرز بدەم بەوان- هەروەکو ئەوەی هیچ خۆزگەم بۆ ئەوە نەدەخواست کە جەستە یان دڵی کەسێکی تر تایبەت بکەم بە خۆم.

لێرەش ماڵ-بە-کۆڵ بووم، وەکو لە سروشتدا لە هیچ شوێنێك نیشتەجێ نەبووم. بەباشترزانین لەلای من وەکو نادادپەروەری دەردەکەوت: ئاواتم بوو هی هەموو مرۆڤەکان بم، من خۆم نەدەدا بە هیچ کەسێك.

لە بەندەرەکان، من لەگەڵ دەریاوانەکانی کەشتی یە گەورەکان کۆدەبوومەوە: لەگەڵیان دەڕۆیشتم خوار بۆ کۆڵانە ئاماڵ تاریکەکانی شارۆچکەکە: بەڵام سەرزەنشتی خۆمم دەکرد بۆ ویستنی ئەو ئەزمونە، کە تاکە فریودەرمان بوو: بۆیە دەریاوانەکانم بەجێدەهێشت لە لانەکانیاندا، وە دەڕۆیشتمەوە کەنارئاوە ئارامەکە، ئەو شوێنەی شەوە بێدەنگە-ڕاوێژکارەکە لێکدانەوەی خۆی پێشکەش دەکردم لەبارەی ئەو کۆڵانانە کە قسەوقسەلۆکە سەیر و هەست بزوێنەکانی دەگەیشتنە من لەڕێ ی پەردەیەك لە نەشئەوە. من ئەو بەبەرەکەتی یەم بەباشتر دەزانی کە لە لادێ یەکاندا دۆزیبومەوە.

لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیمدا، هەرچۆنێك بێت (ماندوو نەبووبووم لە گەشتکردن، بەڵام هەستم بە نائاسودەیی دەکرد لەو شانازی بەخۆکردنە زۆرەی کە ئەو ژیانە سەرگەردانی یە هانیدابوو لە مندا)، من بۆمدەرکەوت، یان خۆم ڕازی کرد، کە من لە دواین وەرزی پێگەیشتن-و-چنین دام بۆ شێوازێکی تری ئەزموون.

'بۆچی، بۆچی؟' من پرسیارم لێکردن، 'ئێوە قسە لەگەڵ من دەکەن لەبارەی دووبارە ڕۆیشتن بۆ گەشتەکانم؟ من دەزانم کە گوڵە تازەکان دەپشکون لەتەنیشت هەموو ڕێگایەکان: بەڵام ئەوان ئێستا چاوەڕوانی ئێوەن. مێش هەنگوینەکان بۆ هەتاهەتایە ناڕۆن بۆ هەنگوین کۆکردنەوە: دوای ماوەیەك لە ماڵ دەمێننەوە بۆ پاراستنی گەنجینەکەیان.'

من گەڕامەوە بۆ ئەو شوقەیەی کە بەجێمهێشتبوو. کەلوپەلەکانم واڵاکردەوە: پەنجەرەکانم کردەوە: وە بەو پارەیەش کە بێ مەبەست پاشەکەوتم کردبوو لەماوەی سەرگەردانی یەکەمدا، توانیم هەموو جۆرە کەلوپەل و گوڵدانی بەنرخ

و، کتێبی دەگمەن و، بەتایبەتی وێنەکان کە زانیاریم لەبارەی وێنەکێشان ئەو توانایەی پێبەخشیم بیانکڕم بەدیاریکراوی بەبێ هیچ مەبەستێك، بکڕم.
بۆماوەی پازدە ساڵان، من سامانم خستەسەر یەك وەکو سەقیلێك، من شتەباشەکانم کۆکردەوە بە هەموو توانایەکانمەوە: من زانستم کۆکردەوە: من زمانە مردووەکان فێربووم، وە دەمتوانی بیانخوێنمەوە لە زۆر کتێبدا: من فێربووم کە زۆر ئامێری مۆسیقایی لێبدەم: هەموو کاتژمێرێکی هەر ڕۆژێك تەرخانکرابوو بۆ لێکۆڵینەوەیەکی سوودبەخش: بەتایبەتی مێژوو و زیندەوەرزانی سەرنجیان ڕاکێشام. من ئاشنای ئەدەبیاتی جیهان بووم. من هاوڕێ یەتیم دروست کردن، لەژێرسایەی سیفەتەکانی دڵم وە بێگومان باشی لەدایك بوونم، من توانیم بڕۆمە ناو ئەو هاوڕێ یەتی یانە بە هەموو وەفایەکمەوە. ئەو هاوڕێ یەتییانە بەبەهاتر بوون لە هەموو شتەکانی تر، وە لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی لەلای خۆیان بمهێڵنەوە.
کاتێك تەمەنم پەنجا ساڵ بوو، کاتەکە گەیشتبوو، هەموو ئەو شتانەی هەمبوون فرۆشتمن، وە چونکە بەهۆی حەزو شارەزایی مەوە، هەموو ئەو شتانەی کە بەدەستم هێنابوون بەهایەکەیان زیادی کردبوو، بە دوو ڕۆژ سامانێکی زۆرم بۆ دەرکەوت، کە من بە جۆرێك خستبوومە وەبەرهێنانەوە کە هەمیشە دەستبەجێ لەبەردەستم دا بێت. من بەتەواوی هەموو شتێکم فرۆشت، سووربووم لەسەر ئەوەی کە نابێت هیچ شتێکی تاکەکەسیم هەبێت لەسەر زەوی- هەتا بچوکترین یادگاری ڕابردووش.
بە میرتیل، کە هاوەڵی سەرسامی یەکانم بوو، دەمگوت: 'ئەو بەیانی یە دڵگیرە، ئەو تەم و مژە و ئەو ڕووناکی یە، ئەو نوێیی یە ساردە، ئەو ترپەترپ کردنەی بوونت، هەستێکی زۆر مەزنتری خۆشیت پێدەدات ئەگەر تۆ بتوانت دەست لەخۆت هەڵبگری بۆی بۆ هەتا هەتایە. تۆ وا خەیاڵ کەوە کە لێرەی، بەڵام باشترین بەشی تۆ بەستراوەتەوە لە شوێنێکی تر: هاوسەرەکەت و منداڵەکانت، کتێبەکان و لێکۆڵینەوەکانت زیندانی یان کردووە وە خوای لێ فڕێندراوە.

ئایا پێتوایە کە لەم ساتە دیاریکراوەدا تۆ دەتوانی تا ئەوپەڕی هەستەکانی ژیان بە هەموو هێزو تەواویەتی و دەستبەجێ یی یەوە هەست بکەی، مەگەر تەنها هەموو ئەوانە لەبیر بکەی کە ژیان نین؟ خووەکانی مێشکت تەگەرەت دەخەنە بەردەم: تۆ لە ڕابردوو و داهاتوودا دەژی، وە تۆ هیچ شتێك دەرك ناکەی بەشێوەی ناخۆئاگا.

میرتیلێ، ئێمە تەنیا لێرە و لە ئێستادا بوونمان هەیە: لەم هەنووکەیی یەدا هەموو ڕابردوو لەناو دەچێت پێش ئەوەی هیچ لە داهاتوو لەدایك ببێت. ساتەکان! میرتیلێ، تۆ دەبێت پەی بە هێزی ئامادەیی ساتەکان ببەی. چونکە هەر ساتێکی ژیانمان بەشێوەیەکی بنەڕەتی جێگرەوەی نی یە: تۆ پێویستە فێر ببی کە دەستبەجێ خۆتی تێدا نقوم بکەی. ئەگەر تۆ، میرتیلێ، هەڵبژێری هەر لەم ساتەدا، بەبێ هاوسەر یان منداڵ، تۆ لەوانەیە تەنیا بیت لەسەر زەوی وە لە عزوری خوادا بیت. بەڵام تۆ ناتوانی لەبیریان بکەی، وە تۆ هەموو ڕابردوو و، هەموو خۆشەویستی یەکان و، هەموو گرفتاری یەکانی ئەم زەوی یەت لەگەڵ خۆت هەڵگرتووە، هەر وەکو ئەوەی دەترسێ ی لەدەستیان بدەی. بەڵام لای من، تەواوی خۆشەویستی یەکەم لەبەردەستە لە هەر ساتێکدا وە ئامادەی سەرسامی یەکی تازەیە: بۆ هەمیشە ئاشنایە وە بۆ هەمیشە سەیرە.

میرتیلێ، تۆ ناتوانی هەموو ئەو شێوازانە بەخەیاڵی خۆتدا بێنی کە خوا خۆی تێیاندا نیشان دەدات: سەیرکردنی یەکێك ئەوەندە بە شەوق و خۆشەویستی یەوە تۆ نابینا دەکات بەرامبەر بینینی ئەوانی تر. چەسپاوی ستایشی تۆ خەمبارم دەکات: من پێمخۆشە کە ببینم کە زیاتر و فراوانتر پەخش بووە. خوا لەپشت هەموو دەرگا داخراوەکانتانە. هەموو شێوازەکانی خوا دڵگیرن، وە هەموو شتێك شێوازێکی خوایە.

من بۆماوەی چەند مانگێك لە کۆشکێکدا ژیام لە کەنارئاوەکانی دەریاچەی کۆمۆ. لەوێ ژمارەیەك میوزیك ژەنی شیرینم لەدەوری خۆم کۆکردەوە، وە کەمێك خانمی جوانییش کە دەیانتوانی ژیرانەو بەباشی قسە بکەن: لە ئێوارانـدا

گفتوگۆمان دەکرد، لەکاتێکدا میوزیك ژەنەکان تەڵسمیان دەکردین: پاشان دەڕۆیشتینە خوارەوە بۆ کەنار ئاوەکە بە خۆهەڵدان بەسەر چەند پلیکانەیەکی مەڕمەڕ دا، کە دوایین پلیکانە لەناو ئاوی دەریاچەکەدا بوو: بەلەمە سەرگەردانەکان دووریان دەخستینەوە وە ئێمە لایلای مان بۆ خۆشەویستەکانمان دەکرد تا دەخەوتن بە ئاوازی هێمنی سەڵبەکان. بە خەواڵوویی دەگەڕاینەوە ماڵەوە: بەلەمەکە بەخەبەری دەهێنایەنەوە لەکاتی تەکانی گەیشتنەوە وشکانی دا، وە ئایدۆین توند قۆڵی دەگرتم، وە بە بێدەنگی بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتینەوە.

ساڵێك دوای ئەوە، هەندێك کاتم بەسەربرد لە ڤێنێدی لە باخچەیەکی گەورەدا کە زۆر دوور نەبوو لە کەنار ئاو. سێ شاعیر ئەو بەخێرهاتنەیان بە گۆرانی دەگوت کە من لە ماڵی خۆم پێشکەشم کردن: ئەوان گۆرانی یان دەگوت بۆ گۆماوەکان کە ماسی و ڕووەکی تێدا بوون، بۆ کوڵانەکانی سپیدارەکان، بۆ داربەڕووە بێ هاوەڵەکان، بۆ کۆمەڵی بەلوتەکان، وە پلاندانانە باشەکەی باخچەکە.

کاتێك پایز داهات، من جوانترین دارەکانم بڕین وە چێژم وەردەگرت لە وێرانکردنی ناوچەکەم. هیچ وشەیەك ناتوانێت وەسفی ڕووکاری باخچەکە بکات کاتێك پیاسەم دەکرد لەگەڵ میوانەکانم بە ڕێچکەکاندا کە ڕێگام دابوو گیایان لێ بڕوێت. دەنگی ڕمبەی بیوری داربڕەکان لەوسەری بۆ ئەوسەری کوڵانەکان دەنگی دەدایەوە. جلوبەرگی خانمان لە لخەکان دەئاڵقا و لەسەر شەقامەکان پەرت دەبوو. پایزێکی خۆش بەسەر درەختە کەوتووەکاندا هەڵدەهات. ئەوەندە گەورەیی یەکەی پڕشکۆ بوو کە بەسەریاندا دەکەوت کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ من نەمدەتوانی بیر لە هیچی تر بکەمەوە- وە من دانم بەوە دانا کە نیشانەیەکە بۆ ئەوەی من پیردەبووم.

لەو کاتەوە شوێنی نیشتەجێ بوونی من کاولێك بوو لە بەرزایی یەکانی ئالپس: شوێنێکی سپی لە ماڵتا لەنزیك دارستانە بۆنخۆشەکانی سیتا ڤێکچیا، ئەو شوێنەی کە لیمۆیەکانی شیرینی تیژی پرتەقاڵەکانیان دەدا: کالیسکەیەکی

گەشـتکردن لـە دالّماتیـا: وە لـەم ساتەشـدا ئـەم باخـچەیە لەسـەر ئـەم گـردەی فلۆرەنتاین، کە ڕووبەڕووی فیێسوّل، ئەو شوێنەی کە من ئێوەم کۆکردبوّوە ئەم ئێوارەیە.

وە تۆ نابێت بلّیّ ی کە من دلّخۆشی خۆم بە قەرزداری هەلومەرجەکان دەزانم: هیچ گۆمانی تێدا نیە کە گونجاو بوون، بەلّام من بەکارم نەهێنان. پێت وانەبێت کە دلّخۆشی من بەهۆی دەولّەمەندی یەکانەوە دروستکراوە: دلّم، کە ئازاد بوو لەدەستی هەموو پەیوەندە زەمینی یەکان، هەمیشە هەژار بووە، وە من بەئاسانی دەمـرم. دلّخۆشـی یەکـەم لـە خوێنگـەرمی دروسـتکراوە. لـەڕێگای ئاوەنـدی (کێلّگەی) هەموو شتەکان بەبیّ جیاوازی، من ئەویندارانە پەرستنم ئەنجام داوە.

'هەموو چێژەکان باشن،' ئێلیفاس وایگوت، 'وە پێویستە تام بکرێن.'

'بەلّام هەموو هەمووشیان نا،' تیبولوس وایگوت، 'دەبێت هەلّبژاردنێك هەبێت.'

هەندێك چێژی بچوك هـەن کە ئێمـە تامـان کـردوون کـە وەکـو تـوی ترشـن کـە ئادەمی لەسەر شەقام دەیاندزیّ، وە خۆزگە دەخوازێت کە شیرنتر بان.

ئێمە لەسەر گیای تەنیشت کانی یەکە دانیشتین

بۆ ساتێك ئاوازی خوێندنی مەلێکی-شەویی سەرنجی منی ڕادەکێشا زیاتر لە قسەی ئەوان: کاتێك دوبارە دەستم بە گوێگرتن کردەوە، هیلاس دەیگوت: وە هـەر یـەك لـە هەستەکانی مـن ئـارەزووی خـۆی هـەبوو-ون. کاتێك دەمهەویـست بگەڕێمـەوە مـالّیّ، بینـیم کـە پیـاو و خانمـە خزمـەتکارەکانم لەسـەر مێـزی مـن دانیشتوون: بچوکترین شوێنیش بۆ من نەمابوّوە.

شوێنی ڕێزو سەرفرازی لەلایەن تینوێتی یەوە داگیرکرابوو: وە تینوێتی یـەکانی تـر دەیانهەویـست کـە شـوێنەکەی لـیّ بستێنن. تـەواوی مێزەکـە دەمەقالّـە بـوو، ئەوان سـەرخۆش بووبوون وە بەیـەك ئاواز لـەدژی مـن هەسـتان: ئـەوان منیـان لـە مالّەکە هەلّدا دەرەوە: بۆ دەرەوەی دەرگایەکان ڕایان کێشام، وە دیسان ڕۆیشتم بوّئەوەی تریّ ی زیاتریان بۆ کۆبکەمەوە.

**ئارەزووەکان! ئارەزووە جوانەکان، من شەربەتی تریێ یەکەتان بۆ دێنم: من فنجانە گەورەکانتان پڕدەکەم: بەڵام دوبارە ڕێگام بدەنەوە بۆ ناو ماڵی خۆم- بۆئەوەی کاتێك ئێوە دەکەونەوە ناو خەوی سەرخۆشیتان لەوانەیە من جارێکی تریش تاجی ئەرخەوانی و لاولاوە لەسەر بکەم- چاودێری ناوچاوانم بشارمەوە لەژێر ملوانکەی گوڵبەندی لاولاوە.**

**سەرخۆشی بەسەر منیشدا دەهات وە بۆم گران بوو کە بەردەوام بم لە گوێگرتن: هەندێك جار، کاتێك مەلەکە دەستی لە خوێندن هەڵدەگرت یان شەو ئەوەندە بێدەنگ دیار بوو کە وەکو ئەوە بوو کە من تاکە کەس بم کە تیێ ی ڕابمێنم: هەندێك کاتی تر واپێدەچوو کە لە هەموو دەوروبەری من دەنگی تری لێ هەڵبقوڵێن کە لەگەڵ دەنگی هاوەڵەکانم تێکەڵ دەبوو.**

**ئێمەش، ئێمەش، دەیانگوت، نەخۆشی پرسەداری گیانی خۆمان ناسیوە.**

**ئارەزووەکانمان لێمان ناگەڕێن بە ئارامی کاربکەین.**

**ئەم هاوینە هەموو ئارەزووەکانم تینوو بوون. وەکو ئەوە وابوو کە بە بیابانەکاندا تێپەڕیبن.**

**وە من ڕەتمکردەوە کە ئاوبخۆنەوە، زۆر بەباشی دەمزانی کە خواردنەوەیە کە نەخۆشی کردوون.**

**خەونم بە چی یەوە بینی دوێنێ شەو؟ کاتێك بەخەبەر هاتم، هەموو ئارەزووەکانم تینوو بوون، هەر وەکو ئەوەی بە بیابانەکاندا ڕۆیشتبن کاتی نوستنیان.**

**دێن و دەچن، بەناڕەحەتی شەپۆل دەدەین لەنێوان ئارەزوو و بێ مەیلی دا.**

**ئارەزووەکان! ئایا ئێوە قەت ماندوو نابن؟ ئۆهـ!، ئۆهـ! ئۆهـ! ئۆهـ! ئۆهـ! ئەو خۆشی یە بچوك و زووگوزەرە- ئەو خۆشیەی کە بەزوویی تێشپەڕیوە! بەداخەوە! بەداخەوە! من دەزانم چۆن ئازارەکەم درێژبکەمەوە: بەڵام چۆن دەتوانم خۆشی یەکەم فریوبدەم تا بمێنێتەوە؟**

**دێن و دەچن، بەناڕەحەتی شەپۆل دەدەین لەنێوان ئارەزوو و بێ مەیلی دا.**

وە من پێم وابوو، هەموو مرۆڤایەتی وەکو کەسێکی نەخۆشە، کەلەکەو کەلەکە دەکات لەسەر جێگایەکەی- هەوڵ دەدات پشوو بدات وە هەتا ناتوانێت بنوێت.
ئارەزووەکانمان دەمێکە زۆر جیهانیان بڕیون: وە تا ئێستاش تێر نەکراون. وە هەموو سروشت بێ پشوودان دێت و دەچێت لەنێوان ئارەزووی پشوودان و تینوێتی بۆ چێژ. ئێمە بەدەنگی بەرز هاوارمان کردووە لەبەر ئازار لە ژوورە چۆلکراوەکاندا.
ئێمە سەرکەوتوینە سەر لوتکەی بورجەکان، لەو شوینەوەی کە تەنیا تاریکایی دەبیندرا.
وەکو سەگەکان ئێمە بە ئازارەوە قروسکاندوومانە لەسەر گردە لە سوتێنەرەکان: وەکو شێرەکان گرماندوومانە لەناو نەخشەکانی جیهاندا، وە وەکو وشترەکان لەوەڕاوین لەسەر گیای خۆڵەمێشی پارچەکان وە شیلەی ناو گیا وشکەکانمان مژتووە- چونکە لە بیابان زۆر کەم ئاوی لێ یە. وەکو پەرەسێلکەکان ئێمە بەسەر دەریا فراوان و بێ پیتەکاندا فڕیوین.
ئێمە وەکو کللۆ تەواوی وڵاتانمان کردۆتە پاشەڕۆ بۆ گەڕان بەدوای خۆراك دا.
وەکو گیای ناو دەریا زریانەکان ڕایان وەشاندووین:
وەکو بەفرەکان پیش بایەکە خێرا ڕۆیشتوین.
ئۆو، لەبەر ئەو هەموو پشوو یە! من بانگی مەرگی بەرهەمهێن دەکەم، بۆئەوەی لە درێژخایەن دا ئارەزووە پەککەوتووەکەم بکرێت ڕزگاری بێت لە کارکردن دوای شێوەگۆڕانی تر. ئارەزوو! من تۆم بەدوای خۆمدا ڕاکێشاوە بە ڕێگا سەرەکی یەکاندا: من نکوڵیم لە تۆ کردووە لە کێڵگەکاندا: من تۆم بە خواردنەوە دامرکاندۆتەوە لە شارە گەورەکاندا- تۆم دامرکاندۆتەوە بەبێ شکاندنی تینوێتی یەکەت: من تۆم شردووە لە مانگە شەوەکاندا: من تۆم لەگەڵ خۆم بردووە بۆ هەر شوێنێك چووبم: من تۆم لەسەر شەپۆلەکان خستۆتە بێشکەوە: من لایلایەم بۆ کردووی تا نوستووی لەناو زەریادا.... ئارەزوو! ئارەزوو! من دەتوانم چی ترت بۆ بکەم؟ چی ترت دەوێت لە من؟ ئایا قەت ماندوو نابی؟

**مانگ لەنێوان لقەکانی درەختەکانی بەلوتی سەوز خۆی نیشان دەدا، یەك ئاواز بوو، بەڵام وەکو هەمیشە دڵگیر بوو. ئێستا ئەوان دەستە دەستە قسەیان دەکرد وە من تەنیا گوێم لە ڕستەیەك دەبوو لێرەو لەوێ: هەموو پێدەچوو قسان لەگەڵ هەموان بکەن لەبارەی ئەوینەوە، بەبێ ئاگاردار بوون لەوەی کە کەس گوێ ی نەدەگرت.**

**پاشان، کاتێك مانگ بزربوو لەپشت لقە تاریککراوەکانی درەختەکانی بەلوتی سەوز، گفتوگۆیەکە وردە وردە نەما، وە ئەوان بەبێ دەنگی پاڵیان دایەوە لەتەنیشت یەکتر لەناو گەڵایەکاندا، بە شلوشۆقی گوێ یان لە یەك دوو دەنگ دەگرت کە تا ئەو کاتەش مابوونەوە، بەڵام زیاتر و زیاتر نەرمتر دەبوون، تاوەکو بەزووی تەنها بەگوێ ی ئێمە دەگەیشتن کە تێکەڵ بووبوون لەگەڵ منگە منگی جۆگایەکە لەناو جێگا بە گیاوگوڵەکەی دا.**

**پاشان هەتا ڕووناکی مانگیش دیار نەما. من لەسەر زەوی پاڵکەوتم، خەواڵوو بووم بەهۆی جادوو و دوکەڵەکانی غەمگینی یەوە.**

**قسەی کۆتایی**

**وە ئێستا، ناتانیاڵ، کتێبەکەم فڕێ بدە. خۆت ڕاوەشێنەو لێ ی ڕزگار بە. من بەجێ بێڵە. من بەجێ بێڵە: ئێستا تۆ لەسەر ڕێگای منی: تۆ بەربەسێتم بۆ دروست دەکەی: من زیادەڕۆیم کردووە لە خۆشەویستیم بۆ تۆ وە ئەوەش زۆر من سەقاڵ دەکات. من لەوە ماندووم کە وانیشان بدەم کە دەتوانم کەس پەروەردە بکەم. کەی من وتوومە کە دەمهەوێت تۆ وەکو من بیت؟ تۆ جیاوازی لەمن بۆیە تۆم خۆشدەوێت: تاکە شتێك کە لە تۆدا خۆشم دەوێت ئەوەیە کە لە من جیاوازە. پەروەردەکردن! دەبێت کێ پەروەردە بکەم جگە لە خۆم؟ ناتانیاڵ، پێت بڵێم؟ من خۆم پەروەردەکردووە بەبەردەوامی. وە من ئێستاش تەواو نەبوو–وم. من تەنیا خۆم بەرزدەنرخێنم بۆ ئەگەرەکانم.**

**ناتانیاڵ، کتێبەکەم فڕێ بدە: ڕێگا مەدە ڕازیت بکات. پێت وانەبێت کە ڕاستی تۆ دەکرێت لەلایەن کەسێکی ترەوە بدۆزرێتەوە: ئەوەت لە هەموو شتێك پێ**

شەرمتر بێت. ئەگەر من خواردنت بۆ بدۆزمەوە، تۆ چێژی خواردنیت نابێت: ئەگەر من جێگات بۆ ڕابخەم، تۆ ناتوانی لەناویدا بنوی.
کتێبەکەم فڕێ بدە: بەخۆت بڵێ کە ئەمە یەکێکە لە هەزاران دۆخ و شێواز لە ژیاندا. بەدوای دۆخ و شێوازی خۆتدا بگەڕێ. ئەو کارە ئەنجام مەدە کە کەسێکی تریش دەتوانێت وەکو تۆ بەباشی ئەنجامی بدات. ئەوە مەڵێ، ئەوە مەنوسە، کە کەسێکی تر دەتوانێت بیڵێت، یان بینوسێت وەك تۆ بەباشی. گرنگی بە هیچ شتێك مەدە لە خۆتدا تەنیا بەوە نەبێت کە هەست دەکەی لە هیچ شوێنێکی تر بوونی نیە، وە لە دەرەوەی خۆت دروستی بکە، بە بێ ئارامی یان بەئارامی، ئاهـ، ناتانیاڵ، جێنەگراوەترینی لەناو بوونەوەران دا. من باسی خۆشەویستیم نەکرد. من چاوەڕێ ی بەیانیم کرد بۆئەوەی بڕۆم وە دەرفەتی ڕێگایەکە بگرمە بەر. سەرم لەمێژ بوو گێژی دەخوارد بەهۆی ماندوێتیەوە. من چەند کاتژمێرێك نوستم-پاشان، لە بەرەبەیاندا، بە ڕێگای خۆمدا ڕۆیشتم.

♣ دیموکراسی دەڵێت: هاوڕێ، تۆ بۆخۆت قسەی خۆت بکە، من نانەکەی تۆ دەخۆم.

مارکسیزم دەڵێت: هاوڕێ، تۆ بۆخۆت نانەکەت بخۆ، من لەجیاتی تۆ قسە دەکەم .

فاشیزم دەڵێت: هاوڕێ، من نانەکەی تۆ دەخۆم، لەجیاتی تۆش قسە دەکەم، وە تۆ تەنها چەپڵەم بۆ لێبدە.

ئیسلامی ڕاست دەڵێت: تۆ بۆخۆت نانەکەت بخۆ، بۆخۆشت قسە بکە، وە من تەنها بۆ ئەوە هەم کە تۆ بەو مافانە بگەی.

ئیسلامی درۆین دەڵێت: تۆ نانەکەت بهێنە بیدە بە ئێمە، وە ئێمەش بەشێکی هەڵدەدەینە پێش تۆ، بەڵام ئەو قسەیە بکە کە ئێمە دەیکەین!




نرخ( ٥٠٠٠ ) دینار